# مۆرفیمەکانی ((ی)) لە بواری سینتاکسدا

ئازاد ئەحمەد مەحموود

**پێشەکی:**

مۆرفیمەکانی (ی) لە زمانی کوردیدا زۆر رۆڵی گرنگ و بەرچاویان هەیە چ لە بواری مۆرفۆلۆژی، چ لە ئالی سینتاکسدا*. هەر بۆیە توێژەرانی زمانی کوردی، یان ئەوانەی تیلنیگایان ئاراستەی رێزمان و بابەتی رێزمانیی کردووە، گەلێك زوو بیریان بۆ بوونی ئەم مۆرفیمانە چووە. بەلام زۆربەیان بە شێواز و رێبازی ئەکادیمی و زانستی لێیان نەدواون، ئەویش چونکە بیرۆکەی (فۆنیم) لەلای زانایان و شارەزایانی زمان، دوای داهێنان و ناسینی بیری (مۆرفیم) لە کۆتایی سییەکاندا سەری هەڵدا، زمانناسان کەوتنە گەڕان و پشکنین بە دوای دانەیەکی دیکەی رێزمانیدا، کە ئەویش لە زماندا رۆڵێکی وەها دیار و گرنگ ببینێ، ئەوە بوو لە سەرەتای چلەکاندا بیری (مۆرفیم) بە تەواوی هاتە کایەوە، بە پێی ئەم هزر و لێکدانەوەیە هەموو کەرەستەکانی رێزمانی بۆ چەند دانەیەکی بچووك، کە بە (مۆرفیم) ناسراوە شیدەکرێتەوە.

وا دەردەکەوێ لێکۆڵینەوەی زمانناسی کورد لەم بوار و مەیدانە رێزمانییەدا بە گوێرەی پێویستیی پەیرەو و بەرنامەی بابەتەکانیانەوە بوو بێت، واتا راستەوخۆ لە سەرپاکی ئەو مۆرفێمانە و سەرجەم ئەرکەکانیان نەدواون، بەڵکو تا رادەیەك لێرە و لەوێ باسیان لێوە کردوون، هەرچی توێژینەوەی سەربەخۆ و فرە لایەنە لە پەنجەکانی یەك دەست تێپەڕ ناکات.. جا هەر لەم کلاوڕۆژنە و روانگەیەوە ویستوومە بە شێوەیەکی ورد و زانستی لە مۆرفێمەکانی (ی) لە دەراوی سینتاکسدا بدوێم و تیشك و رووناکی بخەمە سەر تێکڕایان و گشت ئەرك و خاسیەتێکی هەر یەکەیان دیاری بکەم.

---

* مەبەستی بابەتەکەی ئێمەیە.

له زمانی کوردیدا مۆرفێمی (ی) له بواری سینتاکسدا، وەك (٦) مۆرفێمی جودا خۆی دەنوێنێ بەم جۆرەی خوارەوە:

١- مۆرفێمی (ی) ی نیشانەی ئیزافە.

٢- مۆرفێمی (ی) ی جێناوی لکاوی کەسی دووەمی تاکی دەستەی دووەم.

٣- مۆرفێمی (ی) ی جێناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاکی دەستەی یەکەم.

٤- مۆرفێمی (ی) ی کۆتاییی جێناوی کەسی جودا لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا.

٥- مۆرفێمی (ی) ی نیشانەی زایەندی نێر لە دۆخی تیاندا.

٦- مۆرفێمی (ی) ی نیشانەی تێپەڕیی کردار لە بنەمای کاتی ڕابوردوو، یان قەدی چاوگی (یائی) دا.

-١-

## مۆرفیمی (ی) ی نیشانەی ئیزافە

لە ئەنجامی وردبوونەوە لەو باس و لێکۆڵینەوانەی دەربارەی ئیزافە لە زمانی کوردیدا نووسراون، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە ئاتەواویی ئەو زانایانەی لەسەر بناغەی زمانی عەرەبی نووسینەکانیان داڕشتووە، لەوە دایە لە هەر شوێنێك بە شتێکی جیاوازیان لە قەڵەم داوە و بەو جۆرەش ناوی بۆ دانراوە. بۆ نموونە: لە حاڵەتی (مضاف و مضاف الیە) دا بە (ی) ی ئیزافەیان داناوە، بەڵام لە حاڵەتی(صفە و موصوف) دا بە (ی) ی وەسفیان ناو بردووە[١]. سەرەڕای ئەوەش نیشانەی ئیزافەیان بە پیت یان ئامراز لە قەڵەم داوە،

وەك لێکۆڵینەوە نیشانی داوە، لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووودا، (ی، ە،..) و لە کرمانجیی ژووروودا (ی، ا، ە، یٚ، یٚـد/ یٚـت، یٚن..) نیشانەی ئیزافەن و دیارە مەرام و مەبەستی ئێمەش لێرەدا تەنیا نیشانەی (ی) ی ئیزافەیە.. ناوهێنانی ئەو نیشانەیە[٢] بە پیت یان ئامراز یان هەر شتێکی تر ڕاست نییە، چونکە وەك ڕوون و ئاشکرایە مانای ڕێزمانی دەگەیەنێ. لە ڕووی ڕۆڵ و ئەرکیشەوە لە ڕستەدا، بە یەکەوە گرێدان و بەستنی دیارخەر و دیارخراوە، لەگەڵ نیشاندانی پێوەندی نێوانیان. لەبەر ئەوەی لە هەردوو

---

(١) بە وێنە بڕوانە:

أ ) سەعید صدقی کابان، مختصر صرف و نحوی کوردی، بەغدا، ١٩٢٨، ل: ٢٥-٢٦.

ب ) توفیق وەهبی، دەستووری زمانی کوردی، جزمی یەکەم، بەغدا، ١٩٢٩، ل: ١٨، ل: ٢٠-٢١.

ج ) نووری عەلی ئەمین، قەواعیدی زمانی کوردی لە (صرف و نحو) دا، بەرگی دووەم، بەغدا، ١٩٥٨، ل: ٢٥-٢٧، ل: ٩٤-٩٥.

د ) نووری عەلی ئەمین، ڕێزمانی کوردی، سلێمانی، ١٩٦٠، ل: ٢٠٠.

هـ ) مەسعوود محەمەد، بەکارهێنانی (ی) لە ڕێزمانی کوردیدا، (گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد)، ب ١، بەشی ١، بەغدا، ١٩٧٣، ل: ٥٢.. و هەندێکی دیکە.

(٢) بۆ زانیاری لەمەڕ نیشانەوە، بڕوانە: د. ئەورەحمانی حاجی مارف، وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا، بەغدا ١٩٧٧، ل: ٣٦-٤٠.

پارەکەدا ـ واتا حاڵەتی (مضاف و مضاف الیە) و حاڵەتی (صفە و موصوف) دا هەر هەمان نیشانەن؛ پێویست ناکا بە نیشانەی جیاواز ناویان بێت.

## نیشانەی (ی) ی ئیزافە لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووودا:

ئێتیمۆلۆژیی نیشانەی ئیزافەی (ی) دەگەڕێنێتەوە بۆ جێناوی هەیی(هی ـ ئی)[3]:

"هەرچەندە وشـەی هـی (ئـی) لـە تێکستی کۆن و نوێی کوردیدا، بـە شێوەیەکی سەرەکیی وەك جێناوی هەیی بەر چاو دەکەوێ، بەڵام لە هـەندێ حاڵـەتدا دەبینـرێ کـە دیارخەر و دیارخراوی پێکەوە بەستووە ـ واتە دەوری ئیزافەی بینیوە"[4]. هەروەها بۆ هەمان مەبەست، پێویستە ئاورێك لـە جێنـاوی نـاوبراو لـە زمـانی فارسیی ناوەڕاست و ئاوێستاشدا بدەینەوە و بیناسین.. : "لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا (ئی) جێناوی هـەیی بووە و هەروەها کاری ئیزافەشـی بـە جـێ هێنـاوە.. جێنـاوی هـەیی، کـە لـە ئاوێسـتادا (یە/ یا) (یەت/ هیەت) بووە، لە هەمان کاتدا وەك نیشانەی پێکەوە بەستنی دیارخـەر و دیارخراو خۆی نواندووە"[5]، بەڵام پێویستە پەنجە بۆ ئـەو ڕاستییە درێژ بکـەین، کە هەیی ئێستا لە جێناو شۆڕاوەتەوە و بووەتە نیشانەی (ی) ی ئیزافە.

نیشانەی (ی) ی ئیزافە لە دیالێکتی کرمـانجیی خـوارووودا ڕەسـەن و ژمـارەی نـاوی دیارخراو نیشان دەدات[6].

---

(٣) بڕوانە:

١ـ د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکـەم (مۆرفۆلـۆژی)، بەشـی یەکـەم ـ نـاو ـ بەغدا، ١٩٧٩، ل: ٢٢٦–٢٢٧.

٢ـ د. کوردستان موکریانی، سینتاکسی ڕستەی سادە لە زمانی کوردیدا، بەغدا، ١٩٨٦، ل: ١٢٩.

(٤) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (مۆرفۆلۆژی) بەشی یەکەم ـ ناو ـ ل: ٢٢٦–٢٢٧.

(٥) هەمان سەرچاوە، ل: ٢٢٧.

(٦) نیشانەی (یێ) ی ئیزافە، ڕایەندی مـێ نیشان دەدا، وەك: (ئایشـە گـوڵ خوشـکێ بابمـە)، بڕوانـە: (لەیلا جەلیل عەبباس دەڵۆ، مۆرفێمەکانی (یێ) لە زمانی کوردیدا بە کەرەستەی کرمـانجیی خـواروو و

کەواتە "لە بەشــە دیـالێکتی بنگـرد، پـژدەر، هـەولێر، ڕەوانـدزدا. ئـامرازی خسـتنە سەری (ی) لەگەڵ ئەو ناوانەدا بەکاردێن کە نێرن" [٧] .

چەند نموونەیەك:

"برۆ ڕەشتر لە چـــــاوان

سینگ مەعدەنی دراوان"

(فۆلکلۆر، ل: ١٠٣)

"بانگم وەبەر خوای گەورە

(ئیدی) غەوسی بەغدایێ"

(فۆلکلۆر، ل: ١٠٣)

"کوڕی خواجە کاووسی"

(مەکەنزی - ١٨٥)

لە وشەی لێکدراوی دیارخـەری دۆخـی ئیزافـەدا، جێـی نیشـانەی ئیزافـە نـەگۆڕە و هەمیشە لە دوای دیارخراوەوەیە، شوێنی دیـارخراویش لـە وشـەی لێکـدراوی دیارخـەری ئیزافەدا، هەموو کات لە پلەی پێشەوەدا دەبێ و جێی دیارخــەر لـە پلـەی دواوەدا دێ و بەم شێوەیە:

دیارخراو + نیشانەی ئیزافە + دیارخەر ..

نیشـانەی (ی) ی ئیزافـە، کـە لـە هـەموو نیشـانەکانی دیکـە پـتر لـە کاردایـــە، بـە دیارخراوەوە دەلکێ و بەم شێوازەی خوارەوە دەبینرێ:

١- بێت و دیارخراو کۆتاییی بە هەر دەنگێکی کۆنسـۆنانت - تەنانـەت ئەگـەر دەنگی (و) یش بێ، ئەوە بە ڕەوانیی نیشانەی (ی) ی ئیزافەی دەچێتە سەر، وەك:

---

ژوورەوو، نامەی ماجستێر، کۆلێجی پەروەردە - ئیبن ڕوشد، زانکۆی بەغدا، ١٩٩٨، ل: ٥٨.

(٧) ك.ك. کوردۆیێـف، ڕێزمـانی کـوردی بـە کەرەسـتەی دیـالێکتی کرمـانجی و سـۆرانی، گۆڕیـنی لـە ڕووسیەوە: د. کوردستان موکریانی هەولێر، ١٩٨٤، ل: ٩٣.

کۆتر + ی < کۆتری

"کۆتـــری سپی، نـــەرم و شـــل

چاو ڕەش بەبێ دەست کاری و کل"

(دیلان، ل: ١٠٣)

ناْن + ی < نانی

"دانیشتووی ناو کۆشك و قەلاّ

دەخۆن نـــانی گـــەلاّ گەلاّ"

(هێمن، ل: د)

سێو + ی < سێوی

"دوو نارنج لە باخی گـــولاّندا تەمیزن

دوو لیمۆیی کالْ و دوو سێوی لەزیزن"

(ئەدیب، ل: ١١٨)

پیاو + ی < پیاوی

".. پیاوی کوێر چۆن ئەم جۆرە زەبرەی پێ دەوەشێ؟"

(ئەفسانە، ل: ٩٨)

تێبینی:

لە زمانی فارسیشدا، ناو ئەگەر کۆتاییی بە دەنگی (ا) و (و) بێت، ئـەوە لـە حاڵـەتی ئیزافەدا نیشانەی (ی) ی دەچێتە سەر، بە وێنە:

(ا)

دانا + ی < دانای

دانای اسرار

(و)

مو + ی < موی

موی بڵند.. وهتد[٨]

٢ـ ئەگەر دیارخراو کۆتاییی بە دەنگی بزوێنی (ا، ۆ، وو، ێ، ە) بێت، ئەوە بە پێی دەستووری فۆنۆلۆژیی زمانی کوردی (ی ـ $\hat{\mathbf{I}}$) دەبێتە (ی ـ **Y**)، وەك:

(ا)

هیوا + (ی ـ $\hat{\mathbf{I}}$) > هیوا (ی ـ **Y**): هیوای

"بەری بەیانە، ڕووناکە ئاسۆ

ئاسۆی هیوای کورد مژدە بێ لە تۆ"

(گۆران، س، ل: ٤١٢)

(ۆ)

برۆ + (ی ـ $\hat{\mathbf{I}}$) > برۆ (ی ـ **Y**): برۆی

"کوانێ دوو چاوی مەست؟ کوانێ؟

کوانێ بـرۆی پەیوەست؟ کوانێ؟"

(گۆران، س، ل: ١٣)

(وو)

ڕوو + (ی ـ $\hat{\mathbf{I}}$) > ڕوو (ی ـ **Y**): ڕووی

---

(٨) بەڵام ئەگەر ناو کۆتاییی بە (ها) ی دەرنەبڕاو (غیر مەلفووزە) بێت، وەك: (نامە، خەندە..) و ئاوەڵناوی بە دوادا بێت، ئەوە لە دەربڕینیدا هەست بە (ی) دەکرێت، بەڵام لە نووسیندا بە شێوەی (هەمزە) لە سەر (ها) یەکە دەنووسرێ، بە وێنە:

(نامەء زیبا، خەندەء بلند..). هەروەها هەندێ جار لەوانەیە ئاوەڵناو بە پێش ناو بکەوێ، لەم حاڵەتەشدا هەردووکیان وەك یەك وشە دادەنرێن، هێمای لە ژێردا داناندرێت، بۆ نموونە: (سیاهْ چادرْ، نیكْ مردْ..). بڕوانە: (دکتر پرویز ناتل خانلری، دستور زبان فارسی، چ ١٦، تهران، ١٢٧٧/١٩٩٨، ل: ٦٦).

"لە ڕووی زەمینا نییە وەکو تۆ
قەومێکی دوودڵ، دیل و ڕەنجەڕۆ"

(بێ کەس، ل: ١٨)

(ێ)

ڕێ + (ی - î) < ڕێ (ی - Y): ڕێی

"بۆ یەك شەو لای دایە ئەم دێیە ڕێی وێڵم،
بەیانی، ڕۆژ هەڵهات، سوار ئەبم جێی دێڵم.."

(گۆران، س، ل: ٢٦)

(ە)

توورەگە + (ی - î) < توورەگە (ی - Y): توورەگەی

"دەگـــری و.. دەگـــری
دڵت توورەگەی بزمارە و
بە کـــوڵ دەگـــــری"

(تڵماسکە شیعر، هاوکاری، ژ ٨٨٩)

میوە + (ی - î) < میوە (ی - Y): میوەی

"شەراب لە میوەی تۆ دێتە بەرهەم
ئەبێ بە شیفای پەژارە و ئـــەلەم"

(پیرەمێرد، ل: ١٥٠)

٣- ئەگەر وا ڕێك کەوت دیارخراو کۆتاییی بــە دەنگی بزوێنی (یــی) بێــت، ئــەو کاتــە نیشـانەی ئیزافـەی (ی) لـە دەربڕینـدا هەسـتی پـێ نـاکرێت. هــەروەها: "واقیــع ئەوەیــە (ی) کەی ئیزافە و وەسف لــە قسـەکردندا کــەم و زۆر خـۆ بــە دەرناخــەن و بەتــەواوەتی لەناو دەچن" [٩]؛ چونکە ئەو دیارخراوانە نیشانەی ئیزافە بە خۆیانەوە ناگرن، وەك:

(٩) مەسعوود محەمـەد، بـەکارهێنانی (ی) لـە ڕێزمـانی کوردیدا، گۆڤـاری "کـۆڕی زانیــاری کــورد"، بەرگی ١، بەشی ١، بەغدا، ل: ٥٢ - ٥٣.

کانیی + ی < کانیی

"ئەمەش لە دیدا کانیی ژنانە،

قیبلەی دڵداریی هەرزەکارانە!"

(گۆران، س، ل: ۱۳۳)

گۆرانیی + ی < گۆرانیی

"گۆرانی (قین) ئەڵێم، با رقم هەڵسێ!

ئـاغایەك بمێنێ مەیدان بەر تـادەم؟"

(گۆران، س، ل: ١٦٥)

رێویی + ی < رێویی

"رێویی ماڵ و شێری دەرەوە" [١٠]

(پەندی پێشینان، ل: ۲۲٥)...هتد

هەروەها لە فارسیشدا، ئەگەر وشە کۆتاییی بە دەنگی (ی) بێت؛ ئـەوە لـە حاڵـەتی ئیزافـەدا وشـەکە وەکـو خۆی دەمێنێتـەوە، بـە هـەمان چەشـنی کـوردی، ئـەم وشـانە نیشانەی (ی) ی ئیزافە بە خۆیانەوە ناگرن، بە وێنە:

دیبای + ی < دیبای

"پر از گوهر نابود افسرش ز دیبای چینی فروزان برش" [١١]

---

(١٠) ئەگەر دیارخراو نیشانەی ناسیاوی یان نە ناسیاوی یان کۆ.. ی لەگەڵدا بوو، ئەو کاتـەش دەکرێ نیشانەی ئیزافەی (ی) وەربگرێ و بەم شێوەیە دەبینرێ: ئەگەر کۆتاییی دیارخراو دەنگی کۆنسـۆنانت بێ، وەك، (کچێك، کچان، کچەکان..)، ئەوە بەبێ گرفت نیشانەی (ی) ی ئیزافە دەچێتە سەر، (کچێکی بـالا بـەرز، کچـانی لادێ، کچـەکانی تـۆ..)، بـەڵام بێتـو کۆتـاییی دیـارخراو دەنگی بزوێـن بـێ، وەك: (پیاوەکە، کورە..) ئەو دەمە ( ی ـآ) ی ئیزافە دەبێتە (ی ـ Y) نیمچـە بزوێن، بـە وێنـە: (پیاوەکەی پوورە مەنیج، کورەی ئازا..).

(١١) د. مەحموود شەفیعی، شاهنامە و دستور یا زبان فارسی بر پایە شاهنامە فردوسی، تهران، ١٣٧٧/ ١٩٩٨، ل: ١٤٦، بەندی ئەلف.

ئاشکرایە، نیشانەی (ی) ی ئیزافە بە دیارخراوەوە دەلکێ. هەندێ جاریش نیشانەی ناسیاوی و نیشانەی نەناسیاوی و نیشانەی کۆ دێنە ناوانەوە، بەم شێوەیە خۆی دەنوێنێ:

١ـ ئەگەر بێتو دیارخەر بە تایبەتی ناو یاخود جێناو بێ و واتای خاوەنێتی بگەیەنێ، ئەو دەمە نیشانەکان ـ واتە نیشانەی ناسیاوی و نیشانەی نەناسیاوی و نیشانەی کۆ ـ بە دیارخراوەوە دەلکێن، ئەوجا نیشانەی (ی) ی ئیزافەی دەچێتە سەر، بۆ نموونە:

"ژنەکەی کاوە، ژنەکەی ئەو

ژنەی کاوە، ژنەی ئەو

ژنێکی کاوە، ژنێکی ئەو

ژنانی کاوە، ژنانی ئەو

ژنەکانی کاوە، ژنەکانی ئەو.." [١٢]

٢ـ ئەگەر هاتوو دیارخەر ئاوەڵناو بێ و واتای ئاوەڵناوی (وەسفی) بگەیەنێ، ئەوە سەرەڕای نیشانەی (ی) ی ئیزافە، نیشانەی ناسیاوی و نەناسیاوی و کۆش [١٣] دەچنە سەر دیارخراو، بە وێنە:

---

(١٢) ئەگەر دیارخراو ناوێکی گشتیی یان ئاوەڵناو بێ و لە حاڵەتی (مضاف الیه) دا بێ، ئەوە نیشانەکان بە دیارخراوەوە دەنووسێن، بە وێنە: (کوڕی کوردەکە، کوڕی ئازاکە)، (کوڕی کوردە)، (کوڕی کوردێك، کوڕی کوردێ، کوڕی ئازایەك)، (کوڕی کوردان، کوڕی ئازایان)، (کوڕی کوردەکان، کوڕی ئازاکان).

تێبینی: لێرەدا کە ئاوەڵناوی (ئازاکە، ئازایەك، ئازایان، ئازاکان) بە دوا وشەی (کوڕی) داهاتووە و ڕۆڵی (مضاف الیه) ی بینیوە، هۆی ئەوەیە کە مەبەستی (کەسێك) ە (ئازا) یە و ئەو ناوەی بەردەمی کە وەسفی دەکا، لابراوە.

(١٣) د. کوردستان موکریانی وا ڕادەگەیەنێ: کە ئەو نیشانانە لە حاڵەتی ئیزافەی بە یاریدەی نیشانەی (ی) ساز بوودا، تەنیا بە دیارخراوەوە دەلکێن. بڕوانە د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (مۆرفۆلۆژی)، بەشی یەکەم ـ ناو ـ، ل: ٢٢٣، پەراوێز ١٧٠.

"هەوری ڕەش بـــارانی تێ کرد
هەورێکی ڕەش بارانی تێ کـرد
هەورانی ڕەش بارانیان تێ کرد.." [14]

ئەوەی بووەتە هۆی جیاکردنەوەی نیشانەی ئیزافە لە دیالێکتی کرمانجیی خواروو و ژووروودا، دیاردەی ژمارە و ڕەگەزە. لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووداا، وەك بینیمان نیشانەی ئیزافە پابەندی ژمارە و ڕەگەز نییە. نیشانەی (ی) ی ناوبراو لە حاڵەتی تاك و کۆ و نێر و مێی دیارخراودا جیانابنەوە [15]. هەرچی دیالێکتی ژووروە نیشـانەی ئیزافە بە پێی ژمارە و ڕەگەز خۆی دەنوێنێ:

نیشانەی (ی، ێ) ی ئیزافەی دیارخراوی ژمارەی تاکی ڕەگەزی نێر ساز دەکەن [16].

**نیشانەی ئیزافەی (ی) لە کرمانجیی ژوورووا:**

ئەم نیشـــانەیەش بـۆ جێنـــاوی (هــی) لـــە دیـــالێکتی کرمـــانجیی خـــوارووا دەگەڕێتـەوە [17]، ونیشـانەی ئیزافـەی تـاکی ڕەگەزی نـێر ساز دەکـات، ئـەو دەمـە بـە دیارخراوەوە دەلکێ کە نیشانەی (ەك) ی نەناسیاویی پێوە بێ .. بە وێنە:

"هۆزانەکی ژیر و زانایە بێدار
بە زاریٚ کوردی تـم دکی زاری"

(جگەر خوێن، ل: ١٣٩)

---

(١٤) لەم حاڵەتەدا نیشانەی (ەکە) و (ەکە + ان) بە دیارخەرەوە نالکێن.

(١٥) لە زمانی کوردیدا ناوناوە بێ ئەوەی هیچ نیشانەیەك هاریکاری بکا، دیارخەر بە دوا دیـارخراوێکدا دێ کە ناو بێ و حاڵەتی ئیزافە ساز دەبێ. وەك:

خاوەن ماڵ دەستی هەلگرت، دز ئەڵێ حەق ئەگەیەنم بە جێی خۆی. (پەندی پێشینان، ل: ١٨٦).

(١٦) نیشانەی (ا، ە) بە دیارخراوی ژمارەی تاکی ڕەگەزی (مێ) وە دەلکێن. هەرچی (ێد/ ێت، ێن...) یشە بە دیارخراوی کۆی نێر و مێوە دەنووسێن.

(١٧) بڕوانە لاپەڕە: (١٦) ی ئەم لێکۆڵینەوەیە.

"دەرمانەکی صیحجەت و شیفایێ
مزگین و بـەشـارەتا وەفـایێ"

(خانی، ل: ۳) .. هتد

ئەم نیشانەیە لە چەند حالەتێکدا بەدەردەکەوێت، بۆ نموونە:

آ) لەگەڵ ناودا بەم جۆرە دێت:

۱- جێناوی نیشانەی نزیکی نێر (دیارخەر) + ناو (دیارخراو) + نیشانەی ئێزافەی نێر (ی) .. ئەڤی (ڤی) + کور + ی + .. < ئەڤی (ڤی) کوڕی سەرێ خو دشویشت.

۲- جێناوی نیشانەی دووری نێر (دیارخەر) + ناو (دیارخراو) + نیشانەی ئێزافەی نێر (ی) + .. ئەوی (وی) + زارۆك + ی + .. < ئەوی (وی) زارۆکی ژ سەرمایێ بپارێزە.

ب) بێ گومان ئەم حالەتە تەنیا لەگەڵ ناودا دەرناکەوێ، بەڵکو لەگەڵ ئاوەڵناویشدا دەردەکەوێ و نیشانەی زایەندی نێر وەردەگرێ، وەك:

۱- جێناوی نیشانە بۆ نزیکی نێر (دیارخەر) + ئاوەڵناو (دیارخراو) + نیشانەی (ی) ی ئێزافە .. ڤی (ئەڤی) + ڕەنگ + ی.. < ڤی (ئەڤی) ڕەنگی گەلەك جوانە.

۲- جێناوی نیشانە بۆ دووری نێر (دیارخەر) + ئاوەڵناو (دیارخراو) + نیشانەی (ی) ی ئێزافە.. وی (ئەوی) + سۆر + ی، .. < وی (ئەوی) سۆری..

ج) هەروەها لەگەڵ ئاوەلکرداریشدا بەم شێوازە دەردەکەوێ:

۱- جێناوی نیشانە بۆ نزیکی نێر (دیارخەر) + ئاوەلکردار (دیارخراو) + نیشانەی (ی) ی ئێز افە.. ڤی (ئەڤی) + سەریان + ی.. < ڤی (ئەڤی) سەریانی خاوێن بکە.

۲- جێناوی نیشانە بۆ دووری نێر (دیارخەر) + ئاوەلکردار (دیارخراو) + نیشانەی (ی) ی ئێزافە.. وی (ئەوی) + جە + ی [۱۸] .. < وی (ئەوی) جەی خۆش و

---

(۱۸) تێبینی: ئەم حالەتانە لەم سەرچاوەیەوە وەرگیراوە:
عەبدولوەهاب خالید، نیشانێد نێر و مێ - ئێزافە - لە دیالێکتا کرمانجیا ژووری، ڕۆژنامەی ((هاوکاری))،

دلڤەکەر،. هتد

لە سەرجەمی دیالێکت و بەشە دیالێکتەکانی زمانی کوردیدا، وا ڕێك دەکەوێ لە یەك ڕستەدا لە دوا دیارخراوەوە کۆمەڵە ناوێك بە دوا یەکتردا دێـن و نیشـانەی ئیزافـە وەردەگرن و هەمووشیان ڕۆڵی دیارخەر دەبینن، بە وێنە:

"لە خەون و لە بێداریمدا هەر دێمەوە بەندەری ئاشنابییت،

تـۆزی ڕێـگەی ڕەقـەنی سـاڵانی بێبـارانـی

لە کاکۆڵم بتەکێنی"

(نیگار، ل: ٨٦) ..هتد[19]

ئەمە سەرەڕای ئەوەی لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خوارووشدا، ئەگەر لە ڕستەدا دوو ناو یان پتر بە هاریکاری (و) ی پێوەندی پێکەوە بەسترابن و ڕۆڵی دیارخراو ببینن، ئەوە دوا ناویان نیشانەی ئیزافە وەردەگرێت. بەڵام لە بنەڕەتدا پێوەندی ئەو نیشانەیە هەروەها بۆ ناوەکەی یەکەمیش دەگەڕێتەوە، وەك:

"بیست و حەوت ساڵە من ڕەنجبەری تۆم

بـە نـان و ئـاو و جل و بـەرگی خۆم" [20]

(بێکەس، ل: ٢٤).. هتد

لە شێوەی ئاخاوتنی خانەقین و مەندەلی و گەرمیان .. دا، هەر وشەیەك کۆتایی دەنگی (ا) یاخود (ە) نەبێت، نیشانەی (ی) ی ئیزافـە لەگەڵیدا بە کارنایەت و ناچێتـە سەری، بە وێنـە: نـاڵێن: (مـاڵی بـەختیار) یـان (ڕووبـاری دجلـە)، بـەڵکو دەڵێـن: (ماڵ

---

بەغدا، ژ (٩٢٤)، لە ١٩٨٧/١١/١٩.

(١٩) لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا، بۆ ئەم حاڵەتە پتر نیشانەی (ێ) بەکار دێت، وەك:

تاجێ فەرقێ سەرێ مەحبووبانی

تو ب شیرانی و لـەب شەککەرییێ

(جەزیری، ل: ٥١٨) ...هتد

(٢٠) بڕوانە: پەراوێزی ژمارە (١٩)، بۆ نموونە: ملك و ماڵێ دنێ لازم نبە ژ بۆ تەنگی و ڕووەتانە

(مەمێ ئالان، ل: ٧٤)

بەختیار)، (ڕووبار دجلە). بەلآم بێتو وشـە کۆتـاییی بـە دەنگـی (ا) یـان (ە) بـێ، ئـەوە نیشانەی (ی) ی ئیزافەی دەچێتە سەر، وەك:

(ا)

چیا + ی > چیای: چیای کوردستان

دەریا + ی > دەریای: دەریای ڕەش .. هتد

(ە)

پەنجەرە + ی > پەنجەرەی: پەنجەرەی خانوو

گۆزە + ی > گۆزەی:

گۆزەی ئاو.. هتد

ـ ٢ ـ

**مۆرفیمی (ی) ی جێناوی لکاوی کەسیی دووەمی تاکی دەستەی دووەم**

ئاشکرایە، جێناو بەشـێکی سـەربەخۆی زمانـە و لـە ئاخـاوتندا ڕۆڵێکـی بـەرچاو دەبینێ، چونکە زۆر بەکاردەهێنرێت. جێناو لە بواری واتاوە دەکـرێ بـە چـەند جۆرێـك، ئەو جۆرانە لە ڕووی سیفەت و خاسیەتی ئەو پێوەندییـەوە جیـا دەبنـەوە کـەوا هـەندێ گرووپی جێناو دەگەیەنن.

لە زمانی کوردیدا تا ئێستا چەندین جۆر جێناو دیـاری کـراون. بـەلآم ئـەوەی گرنـگ بێ و پێوەندیی بە باسەکەی ئێمەوە هـەبێت، (جێنـاوی کەسیی لکـاو) ە، ئـەم چەشـنە جێناوەیش لە دیالێکتی خوارووی کوردیدا، بەسەر دوو بەشی سەرەکیدا دابەش دەبن:

١ـ بە هێز

٢ـ بێ هێز

دەستەی یەکەمیان واتە ـ بەهێز: (م، ت، ی، مان، تان، یان) نـن، کـە زۆر چـالاك و بەهێزن و ڕێزماننووسانی کورد لە سەری هیچ کێشەیەکیان نییە. دەستەی دووەم واتـە ـ

بێ هێز، كە دوو بەشە، بەشی یەكەم: (م، ی/ یت، یّت/ ات، ین، ن، ن) و بەشی دووەم: (م، یت/ ی، $\boldsymbol{\theta}$، ین، ن، ن) [٢١].

هەر چەندە دەستەی دووەمی جێناوەكان، وەك دەستەی یەكەم چالاك و بەهێز نین، بەلاّم ئەوانیش بە وێنەی دەستەی یەكەم دەتوانن ببن بە بەشێك لە ڕستە و ڕۆڵی كارا یاخود بەر كار ببینن، جگە لەوەی بەكرداریشەوە دەنووسێن، هەروەها: ((دەچنە سەر گەلێ بەشە ئاخاوتنی تریش و... جا بۆیە ڕاست نییە بە كۆتاییی كردار لە قەڵەم بدرێن)). [٢٢]، [٢٣]

دەمەتەقێ و مشتومڕ لە سەر فۆرمی (یت)، (ی/ یت)، (ی)..ی جێناوی كەسیی دووەمی تاكی دەستەی دووەم بەرچاو دەكەوێ و هەیە. [٢٤]

---

(٢١) بۆ زانیاریی پتر بڕوانە: وریا عومەر ئەمین، ڕێزمانی ڕاناوی لكاو، بەغدا، ١٩٨٦، ل: ٨.

(٢٢) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی كوردی، بەرگی یەكەم (وشەسازی)، بەشی دووەم - جێناو - ل: ١١٨.

(٢٣) مامۆستا وریا عومەر ئەمین دەڵێ: "كۆمەڵی دووەم و سێیەم - مەبەست بەشی یەكەم و دووەمی دەستەی دووەمە - ئازاد) هەمیشە بە ڕەگی فرمانەوە ئەلكێن" .. (بڕوانە: وریا عومەر ئەمین، ڕێزمانی ڕاناوی لكاو، ل: ١٣).

(٢٤) بە وێنە: مامۆستا سەعید سدقی كابان لە كتێبی "مختصر صرف و نحو كوردی، بەغدا، ١٩٢٨، ل: ٢٩ - ٣٠" دا و مامۆستا ئەحمەد حەسەن ئەحمەد لە كتێبی "ڕێزمانی كوردی، بەغدا، ١٩٧٦، ل: ١٥٩ - ١٦٧" دا و د. وریا عومەر ئەمین لە وتاری "لایەنێكی جیاوازی، گۆڤاری كۆڕی زانیاری عێراق - دەستەی كورد، ب ١٠، بەغدا، ١٩٨٣، نەخشەی ٣، ل: ٢٦١" دا و لیژنەی زمانی كوردی كۆڕی زانیاری عێراق - دەستەی كورد، لە بەرهەمی "بەراوردكاریی لە نێوان زارە كوردییەكاندا، گۆڤاری كۆڕ، ب ١٠، بەغدا، ١٩٨٣، ل: ٣٢٩" دا .. فۆرمی (یت) یان بۆ كەسیی دووەمی تاكی جێناوی لكاوی دەستەی دووەم دیاری كردووە.

مامۆستا تۆفیق وەهبی لە كتێبی "دەستووری زمانی كوردی، جزئی یەكەم، بەغدا ١٩٢٩، ل: ٨٥-١٠٢" دا، فۆرمی (ی، یت) ی دەست نیشان كردووە.

د. ن. مەكەنزی لە كتێبی: " Kurdish Dialect Studies, London, 1957, p. 110 " دا، وا ڕادەگەیەنێ كە لە سلێمانی و وارماوە: (ی/ یت) باوە و لە بنگرد و پشدەر و موكریان و هەولێر و

مامۆستا ئەورەحمانی حاجی مارف دەربارەی فۆرمی کەسیی دووەمی تاکی دەستەی دووەمی جێناوە لکاوەکانی دیالێکتی کرمانجیی خواروو دەڵێ: "بە ڕای ئێمە ئەوانەی (ت) یان (یت) یان (۰) یان (ە).. یان بە جێناوی کەسیی دووەمی تاکی دەستەی دووەم داناوە بە هەڵەدا چوون و تەنیا ئەو تاقمە ڕاست بۆ مەسەلەکە چوون کە (ی) یان دەست نیشان کردووە.."[٢٥] .

ئەوەی شایانی وەبیر هێنانەوەیە، مامۆستای ناوبراو چەند بەلگەیەکی ئەدەبی و مێژوویی .. بۆ پاڵپشتی ئەو بۆچوونەی هێناوەتەوە، ئێمەش لەبەر ڕووناکاییی ئەو بەلگانە و نەختێ بەلگەی دیکە بۆچوونمان دەخەینە ڕوو:

١. دەرکەوتنی دەنگی (ت) لەگەڵ (ی) دا، تەنیا مەسەلە ڕێکەوتنە، چونکە دەنگی (ت) دەنگێکی هێمن و کپە لە شێوازی دەربڕینیشدا دەنگی (تەوژمۆک)ە، هەر بۆیە لە هەموو دەنگێکی تر بۆ (ی - $\hat{I}$) و (ی - $y$) لە بارترە، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە هەر دەنگێك لەو دەستە و تاقمی دەنگی (ت) بن، بۆ (ی) دەگونجێن. لەبەر ئەوەی سروشتی دەنگی (ت) بڕیاری ئەم لێك وەشاوەیەیی داوە.

٢. لەبەر دووری و کەمیی کاریگەریی قوتابخانە شیعرییەکان و زمانی نووسین لە سەر هەندێ ناوچەی وەك: موکریان و سۆران - بە تایبەتی هەولێر، دەشتی هەولێر،

---

ڕەواندز و خۆشناوەتی (ی) بە کار دێنن.

مامۆستا نووری عەلی ئەمین لە کتێبی "ڕێزمانی کوردی، سلێمانی، ١٩٦٠، ل: ٩٢ - ٩٥" دا، ئەم فۆرمانەی "ی/ یت، ە، ." ی بە وێنەی ئەو جێناوە یادداشت کردووە.

مامۆستا مەسعوود محەمەد لە وتاری "سووڕێکی خامە بە دەوری ڕاناو، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، ب٢، ژ١، بەغدا، ١٩٧٤، ل: ٩٠ - ٩٢" دا و د. نەسرین فەخری و د. کوردستان موکریانی لە کتێبی "ڕێزمانی کوردی بۆ پۆلی یەکەمی بەشی زمانی کوردی زانکۆی سەلاحەددین، ١٩٨٢، ل: ٦٨" دا، بۆ کەسیی دووەمی تاکی دەستەی دووەمی جێناوە لکاوەکانی دیالێکتی خواروو فۆرمی (ی) یان دەست نیشان کردووە... هتد.

(٢٥) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (وشەسازی) بەشی دووەم - جێناو - ل: ١١٩- ١٢٠.

خۆشناوەتی، ڕەواندز، باڵەکایەتی.. بگرە دەوروپشتی ناوچەی سلێمانیش [26] تاکو ئێستاش فۆرمی (ی)، سەرەڕای ئاخاوتن و فۆلکلۆر لە نووسینیشدا پتر لە (یت) بە کاردێت، بە وێنە:

"لە ڕەوڕەوەی وەردەکە
لە فڕینی وەك کۆتری
لە دونیاییم لۆ نەبووی
چت لێ بکەم ل قیامەتێ"

(فۆلکلۆر، ل: ٩٣- ٩٤)

"لەگەڵ تۆمە ئەی حەبیبم
من بریندارم تۆی تەبیبم
خودا بتکا بە نەسیبم"

(فۆلکلۆر، ل: ٥١) ..هتد

"..مەگەر ئەتو پادشای یا وەزیر؟ درۆیان دەکەی، دەڵێی ئەمن زۆرم خزمەتی سولەیمان پێغەمبەر کردووە".

(توحفەی مظفریە، ل: ١٩٤)

".. ئەتۆ زۆر بێ شەرمی لە پێش چاوی بەنی ئادەمی سواری مریشکی دەبی،شەرمێ لە شای ناکەی".

(توحفەی مظفریە، ل: ١٩٤) ..هتد

٣- زۆر جار بیانوو بۆ ئەوە دەهێنینەوە، کە گوایە دەنگی (ت) لە هەندێ حاڵەتی گەردانیدا دەچێتە سەر (ی)، بۆ نموونە:

---

(26) D. N. Mackenzie, Kurdish Dialect, London 1957, p. 110.

"ئەی قەیس .. ئەی دەنگی بلبل
چڵ ئەخەیتە لەرەی هەی هەی!"

(گۆران، س، ل: ٤٥٠)

"دەرحەق بە "عیلم و مەکتەب" ئەتو هاتیتە زبان
((فکری)) بڵندی تۆیە گەیشتۆتە ((موشتەری)) "

(زێوەر، ل: ٢٣).. هتد

بەلاّم لە بەرهەمی شاعیران و فولکلۆری کوردی و گفتوگۆی ئێستای گەلێ ناوچەی دیالێکتی کرمانجیی خواروودا، لەو بارە گەردانییەشدا (ت)ەکە ناهێتە ناو کردارەکەوە، وەك:

"رێوی گوتی.. ((گوێ نادەیە کەس؟))"

(توحفەی مظفریە، ل: ١٩٤)

"بۆ پارە حەیفە خۆ دەکەیە پوولی نارەواج
بۆ پاروویێکی نان ئەسەفە روو دەکەی بە ساج"

(مەحوی، ل: ٩٢).. هتد

٤ـ لە هەندێ بەشە دیالێکتی وەك: "هەورامی، لوری.. دا ئەو جێناوە دیسان هەر (ی) یە".[٢٧]

٥ـ لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا تەنیا فۆرمی (ی) بۆ کەسیی دووەمی تاك لە کاردایە، بە وێنە:

"ئەمان، مەمۆ تۆ چ دکی؟ .."

(مەمێ ئالان، ل: ٥٨)

---

(٢٧) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، رێزمانی کوردی، جێناو، ل: ١٢٢.

"شێخێم ! تۆ دزانی ئـــەڤ جزیرە

تێـکدا کوبرا و کــــــورد مــیرە"

(خانی، ل: ١٥٢) ..هتد

٦ـ مامۆستا مەسعوود محەمەد ورد و جوان بۆ ئەوە چووە کە جێناوی لکاو: "لەبەر زێدە گرنگی ئەو دەورەی پێی هەڵدەستێ لە ئاخافتندا، ناشێ هیـچ پیتێکی بقرتێ. لە پێش چاومانە ڕاناوە چالاکەکانی (مەبەست جێناوە لکاوەکانی ـ ئازاد؛ (مان، تان، یان) لە هەموو حاڵێك و لە هەموو ئەو لەهجانەدا کە بەکاریان دێنن وەك خۆیان دێنەوە و هیـچ پیتێکیان لێ کەم ناکرێتەوە، تێیەکەی (دەکـەیت) یش ئەگەر پیتێکی بنجی با دەبوا ئەویش وابا. لەمەش زیاتر دەتوانم بڵێم: بۆ دەبـێ ڕێ هـەبێ تێیەکە بقرتێ و بگوترێ (دەکەی) کەچی ڕێ قرتانی (بێیەکە) نەبێ، خۆ زۆر ئاشکرایشە دەنگی (ی) لە کوردیـدا بە ئاسانی لە ناو ناچێ! ئەگەر بێیەکە بنجی نـەبا دەبوا ئـەو ببێتـە قوربـانی تێیەکـە و بگوترێ (دەکەت لە جێگەی دەکەی). هەر هەمان دەنگی (ت) لە ڕابوردووی تێپـەڕدا بـە هۆی ئەوەوە کە ڕاناوە هەر گیز تێ چوونی بۆنییە".[٢٨]

٧ـ لێکۆڵینەوە دەری خستووە، هـەندێ لـەو زمانانـەی خزمایـەتییان لەگـەڵ زمـانی کوردیدا هەیە، دیسان دەبینین ئەو جێناوە لەو زمانانەشـدا هـەر فۆرمـی (ی) هەیـە. بۆ نموونە زمانی فارسیی ناوەڕاست[٢٩] و زمانی فارسیی نوێ[٣٠]، [٣١] و .. هتد.

---

(٢٨) مەسعوود محەمەد، سووڕێکی خامە بە دەوری (ڕاناو) دا، گۆڤاری ((کۆڕی زانیاری کورد))، بەغدا، ب٢، ژ١، ١٩٧٤، ل: ٩١.

(٢٩) لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا "ی (یە)" جێناوی کەسیی دووەمی تاکە. (بڕوانە: د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی ـ جێناو ـ ل: ١٢٣، پەراوێز ٢٢).

(٣٠) ذو النور، دستور پارسی در صرف و نحو و املای فارسی، تهران ١٣٤٣، ل: ٢٨.

(٣١) (ی) لە زمانی فارسیی نوێشدا جێناوی کەسی دووەمە و لە دەستەی جێناوە لکاوەکانی کارادایە، کە ئەمانەن: (م، ی، د، یم، ید، ند) ـ دەچێتە سەر هەموو جۆرە کردارەکانی ڕابوردوو و ڕانەبوردوو و .. هتد، وەك: (رفتم، رفتی، رفت (رفتند) .. هتد) و (می رفتم، می رفتی، می رفت (می رفتند).. هتد). (بۆ زانیاریی پتر. بڕوانە: حسن آنزلی، دستور زبان فارسی، ارومیە، ١٣٠٠، ل: ٣٩).

جێناوی (ی) بۆ کەسی دووەمی تاک سەرەڕای ئەوەی بە ڕابوردووی تێنەپەڕەوە، دەلکێ وەک: نووستی / یت، چووی / یت، مردی / یت ... هتد، هەروەها بۆ کەسی دووەمی تاکی کاتی ئێستا و دواهاتووش بە کار دێ، جا یا کردارەکە تێپەڕ بێ یاخود تێنەپەڕ. پێویستە ئەوەش بگوترێ کە: "گەر فەرمانەکە لە کاتی داهاتوودا بوو. چ تێپەڕ بێ چ تێنەپەڕ بۆ دەربڕینی ڕێکەوتن لەگەڵ بکەرا"[32] بەشی دووەمی دەستەی دووەمی: (م، ی / یت، ات، ێت، ین، ن) لەگەڵدا دەردەکەوێت.

لەگەڵ کرداری تێپەڕدا دێت، بە وێنە:

دەنێـرم - دەنێریت - دەنێرێ / ێت - دەنێرین - دەنێرن - دەنێرن.

دەفرۆشم - دەفرۆشیت - دەفرۆشێ / ێت - دەفرۆشین - دەفرۆشن - دەفرۆشن.

دەنووسم - دەنووسیت - دەنووسێ / ێت - دەنووسین - دەنووسن - دەنووسن.

دەشێ لە هەمان کرداردا (ت) ی (یت)[33] لابرێ و بە تەنیا (ی) بمێنێتەوە، بە نموونە:

دەنێـرم - دەنێری - دەنێرێ - دەنێرین - دەنێرن - دەنێرن.

دەفرۆشم - دەفرۆشی - دەفرۆشێ - دەفرۆشین - دەفرۆشن - دەفرۆشن.

دەنووسم - دەنووسی - دەنووسێ - دەنووسین - دەنووسن - دەنووسن.

دووبارە دەشێ جێناوی (ی) لەگەڵ کرداری تێنەپەڕیشدا دەرکەوێ، بە وێنە:

دەچم - دەچیت - دەچێت - دەچین - دەچن - دەچن.

دەمرم - دەمریت - دمرێت - دەمرین - دەمرن - دەمرن.

دەنووم - دەنوویت - دەنوێت - دەنوین - دەنوون - دەنوون.

دەگونجێ ئەو کردارە تێنەپەڕانەی سەرەوە بە (ی) یش کۆتاییان بێ، وەک:

دەچی، دەمری، دەنووی ...

---

(٣٢) وریا عومەر ئەمین، ڕێزمانی ڕاناوی لکاو، ل: ١٠.

(٣٣) بە هەمان شێوە (ت) ی (ێت) ی کەسی سێیەمی تاکیش لادەچێ و (ێ) بە تەنیا دەمێنێتەوە. وەک نموونەکانی سەرەوە.

لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا جێناوی (ی) بۆ کەسی دووەمی: "تاکی نێر و مێ"[34] بەم شێوەیەی خوارەوە بە کار دێت:

١ـ لەگەڵ کرداری ڕابوردوو و داهاتووی تێنەپەڕدا دێ، بۆ نموونە:

تو چوی Tu çuy

تودێ چیی Tu dēçīy

٢ـ دیسان دەلوێ جێناوی (ی): "لەگەڵ کرداری داهاتووی تێپەڕ" یشدا[35] بێت، وەك:

تو دێ نامێ نڤیسیی[36] Tu dê namê nivîsîy

**ـ ٣ـ**

## مۆرفیمی (ی) ی جێناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاکی دەستەی یەکەم

دەستەی یەکەمی جێناوە لکاوەکانی زمانی کوردی، کە بریتین لە: (م، ت، ی، مان، تان، یان) مشتومڕێکی ئەوتۆیان لە سەر نییە.

جێناوی (ی) ی کەسی سێیەمی تاك لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووا، جێناوێکی چالاك و بە هێزە، بە زۆری لەگەڵ کرداری ڕابوردووی تێپەڕدا بە کار دێت[37]، وەك:

---

(٣٤) محەمەد تاهیر گوهەرزی، ڕێزمانا کوردی ـ زاری کرمانجی ـ دهۆك، ١٩٩٩، ل: ٨٠.

(٣٥) هەمان سەرچاوە، ل: ٨١.

(٣٦) مۆرفیمی (ی) لە زمانی عەرەبیشدا: "بەندە بە ژمارە و زایەند" ەوە، بۆ کەسیی دووەمی مێ دەچێتە سەر کرداری ڕانەبوردوو، وەك: لم تفعلي، لن تفعلي.. (بڕوانە: د. نوزاد حسن احمد، المنهج الوصفي في كتاب سيبويه ، ط١، بنغازي، ١٩٩٦، ص: ١٧٨). هەر هەمان شێوە لە کرداری داخوازیشدا: "ژمارە و زایەندی مێ" دەست نیشان دەکات، بە وێنە: اكتبي، اذهبي.. (بڕوانە: اشواق محمد اسماعيل النجار، دلالة اللواصق التصريفية في اللغة العربية، رسالة ماجستير، كلية الآداب، جامعة صلاح الدين، ٢٠٠٠، ص: ٩٢).

(٣٧) جێناوی کەسیی سێیەمی تاك لەگەڵ ڕابوردووی تێنەپەڕدا دەرناکەوێ، بە وێنە: نووست Ø ، چوو Ø ، مرد Ø .. بەڵام لەگەڵ کرداری ڕانەبوردووی تێپەڕ و تێنەپەڕدا بە فۆرمی (ات) یان (ێت) بەم شێوەیە دەردەکەوێ: "ئەگەر ڕەگی کاتی داهاتووی فرمانەکە بە (ۆ) یا (ە) کۆتایی هاتبێ، ئەوە

هەناردم ـ هەناردت ـ هەناردی ـ هەناردمان ـ هەناردتان ـ هەناردیان.

"میر بە سەد مینەت هەناردی ئێسترێکی ڕووت و قووت

دەست و پا سست و سەقەت ئەندامی هەروەك عەنکەبووت"

(شێخ ڕەزا، ل: ٣١)

وتم ـ وتت ـ وتی ـ وتمان ـ وتتان ـ وتیان.

"سەری بە عیشوە لەقان و، بەلەهجەیێکی حەزین

وتی: بچۆوە بپرسە لە جینسی پیـــــاوی بـــــرات"

(گۆران، س، ل: ١٩) .. هتد

ئەم جێناوە ئەگەر چی بە شێوەیەکی سەرەکی دەچێتە سەر کرداری ڕابوردووی تێپەڕ، بەڵام بە زۆر بەشە ئاخاوتنی ترەوە دەلکێت، هەر وەك:

١ـ

أ ) دەچێتە سەر ناو، بە وێنە:

"کام ئەستێرەی گەش، کام گوڵی کێوی،

ئاڵە وەك کوڵمی؟ گۆی مەمکی؟ لێوی؟"

(گۆران، س، ل: ١٠)

ب) دەچێتە سەر ناوی ناسراو (ناو + ەکە)، وەك:

"مێردە لە ئیش هاتەوە، دیتی ژنەکەی ڕەفتاری جارانی نەماوە"

(ئەفسانە، ل: ٣٥٤)

ج ) لەگەڵ ناوی ناسراوی کۆ (ەکە + ان) دا، بۆ نموونە:

" .. یان ماڵ و سامانێکی زۆری لە ماڵەوە هەیە، یان منداڵەکانی باشن"

(ئەفسانە، ل: ٣٦)

٢ـ بە ئاوەڵناوەوە دەلکێ، وەك:

---

ڕاناوە لکاوەکە قالبی (ات) ئەگرێتەوە خۆ، دوای ئەوەی (ۆ) ئەبێ بە (و) ی کۆنسـۆنانت و (ـە) دەتوێتەوە: ئەخوات، ئەکات.. لە هەموو حاڵەتێکی تردا ڕاناوەکە خۆی بە (ێت) دەر ئەخات: ئەمرێت ـ ئەچێت ـ ئەنوێت .. هتد" (بڕوانە: وریا عومەر ئەمین، ڕێزمانی ڕاناوی لکاو، ل: ٢٥).

"بێ ئاوازەیە، دەنگە نەرمەکەی

با نەیدا لە گوێم، تێر نەڵێم ئۆخەی"

(گۆران، س، ل: ١٠)

٣ـ لەگەڵ زۆربەی جێناوەکاندا دێت:

أ) لەگەڵ جێناوی کەسیی جودا، وەك:

"نوزە و گریان و وەڕینی.. بۆ منی دەنارد، تا فریای بکەوم"

(تەنیایی، ل: ٢٠)

ب) لەگەڵ جێناوی خۆیی، بە وێنە:

"میر بۆ خۆی هەڵستا بۆ خۆی هاتە ئەو ناوە"

(تحفەی مظفریە، ب١، ل: ٣١٩)

ج) لەگەڵ جێناوی نیشانە، وەك:

"ئای، ئەوەی زریزەی دیوە، زریزەی ئازاد؟"

(ئەلف و بێ، ل: ٢٠)

د) لەگەڵ جێناوی نەفی، بە وێنە:

"پاشا بێ دەنگ بوو، وەزیر هیچی نەگوت و خزم و خۆیشی دەربـاریش مەتـەقیان لێـوە نەهات"

(ئەفسانە، ل: ٤٧) .. وهتد

٤ـ دەچێتە سەر چەند جۆرێك لە ئاوەڵکردار:

أ) ئاوەڵکرداری شوێن، وەك:

"دەستەمۆ و چەشی

فیـێرە بــاوەشی"

(گۆران، س، ل: ٤٢٦)

ب) ئاوەڵکرداری کات، وەك:

"خوێنی تورەی ئاگرینمــان،

لــە دەمــارا جــولاّیــەوە،

ئەو رۆژ<u>ی</u> .. خۆت مەشارەوە"          (شەونامە، ل: ٥٧)

ج) ئاوەڵکرداری وەسف      ی  'ـمونه:

"ئەو هاوڕێیەم <u>ئەوەندەی</u> سەگ خۆش دەویست، بە وەڕینی دەکەوتە سەر سەما"

(تەنیایی، ل: ٢٣)

جێناوی (ی) ی کەسیی سێیەمی تاك کە لەگەڵ کرداری سادەدا دێت، دەکەوێتە کۆتاییەوە، وەك: خواردی، کردی، بردی و.. هتد.

بەڵام ئەگەر کردارەکە دارێژراو بێ دێتە پێشەوە و لە کۆتایی پێشگرەکەوە دێت، بە وێنە:

تێ + گرت + ی > تێی گرت

ڕا + گرت + ی > ڕای گـرت

تێ + کرد + ی > تێی کرد

ڕا + کرد + ی > ڕای کرد .. هتد

خاڵێکی گرنگ کە نابێت لە بیر بکرێـت، ئـەویش ئەوەیـە: "هـەر ئـەو (ی) یـە دەبێتـە مضاف الیە .. "[٣٨]، وەك:

دارا ئەهات براکەی هات ـ براکەی هات

هەروەهـا جێنـاوی (ی) لـە دوای (ی) ی تیـژەوە ون دەبـێ و مەحاڵـە بدرکێـنرێ، بـۆ نموونە: نووسی، پرسی، دزی.. هتد

---

(٣٨) ڕێزمـانی ئاخـاوتنی کـوردی بـە پێـی لێکۆڵینـەوەی لیژنـەی زمـان و زانسـتەکان، بەغدا، ١٩٧٦، ل: ٥٤.

## - ٤ -

**مۆرفیمی (ی) ی کۆتایی جێناوی کەسیی جودا لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا**

هەروەك لێکۆڵینەوە دەری خستووە، "کە ڕەسەنی نێر و مێ لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا زۆر بە ئاشکرا دیارە و تا ئێستاش بە بەردەوامی پەیڕەو دەکرێت"[٣٩]. بە پێچەوانەوەش لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووداء لە چەند بارێکدا نەبێ - دواتر لێی دەدوێین - ڕووە و توانەوە و تێچوون چووە[٤٠] ئەم زایەندی نێر و مێیە تەنانەت لە جێناوەکانیشدا خۆی دەنوێنێت، بە پێی زایەندی و دۆخ لەم دیالێکتەی زمانی کوردیدا جێناوی کەسیی جودا دابەش دەکرێتە دوو بەشەوە، لە دەست نیشانکردنی ئەم دوو بەشە، دۆخ ڕۆڵی سەرەکیی خۆی دەبینێ، بۆ وێنە:

لە دۆخی ڕاستەوخۆدا بەو شێوازەی خوارەوە دەردەکەون و بە کاردێن:

| ژمارە | کەس | جێناوی جودا |
| --- | --- | --- |
| تاك | یەکەم | ئەز |
| | دووەم | تو |
| | سێیەم | ئەو |
| کۆ | یەکەم | ئەم |
| | دووەم | هوون |
| | سێیەم | ئەو، ئەوان |

هەروەها لە دۆخی تیاندا بەو شێوەیە بە کاردێن:

(٣٩) لەیلا جەلیل عەبباس دەلۆ، مۆرفیمەکانی (ی) لە زمانی کوردیدا بە کەرەستەی کرمانجیی خواروو و ژووروو، نامەی ماجستێر، کۆلێجی پەروەردە - ئیبن ڕوشد، زانکۆی بەغدا، ١٩٩٨، ل: ٧٠.

(٤٠) بڕوانە (ل: ٤٠،٤٢ ) ی ئەم لێکۆڵینەوەیە.

| ژمارە | کەس | جێناوی جودا |
|---|---|---|
| تاك | یەکەم | من |
| | دووەم | تە |
| | سێیەم | (ئەوی / وی) بۆ نێر*<br>(ئەویَ / ویَ) بۆ مێ |
| کۆ | یەکەم | مە |
| | دووەم | وە |
| | سێیەم | ئەوان / وان |

واتە لە کەسیی سێیەمی تاك بۆ زایەندی نێرینە (ئەوی / وی) بە کاردەهێنرێت، کە ئەم مۆرفێمی (ی) بەی کۆتاییش دەست نیشانکردنی زایەندی نێرە لە دۆخی تیاندا، بۆ زایەندی مێیش (ئەویَ / ویَ) بە کار دەهێنرێت[41].

"فۆرمی ئە (ویَ) و ئە (وی) دۆخی تیان لە بناغەی (ئەو) و (یَ) ی نیشانەی جنسی مێ و (ی) نیشانەی جنسی نێر سازبووە"[42]، بۆ نموونە:

".. ئادەم ژ ویَ کاسیَ ڤە خوار، ڤە ژی یا،
مـــەســـت بـوو هـەژی یـــا
گۆشـــت ژێ خـــواست وی روحیـا
خـویـنێ ل جـانـیَ وی گـەڕی یـا"

(ڤەولی زەبوونی مەیسوور، ل: ١٥٩)

"وی قەڵەم هەیە .. هتد"

---

* کە مەبەستی لێکۆڵینەوەکەی ئێمەیە.

(٤١) لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووا، نە بۆ نێر و نە بۆ مێ (ی) و (یَ) دەرناکەون.

(٤٢) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (وشەسازی)، بەشی دووەم - جێناو - ل: ٨٥.

خاڵێکی بەرچاو کە پێویستە لە یاد نەکرێت، ئەوەیە: "جێناڤێن نەپەن (نادیار - ئازاد) ئەون دهێنە گوتن بۆ کەسی یا تشتێ نەدیار، ئەو ژی ئەڤەنە: (ئەوی - وی، ئەوێ - وێ، ئەوان - وان، ئەو" [٤٣] ، کە (وی / ئەوی) بۆ تاکی نێری دوور، هەروەها (وێ / ئەوێ) یش بۆ تاکی مێی دوور بە کار دێت [٤٤]

جێناوی کەسیی جودای دۆخی ڕاستەوخۆش لە دیالێکتی ناوبراودا بریتییە لە: (ئەز، تو، ئەو) بۆ تاک و (ئەم، هوون، ئەوان "ئەو" بۆ کۆ، نیشانەی (ە) و (ی - Î) وەردەگرێ، لە حاڵەتی تاکدا بۆ سازبوونی زایەندی نێر نیشانەی (ی - ) Î و زایەندی مێ نیشانەی (ە) بە کار دێنرێ [٤٥]، وەک:

| جێناوی جودا | | کەس | ژمارە |
|---|---|---|---|
| مێ | نێر | | |
| ئەزە | ئەزی | یەکەم | تاک |
| توە | توی | دووەم | |
| ئەوە | ئەوی | سێیەم | |

---

(٤٣) محەمەد تاهیر گوهەرزی، ڕێزمانا کوردی (زاری کرمانجی)، ل: ٨١.

(٤٤) هەروەها: ((ڤی - ئەڤی: ژ بو یەکینی بێ نێری نێزیک.. ڤێ - ئەڤێ: مێینی یەکینی یا نێزیک..)) بە کار دێت. (بڕوانە سادق بەهائەددین ئامێدی، ڕێزمانا کوردی (کرمانجیا ژووری و ژێری یا هەڤبەرکری)، بەغدا، ١٩٨٧، ل: ٢٣٨ - ٢٣٩).

(٤٥) لەگەڵ جێناوی کەسیی کۆشدا نیشانەی (ە) بۆ نێر و مێ بە کار دێ، ئەمە سەرەرای ئەوەی جێناوی کەسیی جودا، کە لەگەڵ کرداری کاتی ڕابوردوو و ئایندەی ڕێژەی ئیخباریدا یان ئایندەی ڕێژەی ئینشائیدا دێت، نیشانەی (ێ) وەردەگرێ، بە وێنە:

گوت...: "چەند رۆژا شووندا ئەزێ ژ تە ڕا بێژم" (کوردۆ، ل: ٤٥).

ئەزێ هەریم ناڤ وان ژ خوە ڕا یەکە رند بێژم .. (کوردۆ، ل: ٤٢)

ئەزێ بان کم جێرێ و خولامانا (مەمی ئالان، ل: ٤٩).. هتد

## – ٥ –

### مۆرفێمی (ی) ی نیشانەی زایەندی نێر لە دۆخی تیاندا

مۆرفێمی (ی) وەك نیشانەی زایەندی نێر لە دۆخی تیان لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خوارووی زمانی کوردیدا، بەرچاو دەکەوێ. لە سەرجەمی بەشە دیالێکتەکانی کرمانجیی ژووروودا، تا ئێستا بە شێوەیەکی زیندوو و چالاك بە کار دێ، هەرچی لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووداییە تەنیا ناوچەی سلێمانی نەبێ [٤٦] تا ئەم رۆژگارەش بە فراوانی دەبینرێ و بۆ جیاکردنەوەی زایەندی نێر لە مێ لە دۆخی تیاندا بە کاردێ.

بە وێنە لە ناوچەی موکریان وا باوە:

"شاهـ عەبباس رۆیەوە ئیسفەهانیّ، لەشکری خڕ کردەوە، ناردی بۆ سەر خانی"

(تحفەی مظفریە ، ب١، ل: ١٨١)

"زۆر پاراوە لە ساحب مالّی"

(تحفەی مظفریە ، ب١، ل: ١٨٥)

"رێوی‌یێك چووە کن کەڵەبابی"

(تحفەی مظفریە ، ب١، ل: ١٩٢)

"بەلاّ ئەمە کاکە مەمی هەلگرین بیبەینە جزیر و بۆتانە"

(تحفەی مظفریە ، ب١، ل: ٢٢٦)

"ئەمن لە کنم وابوو، ئەتوو سەرکردەی لەشکری.."

(تحفەی مظفریە ، ب١، ل: ٣٢١) ..هتد

لەو ڕستانەی یادداشتمان کردوون، وشەکانی: (عەبباس، مالّ، کەڵـەباب، کاکەمـەم،

---

(٤٦) هەندێ پەندی پێشینان هـەن نیشانەی (ێ) ی مێی پێوە دیارە لە دۆخی تیاندا: "جا ئەو (ێ) یەی لەو پەندانەدا خۆی نواندووە لەوە دەچێ پاشماوەی جنسی مێ بێت لە بەشە دیالێکتی سلێمانیدا: دشی دشێ، بە چی دەچێ (پ، پ، ل ٢١٦)

ژن لە ساجێ، مێرد لە حەجێ پێکەوە گەیشتنە جێ (ل: ٤، ٣)

بۆ زانیاریی پتر بڕوانە، د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ناو، ل: ١٧٨ – ١٧٩)

لەشکر..) لەبەر ئەوەی لە زایەندی نێرن و لە دۆخی تیاندان، نیشانەی (ی) یان چۆتە سەر.

چۆن لەو نموونانەی سەرەوەدا بۆمان بە دیار کەوت، کە لە ناوچەی موکریاندا (ی) وەك نیشانەی نێر لە دۆخی تیاندا بە ناوەوە دەنووسێت، بە هەمان شێواز لە ناوچەی سۆرانیشدا دەبینرێ، بە وێنە:

"مامەکم هەیە لە زووری
سەری گەورەترە لە هووری"

(فۆلکلۆر، ل: ١٢) [٤٧]

"مەیلەکم هەیە مەیلانی
لەناو بوخچەی سوڵتانی
خوا نەبێ کەس نازانی"

(فۆلکلۆر، ل: ١٢)

"چوومە کەژێ قەندیلی
بەفری کۆنی لێ ماوە"

(فۆلکلۆر، ل: ٨٩)

"دەچمە ماڵی دەلالێ
دەرکەی ڕوو لە سەفینی"

(فۆلکلۆر، ل: ٩٥).. هتد [٤٨]

---

(٤٧) بۆ لێکۆڵینەوە لە کێشەی نێر و مێ، کتێبی "تحفەی مظفریە" بۆ بەشە دیالێکتی موکری و کتێبی " فۆلکلۆری هۆنراوەکانی کوردەواری" بۆ بەشە دیالێکتی سۆرانی.. کەرەستەیەکی بێهاوتان و ئێمەش کردوومانن بە سەرچاوەی باس و لێکۆڵینەوەکەمان.

(٤٨) لە کتێبی "فۆلکلۆری هۆنراوەکانی کوردەواری" دا، زۆر جار ناو وەك زایەندی نێر نیشانەی (ی) و هەروەها وەك زایەندی مێ نیشانەی (ێ) ی پێوە نووسێنراوە، بۆ نموونە وشەی "مووسڵ" جارێك نیشانەی (ی) و جارێکیش نیشانەی (ێ) ی پێوە لکێنراوە:

لەو ڕستانەی سەرەوەدا، ناوەکانی: (زوور، سوڵتان، قەندیل، سەفین..) لەبەر ئەوەی لە زایەندی نێرن و لە دۆخی تیاندان، نیشانەی (ی) یان پێوە لکاوە.

لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروشدا، هەر چەندە لە حاڵەتی ئاساییدا نیشانەی تایبەتیی وەها جیاوازیی نییە زایەندی ناو دیاری بکات. بەڵام لە دۆخی تیاندا زۆر ڕوون و ئاشکرا نیشانەکانی پارێزراون و: "لە دیالێکتی ژوورودا دۆخی تیانی تاك کۆتایی بە نیشانەی دۆخی تیان دێ، کە ئەویش.. وە (- ی) دەبێ، کە ناوەکە ڕەسەنی نێر دەبێ "(49).

کەواتە بۆ دیاری کردنی زایەندی نێر و مێ لە زمانی کوردیدا پێویستە نیشانەکانی نێر و مێ بە گوێرەی حاڵەتەکانیان جیا بکرێنەوە و باس بکرێن.

چەند نموونەیەك بۆ زایەندی نێرینە لە دۆخی تیاندا، لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروی زمانی کوردی:

"ب خدمەت عرضی سولطانی

عەبیر و عەنبەر ئەفشان بت"

(جزیری، ل: ٥٤١)

---

چوومە شاری مووسڵێ

ڕاوەستام لە دوکانێ

(ل: ٤١)

دەچم مووسڵێ دەبینم

کیسەك خەنەی لۆ دێنم

(ل: ٨١).. هتد

ئەم جۆرە تێکەڵ کردنە، لەبەر هەر هۆیەك بێ، وەك: (هەڵەی نووسەر، هەڵەی چاپ، هۆی بەرەو تەمانی جیاوازی زایەند..) لێکۆڵینەوەی دەوێ.

(٤٩) ك. ك. کوردۆییێڤ، ڕێزمانی کوردی بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجی و سۆرانی، د. کوردستان موکریانی لە زمانی ڕووسییەوە وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، هەولێر، ١٩٨٤، ل: ٧٩.

"وەکی میران دەست بدە خوە
وی شووری هلدە ڕاست و چەپ داقەشینە"

(صبری، ل: ٦٠)

"کافا کو دچینە نێڤ مەزاری
دا خەلقی نەبێژتن ب زاری"

(خانی، ل: ٢٩٢)

"ئەز چووم نك بەنگینی".. هتد

لە ڕستەکانی سەرەوەدا، وشەکانی: (سولطان، شوور، مەزار، زار، بەنگین..) ناوی نێرینەن و لە دۆخی تیاندان، بۆیە نیشانەی (ی) یان پێوە لکێنراوە[50].

حاڵێکی زۆر گرنگ کە نابێت هەرگیز لە یاد بکرێت، ئەویش ئەوەیە، لە دیالێکتی کرمانجیی خواروو، بە تایبەتی لە بەشە دیالێکتی سلێمانیدا - هەروەك پێشتر ئامارەمان بۆی کردووە - لە چەند حاڵەتێك نەبێت، بە تەواوی ئەم نیشانەی زایەندە نەماوە و بە بێ ڕەچاوکردنی زایەندی نێر و مێ نیشانەی (ی) بە کار دێ، واتا: "دۆخی تیان و دۆخی ڕاستەوخۆ لە بەشە دیالێکتی سلێمانیدا وەکو یەك وان"[51]، یەك نیشانەی لە ئارادایە، کە ئەویش (ی) یە. هەروەها لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروشدا: "هەندێ ناو بەرچاو دەکەون کە لە ڕیزی جنسی دوو لایەن دابنرێن، وەك: هەڤاڵ، سەرکار، دژمن، دۆست، بەرخ، کار، گۆلك، پشیك، کافر.. و گەلێکی تر. ئەو جۆرە ناوانە کاتێ لە دۆخی تیاندا بە واتای مێ دێن، ئەوە نیشانەی (ێ) یان دەچێتە سەر، خۆ ئەگەر بە واتای نێر بێن، ئەو دەمە نیشانەی (ی) یان پێوە دەلکێ"[52].

---

(٥٠) لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا لە دۆخی تیان و بانگهێشتندا نیشانەی (ێ) و لە دۆخی ئیزافەدا نیشانەی (ا، ە) زایەندی مێ دیاری دەکەن. هەر چی زایەندی نێرە، سەرەڕای نیشانەی (ی) ی دۆخی تیان لە دۆخی بانگهێشتندا (ۆ) و لە دۆخی ئیزافەدا (ێ، ی) وەدەگرێ.

(٥١) ك. ك. کوردۆییڤ، ڕێزمانی کوردی بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجی و سۆرانی، د. کوردستان موکریانی لە زمانی ڕووسیەوە وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، هەولێر، ١٩٨٤، ل: ٧٩.

(٥٢) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی - بەرگی یەکەم - مۆرفۆلۆژی (بەشی یەکەم) - ناو، ل: ١٨٣.

بە وێنە: "ئەزێ بەرخی چێرینم" ئەوە دەگەیەنێ من بەرخی نێر دەلەوەڕێنم، بەڵام کە دەگوترێ: "ئەزێ بەرخێ چێرینم"[53]، ئەوە دەست نیشان دەکا کە من بەرخی مێ دەلەوەڕێنم..

کەواتە سەرەڕای ئەوەی لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا یاسایەکی ڕێکوپێک هەیە بۆ دەست نیشان کردنی زایەندی نێر و مێ[54]، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ جار وا ڕێك دەکەوێ کە ڕیزپەڕ هەبێ، ئەویش دیاردەیەکی ئاساییە لە زماندا.

بەم شێوەیە دەگرێ بڵێین: لە هەردوو دیالێکتی زمانی کوردیدا نیشانەی (ی) لە دۆخی تیاندا بۆ زایەندی (نێر) بەکار هاتووە، ئەمیش ئەوە دەسەلمێنێ، کە نێزیکی نیشانەی نێر و مێ و یەکگرتنەوەی ناوی نێر و مێ لە دیالێکتەکانی زمانی کوردیدا، دەشێ بە فاکتەرێك لەو بەڵگە ڕاستیانە دابندرێ، کە نیشانی یەکبوونی زمانی کوردی دەدەن.

ئەگەر چاوێك بە بەشە دیالێکتی موکریان و سۆراندا بخشێنین، ئەو ڕاستییەمان بۆ بەدیاردەکەوێت. لە بەشە دیالێکتی موکریان وشەکانی: (شار، تەخت، مەم، بیر، هەویر، شێر، شان، کەباب، ئاور، دمدم، بەرد، دێ، گوند..) لە جنسی نێرن..

هەروەها لە ناوچەی سۆران وشەکانی: (نان، کاروان، سەرکار، بەران، مار، دیوار، سەماوەر، مێر، زار، سوڵتان..) لە زایەندی نێرن.

چەند نموونەیەك:

"جاریان لە شاریدا کێشا"

(تحفەی مظفریە، ب١، ل: ١٨٦)

---

(٥٣) هەمان سەرچاوە، ل: ١٨٣.

(٥٤) لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا نیشانەکانی (نێر و مێ و کۆ..) وەك: "کوڕی نان خوا، کچێ نان خوا، ژنکان جل شیشتن.. لەم ڕستانەی سەرەوەدا دەبینین: مۆرفێمەکانی (ی، ێ، ان..) سەرەڕای ئەرکی سەرەکی خۆیان ئەرکی ناسیاویشیان بینیوە". (بڕوانە: حاتەم ولیا محەمەد، فرێزی ناوی و فرێزی کاری لە کرمانجیی ژووروودا، نامەی ماجستێر، کۆلێجی زمان، زانکۆی سلێمانی، ٢٠٠٠، ل: ٩).

"سبحەینێ دەرِوێش رۆیەوە سەر تەخت"

(تحفەی مظفریە، ب١، ل: ١٨٨)

"لەسەر کۆشکی کاکە مەمی.."

(تحفەی مظفریە، ب١، ل: ٢٢٥).. هتد

"هەتیم کەچەر بگرە نانی

تۆ بە جێمای لە کاروانی"

(فۆلکلۆر، ل: ١١٦)

"ئەگەر ناوی نازانن

عەیشێ کەریم سەرکاری"

(فۆلکلۆر، ل: ١٤٤)

"دەچمە گەرێێ گۆرانی

دەکوژم نێری و بەرانی"

(فۆلکلۆر، ل: ١٦٩)

"دێتە خوارێ لە بانی

گولەی بێ بە قوربانی"

(فۆلکلۆر، ل: ١٤٣).. هتد

ـ٦ـ

## مۆرفیمی (ی) ی نیشانەی تێپەڕیی کردار لە بنەمای کاتی ڕابوردوو یان قەدی چاوگی (یائی) دا[55]

لە زمانی کوردیدا: "هەروەك زمانە ئێرانییەکانی دی کردار خاوەنی دوو

(٥٥) قەدی هەموو جۆرە چاوگە تێپەڕەکانی دیکەش نیشانەی تێپەڕییان هەلگرتووە، بۆ نموونە: (ا) لە (گێڕا)، (وو) لە (دروو)، (د) لە (خوێند)، (ت) لە (گرت). سەرەڕای کات، وەك مۆرفێم نیشانەی تێپەڕیی نیشان دەدەن.

بنەمایە" [٥٦] ، بنەمای کاتی ڕابوردوو، کە (قەد) یشی پێ دەڵێن، بنەمای کاتی ڕانەبوردوو[٥٧]. هەروەها هەر لە زمانی ناوبراودا، کرداری تێپەڕیی: "وەك زمانەکانی تر تایبەتییێکی بنجی تێدایە، ئەو تایبەتیەش بریتییە لەوەی کە پێویستی بە بەرکار (مفعول) هەیە بۆ تەواو کردنی واتاکەی" [٥٨]. واتا ئەم جۆرە کردارە تێپەڕانە لەگەڵ پەیدا بوون و دەرکەوتنیاندا هێزی تێپەڕییان تێدایە و بۆ پاراستنی ئەو هێزەیش هەمیشە ئوخمی (بەرکار) لەگەڵ خۆیاندا هەڵدەگرن.

ئەگەر لە سەرچاوەی چاوگەوە بە شوێن قەدی کرداردا بچین، دەبینین: هەر چاوگێك (تێپەڕ بێ یان تێنەپەڕ بێ) بێ ئەوەی - هیچ بیژۆکێك هەبێ - کە (ن) ی چاوگ لێی بقرتێ، ئەوەی دەمێنێتەوە (قەد) ە [٥٩]، بۆ نموونە:

| | | | |
|---|---|---|---|
| تێنەپەڕیی | وەستان<br>فڕین<br>چوون<br>مردن<br>هاتن | ن < Ø | وەستا<br>فڕی<br>چوو<br>مرد<br>هات |

(٥٦) شوان باراوی، بنەمای کردار، گۆڤاری "پەیڤین"، سلێمانی، ژ٣، ئابی ١٩٩٨، ل:١٧.

(٥٧) بۆ بنەمای کاتی ڕانەبوردووش (ڕەگ) بە کار دێت، "فەرمانەکە دەخرێتە سەر کاتی داهاتوو و (دە) ی ئامرازی هەمیشەیی و ڕاناوی لکاو لادەبرێت، ئەوەی دەمێنێتەوە ڕەگی داهاتووی فەرمانەکەیە.." (بڕوانە: وریا عمر ئەمین، نیشانەکانی کات لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری (کاروان)، هەولێر، ژ٩٢، ١٩٩١، ل: ٨٨.

(٥٨) ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بە پێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی، بەغدا، ١٩٧٦، ل: ١٠٤.

(٥٩) قەدی کردار لە زمانی کوردیدا جگە لەوەی بنەمای هەموو جۆرە ڕابوردوویێکی (نزیك، بەردەوام، تەواو، دوور) ی ڕێژەی ئیخباری و ئینشائییە، کەرەستەی پێکهێنانی ناوی کارا و ناوی بەرکار و ناوی چاوگ و ناوی جێگایشە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| تێپەڕیی | هێنان<br>کڕین<br>دروون<br>بردن<br>ڕشتن | ن < Ø | هێنا<br>کڕی<br>دروو<br>برد<br>ڕشت |

ئەوەی پتر جێ مەبەستی ئێمە بێت تەنیا ئەو (قەد) انەن، کە لـە چاوگی (یانی) تێپەڕەوە وەردەگیرێن، وەک:

| | | | |
|---|---|---|---|
| چاوگ | نووسین<br>بڕین<br>سوین[٦٠]<br>پۆشین<br>چنین<br>دزین<br>گۆڕین | ن < Ø | نووسی<br>بڕی<br>سوی<br>پۆشی<br>چنی<br>دزی<br>گۆڕی |

نیشانەی (ی) لە وشەکانی (نووسی، بڕی، سوی، پۆشی، چنی، دزی، گۆڕی..)، سەرەڕای ڕۆڵی کاتی (ڕابوردوویی)؛ ئەرکی (تێپەڕیی) یشی لـە ئەستۆ گرتووە. کەواتـە لەم تەرزە قەدانەدا (ی) خاوەنی دوو ئەرکی ڕێزمانییە[٦١]، بەم شێوەیە:

(٦٠) (سوون) یش بەکاردێت.

(٦١) سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشین، کە تا ئێستا کەس لە ڕێزماننووسانی کورد، ئاماژەی بۆ ئەم ڕۆڵی (ی) یە نەکردووە.




ئەرکی یەکەم ئەرکێکی بنجییە، کەچی ئەرکی دووەم جگە لە ئەرکی ناوبراو، ڕۆڵێکی ئیزافیش دەبینێ ئەمیش (تێپەڕیی) یە و بە خاڵێکی بنەڕەتیش دادەنرێ بۆ جیا کردنەوەیان لەگەڵ بنەمای کاتی ڕابوردووی چاوگە تێنەپەڕەکاندا، بە وێنە:

| چاوگ | وەڕین<br>بەزین<br>فڕین<br>خشین | ن < Ø | بنەمای<br>کاتی ڕابوردوو | وەڕی<br>بەزی<br>فڕی<br>خشی |
|---|---|---|---|---|

.. هتد

(ی) [٦٢] لە وشەکانی (وەڕی، بەزی، فڕی، خشی..) تەنیا وەك نیشانە، دەورێکی بنەڕەتیی (بنجیی) دەبینێ، کە بریتییە لە ئاشکرا کردنی کاتی ڕابوردووی بنەماکە، بەم شێوازە:

(٦٢) "ئەو دانە ڕێزمانییەی کاتی فەرمانەکەی لە داهاتووەوە کرد بە ڕابردوو (ی) یە. ئەمە ئەوە دەسەلمێنێ کە ئەم (ی) یە مۆرفێمێکە و نیشانەی کاتی ڕابووردووە". (بڕوانە: وریا عومەر ئەمین، نیشانەکانی کات لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری "کاروان"، هەولێر، ژ ٩٢، ١٩٩١، ل: ٨٩).




لە بنەمای کاتی ڕابوردوو (قەد) ی چاوگی (یائی) ی تێنەپەڕەکاندا، (ی) یەك دەوری بنجیی هەیە، واتە ڕۆلی ئیزافیی وەرناگرێت، بۆیە وەك مۆرفێمی (ی) ی قەدی چاوگی (یائی) ی تێپەڕەکان ناچێتە ناو قالبی وشەگۆڕ یان وشەدارێژەوە.

## ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە

لە تێروانینی سەرەڕۆییدا ڕەنگە هەر ئەوەندە بێتە بەرچاو، کە (ی) دەنگێکی بزوێن یان نیمچە بزوێن بێ و هیچی دی.. خۆ بێتو لەو نیگایەشەوە وردبینەوە کە دانەکانی زمان و پێوەندی زمان و ئەرکی زمان - واتا ئەو سێ دەستە خاسیەتانەی لە توێژینەوەی سیستەمی زمان و پێکهاتی ڕووی ناوەوەیدا بۆ دەست نیشان کردنی دەستوور و یاساکانی زمانەوانی بەکاردەهێنرێن، ئەڵبەتە گەلێ دیاردەی هەمە چەشنەمان بۆ ئاشکرا دەبێ. ئەوەتە بە گوێرەی چوونە نێو جەرگەو قووڵاییی (ی) لەبواری سینتاکسەوە، گەیشتینە ئەو ئەنجامەی، لە زمانی کوردیدا وەك (٦) مۆرفێمی جودا خۆی دەنوێنێ کە هاریکاری سازدانی ڕستە دەکەن:

١- مۆرفێمی (ی) ی نیشانەی ئیزافە:

مۆرفێمی (ی) ی وەك نیشانەی ئیزافە لە هەردوو دیالێکتی کرمانجیی خواروو و ژووروی زمانی کوردیدا بۆ زایەندی نێر بەکاردێت.

٢- مۆرفێمی (ی) ی نیشانەی زایەندی نێری دۆخی تیان:

مۆرفێمی ناوبراو لە سەرانسەری دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و لە بەشە دیالێکتی موکری و سۆران.. دەچێتە سەر ناوی ڕایەندی نێر و لە ڕایەندی مێی جیا دەکاتەوە.. ئەم نێزیکی (ی) ی نیشانەی ڕایەندی نێرە لە دیالێکتەکانی زمانی کوردیدا، دەتواندرێ بەیەکێك لەو بەڵگەزانستییانە دابندرێ، کە نیشانی یەکێتیی زمانی کوردی دەدەن.

٣- مۆرفێمی (ی) ی فۆرمی جێناوی لکاوی کەسی دووەمی تاکی دەستەی دووەم:

بەگوێرەی هەندێ بەڵگەی مێژوویی و ئەدەبی، (ی) لە دیالێکتی کرمانجیی خواروو و ژووروی زمانی کوردیدا، فۆرمی جێناوی لکاوی کەسی دووەمی تاکی دەستەی دووەمە. جێناوێکی بێ هێزە و لە ڕابوردووی تێنەپەڕدا دەردەکەوێ و بە دوا ڕانەبوردووی تێپەڕ و تێنەپەڕیشدا دێت.

٤- مۆرفێمی (ی) ی جێناوی لکاو بۆ کەسی سێیەمی تاکی دەستەی یەکەم:

ئەم مۆرفێمە وەك فۆرمی جێناوی لکاو بۆ کەسیی سێیەمی تاکی دەستەی یەکەم، لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووا بەرچاو دەکەوێ. ئەم جێناوە ئەگەرچی بە شێوەیەکی سەرەکیی دەچێتە سەر کرداری ڕابوردووی تێپەڕ؛ بەڵام بە زۆر بەشە ئاخاوتنی تریشەوە دەلکێ. بۆ نموونە: دەچێتە سەر ناو؛ ئاوەڵناو؛ جێناو.. بە وێنە: جێناوی کەسی جودا و جێناوی خۆیی و جێناوی نیشانە و جێناوی پرس و جێناوی نەفی.. ئاوەڵکردار، بۆ نموونە: ئاوەلکرداری شوێن و کات و وەسفی.. ؛ ژمارە.. گەلێکی تر.

٥- مۆرفێمی (ی) ی کۆتاییی جێناوی کەسیی جودا لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا:

ئەم مۆرفێمە لە کەسیی سێیەمی تاك بۆ ڕایەندی نێر نیە (ئەوی/ وی) بەکاردێت، کە ئەم (ی) یەش دەست نیشان کردنی ڕایەندی (نێر) ە لە دۆخی تیاندا.

٦- مۆرفێمی (ی) وەك نیشانەی تێپەڕیی لەقەد (بنەمای کاتی ڕابوردوو) ی چاوگی (یائی) دا:

ئەم مۆرفێمە لە هەردوو دیالێکتی کرمانجیی خواروو و ژووروودا، لە قەدی چاوگە (یائی) یەکاندا، جگە لە دەوری ڕابوردوویی ئەرکی تێپەڕیش دەبینێ، واتە مۆرفێمی ناوبراو لە یەك کاتدا خاوەنی دوو ئەرکی ڕێزمانییە.

٧- زۆربەی مۆرفێمەکانی (ی) ی سینتاکس: ((ی) ی نیشانەی زایەندی نێر لە دۆخی تیان، (ی) ی فۆرمی جێناوی کەسیی دووەمی تاکی دەستەی دووەم، (ی) ی نیشانەی تێپەڕیی لە بنەمای کاتی ڕابوردووی چاوگی (یائی)، (ی) ی نیشانە ئیزافە..) لە هەردوو دیالێکتی سەرەکیی زمانی کوردیدا بەتەواوی یەك دەگرنەوە و وەك یەکن.

٨- مۆرفێمی (ی) هەیە لە کرمانجیی خوارووا بەدەردەکەوێت و بەکاردێت، بە وێنە:

(ی) ی جێناوی لکاوی کەسیی سێیەمی تاکی دەستەی یەکەم، لە کرمانجیی ژووروودا نیە، بە پێچەوانەشەوە مۆرفێمی (ی) ی کۆتایی جێناوی کەسیی جودای زایەندی نێر، لە کرمانجیی ژووروودا دەبیندرێت، لە کرمانجیی خوارووا بەدی ناکرێت.

## سەرچاوەی نموونەکان

١- (ئەدەب)

دیوانی ئەدەب، یادگاری عبداللە بەگی مصباح الدیوان، چاپی سێیەمین، چاپخانەی هەولێر، هەولێر، ١٩٦٦.

٢- (ئەفسانە)

ئەفسانەی کوردی، ئامادەکردنی: م. ب رودێنکۆ، وەرگێڕانی عەزیز گەردی، چاپخانەی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٠.

٣- (ئەلف و بێی کوردی)

ئەلف و بێی نوێ بۆ پۆلی یەکەمی سەرەتایی، ئیبراهیم ئەمین باڵدار، چاپی سێیەم، چاپخانەی دار القاضی، بەغدا، ١٩٩٨.

٤- (بێکەس)

دیوانی بێکەس، محەمەدی ملا کەریم ڕێکی خستووە و سەرپەرشتیی لە چاپدانی کردووە، بەغدا، ١٩٧٠.

٥- (پەندی پێشینان)

پەندی پێشینان، کۆکردنەوەی شێخ محەمەدی خاڵ، چاپی دووەم، ١٩٧١.

٦- (پیرەمێرد)

پیرەمێردی نەمر، محەمەد ڕەسووڵ هاوار، بەغدا، ١٩٧٠.

٧- (تەنیایی)

شێرزاد حەسەن، تەنیایی، چیرۆك، بەغدا، ١٩٨٣.

٨- (تحفەی مظفریە، ب١)

ئۆسکارمان، تحفەی مظفریە، بەرلین ١٩٠٥. پێشەکی و ساخکردنەوە و هێنانە سەر ڕێنووسی کوردی هێمن موکریانی، بەشی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٥.

٩- (تحفەی مظفریە، ب٢)

ئۆسکارمان، تحفەی مظفریە، بەرلین ١٩٠٥. پێشەکی و ساخکردنەوە و هێنانە سەر ڕێنووسی کوردی هێمن موکریانی، بەشی دووەم، بەغدا، ١٩٧٥.

١٠- (تلماسکە شیعر)

تیلماسکە شیعر، قوبادی جەلی زادە، ڕۆژنامەی "هاوکاری"، بەغدا، ژمارە ٨٨٩، ٣٠/ ٤/ ١٩٨٧.

١١- (جزیری)

دیوانا مەلایێ جزیری، تویژاندنا سادق بەهائەددین ئامێدی، بەغدا، ١٩٧٧.

١٢- (جگەرخوێن)

جگەر خوێن، سەورا ئازادی، شام، ١٩٥٤.

١٣- (خانی)

ئەحمەدی خانی، مەم و زین، ئەستەموول، ١٩٦٠، م. بۆز ئەرسەلان لە چاپی داوە.

١٤- (دیلان)

محەممەد ساڵح دیلان، دیوانی شیعری، ئامادەکردن و لێکۆڵینەوە و پێشـەکی و پـەراوێز نووسینی عەبدوڵڵا عەزیز خالید، بەغدا، ١٩٨٧.

١٥- (زێوەر)

دیوانی زێوەر، بەغدا، ١٩٨٥.

١٦- (صەبری)

عوسمان صەبری، باهۆز و چەند نڤیسارێن دن، شام، ١٩٥٦.

١٧- (شەونامە)

عبدالله پەشێو، شەونامەی شاعیرێکی تینوو، هۆنراوە، چاپی یەکەم، سەبیدیان، ١٩٧٢.

١٨- (شێخ ڕەزا)

دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی، ساغ کردنەوە و شەرحی شوکر مستەفا، هەولێر، ٢٠٠٠.

١٩- (فۆلکلۆر)

فۆلکلۆری هۆنراوەکانی کوردەواری، کۆکردنەوەی محەممەد کەریم شەریف، کەرکووک، ١٩٧٤.

٢٠- (کوردۆ)

کۆمەڵە تێکسـتی فۆلکـۆری کـوردی، پرۆفیسـۆر قـەناتی کـوردۆ لـە زاری کوردەکـانی سـۆڤێتەوە تۆماری کردووە، شوکور مستەفا و ئەنوەر قادر هێناویانەتە سەر ڕێنووسی کوردی، بەغدا، ١٩٧٦.

٢١- (گۆران، س)

سـەرجەمی بەرهـەمی گـۆران، بـەرگی یەکـەم، دیوانـــی گــۆران، محەممـەدی مـەلا کـەریم کـۆی کردووەتەوە و ئامادەی کردووە و پێشەکی و پەراوێزی بۆ نووسیوە، بەغدا، ١٩٨٠.

٢٢- (مەحوی)

دیوانی مەحوی، لێکدانـەوە و لێکۆڵینـەوەی مـەلا عبدالکریمـی مـدرس و محەممـەدی مـەلا کـەریم، بەغدا، ١٩٧٧.

٢٣- (مەمێ ئالان)

مەمێ ئالان، چیرۆك نقیس كۆی كردووەتەوە و پێشەكیی بۆ نووسیوە. سالح عەلی گوللی و ئەنوەر قادر محەممەد لە ڕێنووسی لاتینییەوە هێناویانەتە سەر ڕێنووسی كوردی، بەغدا، ١٩٧٧.

٢٤. (نیگار)

فەرهاد شاكەلی، نیگاری تۆ لە دیواری زیندانەكەم هەڵدەكۆڵم، چاپی یەكەم، ستۆكهۆڵم، ١٩٩٤.

٢٥. (هێمن)

تاریك و ڕوون، لە بڵاوكراوەكانی بنكەی پێشەوا، ١٩٧٤.

**سەرچاوەكان**

**بە زمانی كوردیی**


(١) ئەحمەد حەسەن ئەحمەد، ڕێزمانی كوردی (بە كوردی و عەرەبی)، بەرگی یەكەم، چاپخانەی دار الجاحظ، بەغدا، ١٩٧٦.

(٢) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، وشەڕۆنان لە زمانی كوردیدا، چاپخانەی كۆڕی زانیاری كورد، بەغدا، ١٩٧٧.

(٣) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی كوردی، بەرگی یەكەم (مۆرفۆلۆژی)، بەشی یەكەم - ناو - چاپخانەی كۆڕی زانیاری كورد، بەغدا، ١٩٧٩.

(٤) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی كوردی، بەرگی یەكەم (وشەسازی)، بەشی دووەم - جێناو، چاپخانەی دار الحرية، بەغدا، ١٩٧٩.

(٥) تۆفیق وەهبی، دەستووری زمانی كوردی، جیزمی یەكەم، چاپخانەی دار الطباعة الحديثة، بەغدا، ١٩٢٩.

(٦) ڕێزمانی ئاخاوتنی كوردی بە پێی لێكۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەكانی، چاپخانەی كۆڕی زانیاری كورد، بەغدا، ١٩٧٦.

(٧) سادق بەهائەددین ئامێدی، ڕێزمانا كوردی (كرمانجی یا ژۆری و ژێری یا هەقبەكری)، چاپا یەكێ، چاپخانەی دار الشؤون الثقافية العامة، بەغدا ، ١٩٨٧.

(٨) سەعید صدقی كابان، مختصر صرف و نحو كوردی، چاپخانەی النجاح، بەغدا، ١٩٢٨.

(٩) شوان باراوی، بنەمای كردار، گۆڤاری ((پەیڤین))، سلێمانی، ژ٣، ئابی ١٩٩٨، ل: ١٧- ٤٣.

(١٠) عەبدولوەهاب خالید، تیشانێد تێرومێ - تێزافە. لە دیالێكتا كرمانجیا ژووری، ڕۆژنامەی "هاوكاری"، بەغدا، ژ ٩٢٤، ١٩/١١/١٩٨٧.

(١١) د. كوردستان موكریانی، سینتاكسی ڕستەی سادە لە زمانی كوردیدا، چاپخانەی دار الحرية

للطباعة، بەغدا، ١٩٨٦.

(١٢) ک. ک. کوردۆییف، ڕێزمانی کوردی بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجی و سۆرانی، د. کوردستان موکریانی لە زمانی ڕووسییەوە وەریگێڕاوەتەوە سەر زمانی کوردی، لە بڵاوکراوەکانی ئەمینداریەتی گشتیی ڕۆشنبیری و لاوان، چاپخانەی الادیب البغدادیة، بەغدا، ١٩٨٤.

(١٣) لیژنەی زمانی کوردی، بەراوردکاری لە نێوان زارە کوردییەکاندا، گۆڤاری "کۆڕی زانیاری عێراق - دەستەی کورد"، بەغدا، ب١٠، ١٩٨٣، ل ٢٧٧ - ٣٣٧.

(١٤) محەمەد تاهر گوهەرزی، ڕێزمانی کوردی - زاریٚ کرمانجی - چاپا ئێکێ، چاپخانەی خەبات، دهۆک، ١٩٩٩.

(١٥) مەسعوود محەمەد، بەکارهێنانی (ی) لە ڕێزمانی کوردیدا، گۆڤاری "کۆڕی زانیاری کورد"، بەغدا، ب١، بەشی ١، ١٩٧٣، ل: ٣٩ - ١٠٢.

(١٦) مەسعوود محەمەد، سووڕێکی خامە بە دەوری (ڕاناو) دا، گۆڤاری "کۆڕی زانیاری کورد"، بەغدا، ب٢، ژ١، ١٩٧٤، ل: ٩ - ١٤٧.

(١٧) نووری عەلی ئەمین، قواعدی زمانی کوردی لە (صرف و نحو) دا، بەرگی دووەم، چاپخانەی مەعاریف، بەغدا، ١٩٥٨.

(١٨) نووری عەلی ئەمین، ڕێزمانی کوردی، چاپخانەی کامەران، سلێمانی، ١٩٦٠.

(١٩) د. نەسرین فەخری و د. کوردستان موکریانی، ڕێزمانی کوردی بۆ پۆلی یەکەمی بەشی کوردی کۆلێجی ئاداب، زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ١٩٨٢.

(٢٠) د. وریا عومەر ئەمین، لایەنێکی جیاوازی، گۆڤاری "کۆڕی زانیاری عێراق - دەستەی کورد"، ب ١٠، بەغدا، ١٩٨٣.

(٢١) وریا عومەر ئەمین، ڕێزمانی ڕاناوی لکاو، چاپخانەی دار الجماهیر للصحافە، بەغدا، ١٩٨٦.

(٢٢) وریا عومەر ئەمین، نیشانەکانی کات لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری "کاروان"، هەولێر، ژ ٩٢، ساڵی نۆیەم، ١٩٩١، ل: ٨٨ - ٩٢.

### نامەی ماجستێر

(٢٣) حاتەم ولیا محەمەد، فرێزی ناوی و فرێزی کاری لە کرمانجیی ژووروودا، کۆلێجی زمان، زانکۆی سلێمانی، ٢٠٠٠.

(٢٤) لەیلا جەلیل عەبباس دەلۆ، مۆرفیمەکانی (یٚ) لە زمانی کوردیدا، بە کەرەستەی کرمانجیی خواروو و ژووروو، کۆلێجی پەروەردە - ئیبن ڕوشد - زانکۆی بەغدا، ١٩٩٨.

**به زمانی فارسی**

(٢٥) دکتر پرويز ناتل خانلری، دستور زبان فارسی، چاپ شانزدهم، انتشارات تـوس، چاپخانـه‌ی ازاده، تهران، ١٣٧٧.

(٢٦) حسن انزلی، دستور زبان فارسی، چاپ اول، ناشر انتشارات انزلی، چاپ دیبا، ارومیه، ١٣٦٦.

(٢٧) ذو النور، دستوری پارسی در صرف و نحو و املای فارسی تهران، ١٣٤٣.

(٢٨) دکتر محمود شفیعی، شاهنامه و دستور یا دستور زبان فارسی بر پایه‌ءشاهنامه‌ء فردوسـی، چـاپ دووەم، ناشـر مؤسسـة انتشـارات و چـاپ دانشـگاه تـهران، چـاپ و صحـاف چاپخانـه و مؤسسـة انتشارات و چاپ دانیشگاه تهران، ١٣٧٧/ ١٩٩٨.

**به زمانی عەرەبیی**

(٢٩) د. نوزاد حسن احمد، المنهج الوصفـي في كتابـة سـيبويه، ط ١، منشـورات جامعـه قـاريونس، بنغازي، ١٩٩٦.

**رسالة الماجستير**

(٣٠) اشواق محمد أسماعيل النجار، دلالة اللواصق التصريفية في اللغة العربية، جامعـة صـلاح الديـن، كلية الاداب، اربيل، ٢٠٠٠.

**به زمانی ئینگلیزیی**

(31) D. N. Mackenzie, Kurdish Dialectstudies, London, 1957.

## ملخص البحث

أزاد أحمد محمود

### مورفيمات (ي) المحولة لوظيفة الكلمة في المستوى النحوي

تناول البحث أثر مورفيمات (ي) لوظيفة الكلمة ودورها في المستوى النحوي وذلك في ست وظائف تشترك في إعداد الجملة تبعاً للانسجام والحاجة وأسلوب الاستعمال، مثل:

١- مورفيم (ي) علامة للإضافة.

٢- مورفيم (ي) ضميراً متصلاً مفرداً للشخص الثاني في المجموعة الثانية.

٣- مورفيم (ي) ضميراً متصلاً مفرداً للشخص الثالث في المجموعة الأولى.

٤- مورفيم (ي) في نهاية الضمير للشخص الثالث المنفصل في اللهجة الكرمانجية الشمالية.

٥- مورفيم (ي) علامة للمذكر.

٦- مورفيم (ي) في مصادر الأفعال اليائية كعلامة للمتعدي في الفعل الماضي.

## *Abstract*
## *Syntax and the Morphemes ( ی )*

*Azad Ahmed Mahmood*

Includes (ی) morphemes that work on the syntactic level. This appears in six axes helping to form different types of sentences, due to agreement, necessity and style such as;

1. (ی) , the izafa marker.
2. (ی) , the 2 nd personal pronominals, group B.
3. (ی) , the third personal pronoun, group A.
4. (ی), the final of the independent personal pronouns in Northern Kirmanji.
5. (ی) , as marker of masculine gender in the dative case.
6. (ی) as the transitive marker in the past tense or in the root of infinitive which end in /- î ; /.

# ڕێنووسی یەکگرتووی کوردی

ئامادەکردنی: ئەندامی کارای کۆڕ
**بەدران ئەحمەد حەبیب**
پێداچوونەوە و پەسندکردنی: ئەنجوومەنی کۆڕ

**پێشەکی:**

ئەنجوومەنی کۆڕی زانیاری کوردستان لە یەکێک لە کۆبوونەوەکانیدا پرۆژەیەکی هاتە پێش کە بریتی بوو لە دۆزینەوەی چارەسەرێک بۆ گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردی بەئەلفوبێی عەرەبی. هەر لەو کۆبوونەوەیەدا، ئەنجوومەنی کۆڕ، ئەندامی کارا (بەدران ئەحمەد حەبیب) ی ڕاسپارد بۆ ئامادەکردنی ڕاپۆرتێک لە بارەی گیروگرفتە سەرەکی و بەرچاوەکانی ڕێنووسی کوردی و پێشنیازکردنی چارەسەر بۆ ئەو گیروگرفتانە، بۆ ئەوەی لە کۆبوونەوەکانی داهاتوودا تێکڕای ئەندامانی ئەنجوومەن (وەک لیژنەی ڕێنووس) بەشداری لە گفتوگۆ و پەسندکردنی ئەو پرۆژەیەدا بکەن، لە هەردوو کۆبوونەوەی ڕۆژانی هەینی ڕێکەوتی ٤ ئایار ٢٠٠١ و شەممە ١٢ ئایار ٢٠٠١ بۆ ماوەی نزیکەی ١٤ سەعات گفتوگۆیەکی تێروتەسەل لەسەر پرۆژەکە کرا و. ئەوەی لێرەدا دەخرێتە ڕوو بریتییە لە ڕێنووسی پەسندکراوی کۆڕی زانیاری کوردستان.

**هۆی بەپێویست بوونی ڕێنووسی یەکگرتوو:**

لەو هەموو ئەو ئەلفوبێ جۆراوجۆرانەی لە دنیا بەکاردێن و لە ڕێنووسی هەموو زمانەکاندا، گیروگرفت هەن. هۆی سەرەکی لەم کێشە و گیروگرفتانەدا بەپلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ پێ ڕانەگەیشتنی شێوەی پیتەکان بەدەنگەکان و، ناتەبایی ڕێنووس بۆ دەربڕین. ئەم کێشەیە لە هەموو ڕێنووس و زمانەکاندا هەیە بەڵام لە هەموویاندا چارەسەر دۆزراوەتەوە (ئەگەر نیوەچڵیش بێ لە هەندێک باردا) و هەموولا ڕێک کەوتوون کە چۆن بنووسن.

سەرنج دەدرێ، لە ڕێنووسی کوردی بەئەلفوبێی عەرەبی (هەروەها بەئەلفوبێی لاتینیشدا) گیروگرفتەکان بێ چارەسەر ماون. زۆرجار چارەسەری تاکە کەسی لەلایەن زانایان و شارەزایان و، هەندێك جاریش چارەسەری بەکۆمەڵ لەلایەن داوودەزگا پێوەندارەکانەوە پێشکێش کراون (کە لێرەدا دەرفەتی ئاماژە پێدانیان نییە) بەڵام یەکگرتنیان لەسەر نەکراوە یان پشتگوێ خراون. ئێمە لە گەڵاڵەکردنی ئەم پرۆژەیە و، گفتوگۆکانی ئەنجوومەنی کۆڕدا سوودمان لە هەوڵەکانی پێشوو وەرگرتووە و، ئەوەی دەخرێتە ڕوو هەنگاوێکە لە دوای هەنگاوەکانی ئەوانەوە.

ئەمڕۆ لە کوردستاندا نووسین بەزمانی کوردی زۆر پەرەی سەندووە، بەتایبەتی لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا، خوێندنی هەموو قۆناغەکان (١٢ ساڵ) بەزمانی کوردییە. نووسینی داوودەزگاکانی حکوومەت بەکوردین. ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەوانی و چاپی کتێب زۆر فرەوان بوونە، لە دەرەوەی کوردستانیش زۆر داوودەزگای خوێندن و ڕووناکبیری دامەزراون بەڵام ڕێنووسی یەکگرتوو لە کایەدا نییە. تەنانەت لە سەرنجدانێکی سەرپێیی و بەپەلەش بەبڵاوکراوەکاندا هەست بەم پەشێوی و کەس بەکەس نەبوونە دەکرێت. ئەمە کارێکی نالەباری کردووەتە سەر تەواوی بزووتنەوەی خوێندەواری و ڕووناکبیری، بەتایبەتیش لە قوتابخانەکاندا کە قوتابی هەست بەسەر لێ شێوان دەکات، هەروەها خوێنەری بڵاوکراوەکانیش ئەم جیاوازییەیان بەرچاو دەکەوێ.

ڕێنووسی یەکگرتوو بنچینەی یەکەمی خوێندەوارییە، هەر هیچ نەبێ دەبێ لەمەدا یەکگرتووبین، مەرجیش نییە چارەسەرەکان بێ گرێ و کەموکورتی بن، گرینگ یەکگرتنە. ئەوەی کۆڕی زانیاری کوردستان لەم بوارەدا پێشکێشی دەکات هەنگاوێکە بەم ڕێگەیەدا و، داوا لە زانایان و پسپۆڕان دەکات بۆ ئەوەی بیر و سەرنجی خۆیانی لە بارەوە دەربڕن، لە ئەنجامدا هەموومان دەگەین بەچارەسەرێکی یەکگرتوو و، ئەم گیروگرفتە سەرەتاییە لە کۆڵ دەکەینەوە کە گیروگرفتی هەرکەسێکە دەست بداتە قەڵەم و بنووسێ.

**ئەم پرۆژەیە:**

ئەو هەنگاوانەی هەتا ئەمڕۆ بەڕێگەی چارەسەری گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردیدا هاوێژراون کەموکورتییەکی بەرچاویان ئەوەبووە کە لەسەر بنچینەی یەك دیالەکت (کرمانجی خواروو) و یەك ئەلفوبێ (ئەلفوبێی عەرەبی) داڕێژراون. ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی زۆر لە گیروگرفتەکان بەدروستی نەبینرێن و، لەسەر ئەم بنەوبنیەش چارەسەرەکانیان دروست نەبێ؛

ئێمە لە گەڵاڵەکردنی ئەم پرۆژەیەدا هەوڵمان داوە (وەك هەنگاوی یەکەم) هەردوو زاراوی سەروو و خواروی کرمانجی لەبەر یەك بگرین لە دۆزینەوەی چارەسەری کێشەکاندا و، هەردوو ئەلفوبێی کوردی (بەعەرەبی و لاتینی) ڕەچاو بکەین. ئەمەش یارمەتیی داوین بۆ یەکلاکردنەوەی هەندێك کێشە، بۆ نموونە:

یەکەم: هەندێك لە نووسەران پێیان وا بووە کە وشەی (شوان، لوا..) دەبێ بە (و)ی درێژ (وو:û ) بنووسرێن. واتە (شووان: Şûwan) (لووا: Lûwa) بەهەمان شێوەش لە بڕێتی (توانا، ڕوا، کوا..) دەنووسن (تووانا، ڕووا، کووا..). لە ڕستیدا ئەگەر دوو وشەی یەکەم و دووەم (واتە: شوان و لوا) بەکرمانجیی سەروو و ئەلفوبێی لاتینی بنووسینەوە کە (شڤان و لڤا) ن، دەبینین یەك دەنگی (ڤ) دەچێتە جێگەی (و) و، دەبن بە (Liva, Şivan) ئەمەش بەڵگەیەکی بنەبڕە بۆ ئەوەی تێ بگەین یەك (و)ە و ئەویش (و:W) ی کۆنسۆنانتە. هەمان بنکشمان لە نووسینی (و) ی سەرەتایی وشەدا ڕەچاو کرد لەبەر ئەوەی وشەکانی: (وشە، وڵات، وریا، ون) بەتەنیا یەك (و) دەست پێ دەکەن و بزوێنی فرە کورتی (i) یان بەدوادادێت لە ئەلفوبێی لاتینیدا، واتە دەبن بە: Wişe, Wilat, Wirya, Win

دووەم: گیروگرفتێکی زلی ڕێنووسی کوردی بەئەلفوبێی عەرەبی ئەوەیە کە بۆ هەردوو پیتی (Y) وە (Î) ی لاتینی تەنیا یەك نیشانەی پیت هەیە کە ئەویش (ی)ە نەبوونی ئەم جیاوازییە سەری لە نووسەرانیش شێواندووە نەك تەنیا هەر خوێنەران. بۆیە لە کاتی بەدوای یەکتردا هاتنی (Y) و (Î) دا کە لە ئەلفوبێی عەرەبیدا هەردووکیان

هەر (ی) ن، گیروگرفت دروست دەبێ بۆ نموونە کە دەنووسرێ: (زەوییەکە Zewîeke) زۆر کەس هەر بە(زەویەکە) ی دەنووسن وە پێیان وایە کە نووسینی دوو (یـ) بەسەریەکەوە کرێت و زیادەیە. لەوەش گەڕێ کە دەنووسرێ (شاییەکە) کە لە (شایی)یەوە هاتووە و نووسینی سێ جار (یـ) چەند زیادە و کرێت دێتە بەرچاویان. ئەمە تەنیا لە کاتی نووسینی کوردی بەئەلفوبێی لاتینیدا دانی پێدا دەنرێ کە دەبینرێ ناچارییە و هەر دەبێ (yîy) بەنووسین واتە: دەبێ بە: (Şayîyke). لەم بارەدا دەبینین هیچ زیادەیی و دزێوییەك نییە بگرە زۆر پێویستە هەر سێ دەنگ (ی) بەدوای یەکتردا بێن.

ئەوە مایەوە بڵێین کەوا ئەو گیروگرفتانەی لەم پرۆژەیەدا بەرچاو خراون و چارەسەریان بۆ دۆزراوەتەوە، هەموو گیرگرفتەکانی ڕێنووسی کوردی نین. وەك لەسەرەتا ئاماژەمان پێ دا ئەمانە گیروگرفتە سەرەکی و بەرچاوەکانن. ئەوانیتر دەمینێن بۆ پرۆژەیەکی داهاتوو.

داوا لە داوودەزگا ڕۆشنبیرییەکان و وەزارەتی پەروەردە و دەزگایەکانی ڕاگەیاندن دەکەین کە ئەم ڕێسا و بنکانەی لێرەدا بەرچاو خراون، بەکار بێنن. وەك گوتمان سەرەتای خوێندەواری ڕێنووسی یەکگرتووە. هەموو شتێکیش لە یەکگرتنەوە دەست پێ دەکات.

***

**یەکەم:** گیروگرفتی پیتی (و)

نیشانەی (و) لە زمانی کوردیدا بەم شێوەی خوارەوە دەنووسرێ:

١-پیتی (و) ی کورت، واتە (و) ی بزوێنی کورت (و: u)

بۆ نموونە: کورد. کورت. کوشت.

Kurd. Kurt. Kuşt

٢-پیتی (وو) ی درێژ، واتە (وو) ی بزوێنی درێژ (وو: û )

بۆ نموونە: سوور. چوو. دوو.

Sûr, Çû, Dû

٣–پیتی (و) ی كۆنسۆنانت (نەبزوێن). واتە (و: W)

بۆ نموونە: ئاوایی، وەرە، هاوار، ئاو

دەنگی (و) لێرەدا هەندێك جار لە زاراوی كرمانجیی سەروودا دەبێ بەدەنگی (ڤ)

Awayî (Avahî). Were. Hawar. Av

٤–پیتی (ۆ)ی كراوە. واتە (ۆ: O)

بۆ نموونە: دۆڵ، گۆڕ، نۆ.

Dol. Gor. No

**دووەم: گیروگرفتی پیتی (و)ی سەرەتای وشە**

هەر وشەیەك بەپیتی (و) دەست پێ بكات بە یەك (و) دەنووسرێت.

بۆ نموونە: وریا، وڵات، وشە، وِرد.

Wirya. Wilat. Wişe. Wird.

**سێیەم: گیروگرفتی پیتی (ی)**

نیشانەی (ی) لە زمانی كوردیدا بەشێوەی خوارەوەیە:

١–پیتی (ی) ی بزوێن، واتە (ی: î).

بۆ نموونە: زەوی – Zewî

٢–پیتی (ی) ی كۆنسۆنانت، واتە (ی: Y)

بۆ نموونە: یار– yar

– سەرنج ١: پیتێكی (ی) ی بزوێنی فرە كورت هەیە كە لە نووسینی كوردی بە ئەلفوبێی لاتینیدا نیشانەی (i) ی بۆ دانراوە وەك لە وشەكانی: مِن – Min، كِن –Kin، ژِن – jin. ئەم نیشانەیە لە نووسینی كوردی بە ئەلفوبێی عەرەبیدا نییە.

– سەرنج ٢: نیشانەكانی (ی) ی بزوێن و (ی) كۆنسۆنانت واتە ( î ) و ( y) لە پیتی عەرەبیدا هەردووكیان هەمان نیشانەی (ی) یان هەیە بەڵام لە ڕاستیدا لە یەكتر جیاوازن و لە كاتی بە دوای یەكتر هاتنیاندا دەبێ هەردووكیان بنووسرێن.

وەك: نییە، چییە، دیارییەکە، زەوییەکە،

Nîye. Çîye. Dîyarîyeke. Zewîı yeke

- سەرنج ۴: لە کاتی هاتنی سێ پیتی (ی) بەدوای یەکتردا وەك لە وشەکانی (ئاواییەکەمان..) (کۆتاییەکەی..) (وەستاییەکی..) (کۆتاییی بە کارەکە هێنا) دەبێ بەسەر یەکەوە بنووسرێن، واتە سێ (ی) بە شێوەی (ییی) بەدوای یەکتردا دێن.

(Westayîyekî..) (Kotayîy be Kareke hêna)

**چوارەم:** گیروگرفتی پیتی (ر) ی گران، واتە (ڕ) ی نیشانەدار

ئەم پیتە لە هەر کوێیەکی وشەدا هات دەبێ بەنیشانەکەیەوە بنووسرێت، واتە لە سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتایی وشەدا هەر (ڕ) ی گرانی نیشانەدارە،

وەك: ڕۆژ، بڕیار، کەڕ.

**پێنجەم:** گیروگرفتی پیتی (و) ی بەیەکەوەبەستن (عطف)

پیتی (و) ی بەیەکەوەبەستن، بەشێوەیەکی جیاواز لە وشەی پێش خۆی و پاش خۆیەوە دەنووسرێت و مامەڵەیەکی سەربەخۆی لەگەڵدا دەکرێت،

بۆ نموونە: من و تۆ، ئارەزوو و وریا،

- سەرنج: لە هەندێك وشەی لێکدراودا پیتی (و) ی بەیەکەوە بەستن بووە بەشێك لە هەردوو وشە لێکدراوەکە و بە هەموویان وشەیەکی سەربەخۆیان دروست کردووە.

وەك: کاروبار، دەنگوباس، ئەلفوبێ، هاتوچۆ.

لەم بارانەدا مامەڵەی سەربەخۆ لەگەڵ پیتی (و) ی بەیەکەوە بەستندا ناکرێت و وشەکە هەمووی بەسەریەکەوە دەنووسرێت وەك لە نموونەکاندا پیشانمان دا.

**شەشەم:** وشەی ئاسادە چ ناو بێ یان ئاوەڵناو بێ یان زاراوە دەبێ بەسەریەکەوە وەکو یەك وشە دەنووسرێن، وەك:

ناو: **چەمچەماڵ. بێکەس. دڵشاد. زوورگەزراو. بێخاڵ. ناڵپارێز. میاندواو. کانیکەوە. سپیگرە.**

زاراوە: **ڕێنووس. ڕێپێوان. دەسبەجێ. جێبەجێ. نیشتمانپەروەر. دەستنووس. دەسبازی. وڵاتپارێز. ئازادیخواز. دووشەممە. سێشەممە. پێنجشەممە. یەکسەر. ڕاستەوخۆ. یەکشەو (مانگی یەکشەوە).**

**حەوتەم:** پیتی (ت) لە کۆتای کار (فرمان) دا دەشێ بنووسرێت و دەشێ نەشنووسرێت.

وەك: **دێت و دەڕوات (یان) دێ و دەڕوا.**

**هەشتەم:** نیسبەت لە زمانی کوردیدا زۆربەی جار بەهۆی پیتی (ی) لە کۆتای ناودا دەکرێت.

وەك: **پێنجوینی. هەولێری. دهۆکی. شێخانی.**

هەروەها ئەم نموونانەی خوارەوە:

ئەحمەدئاوا: **ئەحمەد ئاوایی.**

یارمجە: **یارمجەیی.**

تووزخورماتوو: **تووزخورماتوویی.**

شنۆ: **شنۆیی.**

ئاکرێ: **ئاکرێیی (یان) ئاکرەیی.**

لادێ: **لادێیی.**

- **سەرنج:** ئەو ناوانەی خۆیان بەپیتی (ی) تەواو دەبن پێویست ناکات (ی) ی نیسبەتیان بخرێتە پاڵ. وەك:

سلێمانی: **کامەران سلێمانی.**

کانیماسی: حاجی حوسێن کانیماسی.

ئامێدی: ئازاد ئامێدی.

**نۆیەم:** هەر وشەیەکی بیانی چ هاتبێتە ناو زمانی کوردییەوە، یان هەر ناو و وشەیەکی تر کە لە نووسینی کوردیدا دێتە پێشەوە، دەبێ بەڕێنووسی کوردی بنووسرێت.

وەك: **ئەللا. قەڵەم. ئەکبەر. قاهیرە. ئۆتۆمۆبیل. دۆستۆیڤسکی.**

**دەیەم:** ئامرازی (تر، ترین) کە بۆ بەراورد بەکاردێن دەبێ بەوشەکانی پێش خۆیانەوە بلکێنرێن. وەك:

**جوان: جوانتر– جوانترین.**

**خاو: خاوتر– خاوترین.**

- **سەرنج:** ئەم ئامرازەی (تر) جیاوازە لە وشەی (تر) کە بەواتەی (دی، دیکە) دێت. ئەمەی دوایی دەبێ بەجیاواز لە وشەی پێش خۆی دەنووسرێت.

وەك: **ماڵێکی تر، چیی ترم ناوێ.**

**یازدەیەم:** جێناوی نیشانەی وەك: ئەم. ئەو. ئەڤ.

ئەم جێناوانە ئەگەر ئاوەڵکاری (کات – یان – شوێن) یان بەدوادا هات پێیانەوە دەلکێن و دەبن بەیەك وشەی سەربەخۆ.

وەك: **ئەمشەو. ئەمڕۆ. ئەڤسال. ئەمجارە. ئەمبەر و ئەوبەر. ئەڤرۆ.**

**دوازدەیەم:** نیشانەکانی نەناسراوی وەك (..یەك، ..ێك، ..ەك) بەشێوەی خوارەوە دەچنە سەر وشەکانی پێش خۆیان:

١- ئەگەر وشەکان بەپیتە بزوێنەکانی (ا، ی، ە، ێ) تەواو بووبن ئەوا نیشانەی (..یەك) یان دەخرێتە پاڵ.

وەك:

**چیا: چیایەك.**

**زەوی: زەوییەك.**

**وێنە: وێنەیەك.**

**دێ: دێیەك.**

٢- ئەگەر وشەکان بەپیتە بزوێنی (وو) یان هەر پیتێکی دەنگدار (نەبزوێن: کۆنسۆنانت) تەواو بووبن ئەوا نیشانەی (ێك- لە کرمانجیی خواروو) و نیشانەی (ەك) یان لە کرمانجیی سەروودا دەچێتە سەر.

**خانوو: خانووێك، خانووەك.**

**گوند: گوندێك** (کرمانجیی خواروو)، **گوندەك** (کرمانجیی سەروو).

**ژن: ژنێك** (کرمانجیی خواروو)، **ژنەك** (کرمانجیی سەروو).

**سێزدەیەم:** گیروگرفتی پاشگرەکانی (دا. ڕا. وە. ەوە)

ئەم پاشگرانە بەوشەکانی پێش خۆیانەوە دەلکێنرێن. وەك:

دا: **لە دڵدا** (هەر برینێ کە لە دڵدا هەیە سارێژی کەن). خەمێکم لە دڵدایە).

ڕا: **لە ئامێدیڕا** (لە وێڕا بەپێ هاتووین). (لە خۆڕا دڵی گۆڕاوە).

وە: **لەچوارچراوە** (لەوێوە هاتووین).

ەوە: **بەماڵەوە** (بەماڵەوە ڕۆیشتین).

(جارێکی تر نووسیمەوە). (خانووەکەم کڕییەوە).

- **سەرنج:** پاشگری (دا) جیایە لە وشەی (دا) کە فرمانە و چاوگەکەی (دان)ە.

وەك: **تیرێکی لە دڵی دا. تیرێکی لە دڵی داوم.** ئەم (دا) یەی فرمان بەجیا دەنووسرێ.

**چواردەیەم:** گیروگرفتی پێشگرەکانی (هەڵ. دا. ڕا. وەر. دەر)

١- ئەم پێشگرانە کاتێ دەچنە سەر چاوگ یان فرمان یان هەر حاڵەتێکی تر، پێیانەوە دەلکێن، بەمەرجێ جێناوی لکاو نەکەوتبێتە نێوان پێشگر و وشەکەی خۆی، وەك:

*چاوگ:

**هەڵ: هەڵکردن. هەڵگرتن. هەڵکورمان. هەڵکێشان.**

**دا: دابڕان. داخستن. داڕمان. داکردن.**

**ڕا: ڕاگرتن. ڕاکێشان. ڕاپەڕین.**

**وەر: وەرگرتن. وەرسووڕان.**

**دەر: دەرکردن. دەرهێنان.**

* فرمان:

**هەڵ: هەڵگرە. هەڵمەخە. هەڵکشێ.**

**دا: دانێ. دامەبڕە**

**ڕا: ڕاکێشە. ڕامەپەڕێنە.**

**وەر: وەرگرە. وەرسووڕێنە.**

**دەر: دەربێنە. دەرخە.**

- **حاڵەتی تر**، وەك: هەڵکشاو. هەڵنەکشا. دانراو. ڕاپەڕیو. ڕانەپەڕیو. وەرگرتوو. وەرگرتە. دەرخراو. دەرکراو.

٢- ئەگەر جێناوی لکاو کەوتە نێوان پێشگر و فرمانەکەی دوای خۆی ئەوا بەجیا دەنووسرێن و جێناوەکە بەپێشگرەوە دەلکێنرێ.

هەڵ: هەڵم گرن. هەڵیان کەن. هەڵمان کێش. هەڵمان مەواسن.

**دا: دامان نەنایە. دایان خەن. دای بڕە.**

**ڕا: ڕایان دەگرین. ڕام کێشە. ڕام پەڕێنە. ڕاشیان پەڕێنن.**

**وەر: وەرمان گرتایە. وەری نەگری. وەریان سووڕێنەوە.**

**دەر: دەریان پەڕاندین. دەری خە.**

**پازدەیەم:** گیروگرفتی وشەی لێکدراو.

ئەگەر وشەی دووەم لە دۆخی فرماندا بوو، بەجیا دەنووسرێن:

**ڕێک دەکەوین. پێکیان هێنایەوە. پێک نەهاتین. یەکیان نەگرتووە. دەستمان نەکەوت.**

بەڵام ئەگەر وشەی دووەم لە دۆخی چاوگ یان حاڵەتی تردا بوو ئەوا هەردوو وشەکە بەیەکەوە دەلکێنرێن.

وەک: **ڕێککەوتن. پێکهاتن. یەکگرتن. دەسخستن. یەکگرتوو. دەسکەوتوو. پێکهاتە.**

**شازدەیەم:** ئامرازی (ش) ی تەئکید کەوتە هەر شوێنێکی وشەوە دەبێ بە بەشێک لە وشەکە و نابێ بەهۆی لەتبوونی وشەکە، وەک: **بشتەوێ ناتدەمێ. نەشخۆی. گوتی دێم.. نەشهات. نەشمانگرتن. بشمانبەن.**

## ملخص البحث

## الإملاء الكردي الموحّد

بدران أحمد حبيب

يعاني استخدام الألفباء العربي في الكتابة الكُردية مشاكل عدة بعضها ناجم عن عدم ملاءمة هذه الألفباء للتعبير عن الصوات الكُردية، والبعض الآخر عن عدم اتفاق ذوي الاختصاص على حل المشاكل الأخرى، ولحد الآن كانت هناك محاولات فردية من المختصين او الكتّاب بصورة عامة، أو مؤسسات من قبيل المجمع العلمي الكُردي في بغداد واتحاد الأدباء الكُرد أو المؤسسات التعليمية. وإننا في المجمع العلمي الكُردستاني حاولنا تحديد تلك المشاكل وإيجاد حلول لها ضمن تقرير شامل، وبصورة عامة نعتقد أن الاتفاق على صيغة موحدة للإملاء الكردي هو أهم عامل في حل هذي المسألة.

هناك مشاكل متعلقة بالألفباء العربي فمثلاً للتعبير عن صوت ( Y)، ( Î ) في الألفباء اللاتيني ليس لدينا سوى حرف (الياء) العربي كما في (يار: Yar ) و (وازي: Wazî )، وفي حالة حرف العلة القصير ( i) كما في (ژن: Jin) و (من: Min) ليس هناك حرف يقابله في الألفباء العربي، وفي مقابل (Û - U - W) ليس لدينا سوى حرف (الواو).

لقد ناقش مجلس المجمع العديد من الاقتراحات والحلول حول مشاكل الإملاء الكردي وبعد مداولات ومناقشات مطولة ومستفيضة اقترح المجلس أن يكون الإملاء الذي اقترحته اللجنة المكلفة بإعداد تقرير عن الإملاء الكردي معروضاً للمناقشة من قبل الكتاب والمؤسسات.

## *Abstract*
## *Kurdish United Dictation*

*Badran. A. Habib*

Clearly, writing Kurdish language in Arabic letters (alphabet) faces many problems due to the deficiency of Arabic in expressing Kurdish sounds in addition to lack of concurrence among linguists and experts in solving those problems. Despite this fact, many attempts were made separately by writers, experts, specialized establishments such as "Kurdish Academy in Bagdad", "Kurdistan Authors Union" And other educational institutions. In this context, we in the "Kurdistan Academy" also had our attempt to deal with the problems mentioned above and issued a comprehensive report.

Generally, we indicated in the report to the solution lying in united dictation in Kurdish language. The Council of the Academy, after detailed debates, has reccomended the conclusions of the committee assigned to prepare a paper about the subject. The Academy of Kurdistan looks forward seeing authors, writers and cultural establishments enriching the subject with their remarkings and perceptions.

# پێداچوونەك ل سەر زاراڤە سازیێ
# د زمانێ كوردیدا

رەشید فندی

زاراڤ د زمانیدا پەیڤەكە، یان ژ پەیڤەكێ پتره، دیاركرنا رامانەكا تایبەتی و خومالی ددەت، ونارمانجەكا دیاركری دگەهینیت، لەورا (زاراڤ) رامانەكا دوورتر و كورتتر ژ رامانا پەیڤا ئاسایی خویا دكەت، و مەودوایەكێ بەرفرەهتر وەردگریت و جوانیەكا باشتر ددەتێ[1].

هەبوونا زاراڤا دناڤ هەر زمانەكیدا، نیشان و سیفەتا هێز و شیان و پێڤەهاتنا وی زمانییە، و كەڤناتی و رەسەناتی و وەرار و گەشبوونا بەردەواما وی زمانی دیاردكەت، لەورا (زاراڤ) یان زانستێ زاراڤا تایەكێ زمانییە و رەنگەكێ دیارێ رەهوانبێژیا وییە..

كوردی ژی مینا هەمی زمانێت رەسەن وخودان وەرار و گەشبوون، بێ دەولەمەندە بهەمی رەنگێت زاراڤا و هەژی ڤەكۆلینێیە؛ د دەرفەتێ زاراڤادا..

بابەتێ دەست نیشانكرن و داتراشین و چێكرنا زاراڤێت هەر زمانەكی، كارەكێ گرنگ و فەر و مەزنە، ژ بەر رۆلێ وان یێ سەرەكی د هەر زمانەكیدا، و ئەڤ كارێ گرنگ و مەزن هەمی ل بن سێبەرا زانستەكی چێ دبیت، كو دبێژنێ (زاراڤەزانی) یان ب عەرەبی دبێژنێ (علم المصطلح) یان ب ئنگلیزی دبێژنێ (Terminology).

و ئەڤ زانستە دهندە ژێدەرادا تێتەناسین (ئەو زانستە یێ خواندنا پەیوەندیان دكەت د ناڤبەرا تێگەهێت زانستی و زاراڤێت زمانیدا ئەوێت دەربرینێ ژێ دكەن..)[2]..

ئانەكو ل پەی ڤێ بۆچوونێ؛ دڤێت ئەو زاراڤێت بێنە دانان، ژ كاكلا زمانی دەركەفتبن یان هاتبنە داتراشین و چێكرن و ژێگرتن، و چو چەوتیێ د دەرحەقێ زمانیدا نەكەن، و ل هەمان دەمی ژی دەربرینا تێگەهەكێ زانستی بكەن، كو خەلكێ مە ب باشی تێ بگەهیت..

زمانی، و ئەو کەسێ دڤێ دەلیڤێدا کار بکەت، دڤێت شارەزایی د زمانیدا هەبیت..

دەربارەی زمانێ مەیێ کوردی ژی، فەرە ئەو کەسێ کاربکەت شارەزاییەکا باش د زمانێ کوردیدا هەبیت، ئەمازە د هەمی زارێت کوردیدا، یان ژی چو نەبیت، شارەزایی د هەردوو زارێت سەرەکیدا هەبیت، دا بشێت زاراڤەسازیێ بکەت، و مفای ژ ڤی زاری یان یێ هە وەرگریت ، بۆ دیتن و چێکرنا زاراڤێ پێدڤی، مە گۆت دیتن و چێکرن، بۆ چی؟ دیتن ئانەکو شارەزایی یا وی کەسی د نڤیسینێت کوردی یێت کەڤندا، دا بشێت زاراڤێت کوردی یێت جوان و ڕەسەن ژ ئەدەبێ کوردیێ کەڤن هەلبژێریت، و بزانیت، کا بۆ چ مەبەست ب کار هاتینە، کو دگەل ئەڤرۆیا زمانێ کوردی بگونجیت، بێ گومانە ئەڤ کارە ب ساناهی نینە و پێدڤییە کەسێ (زاراڤەسان)، ئەدەبێ کوردیێ کەڤن باش خواندبیت و لێ شارەزا ببیت، دا بشێت جوانترین و ل بارترین زاراڤ دگەل ئەڤرۆیا کوردی بگونجینیت.. نەشارەزایی د ئەدەبێ کەڤنێ کوردیدا، ئانەکو دابڕین د ناڤبەرا دوهی و ئەڤرۆیا کوردیدا و قوتکرنا مێژوویا مە یا ئەدەبی.. بۆ وێ مەبەستێ دێ بێژین هندە (زاراڤەسان) هەنە، ب تنێ ل زاراڤێت ئەڤرۆ دنێڕن، و هندەکێت کەشەفرێت د هەلبژێرن کو دگەل مۆسیقا زمانێ کوردی ناگونجن و نەشازەکێ د مۆسیقا زمانێ کوردیێ شریندا پەیدا دکەن.. یان ژی دەمێ زاراڤی دبینن و د هەلبژێرن، هەر ب تنێ ئێك زاراڤ ل بیرا وانە، و ل بەر ڕۆناهیا وێ شەمالکا ب تنێ، وی کارێ مەزن ئەنجام ددەن..

چێکرنا زاراڤا، کارەکە دبیتە تەمامکەرێ کارێ دی، کارێ دیتنێ، چونکی ژیانا شارستانی د ئەڤرۆدا و هێرشا ڕۆژانەیا شۆڕەشا تەکنولۆژی ل ڤی سەردەمی، چەندین زاراڤا دهاڤێتە بەراهیا مە، کو فەرە ئەم بزانین ، دێ چەوا سەرەدەریێ دگەل کەین و دێ چەوا شێین، ڤان زاراڤا بن دەست کەین و نەرم کەین، دا ب ساناهی بێنە ناڤ باخچێ زمانێ مەیێ کوردی.. مللەت بخۆ، باشترین دادڤانە بۆ وەرگرتنا زاراڤێت سەرکەفتی و ڕێزکرنا وان د ناڤ ڕیزێت زمانیدا، و نە وەرگرتن و هاڤێتنا زاراڤێت نە ل بار و دەست نەخۆش، و داڕشتنا چو یاسا و قانوونا، ڤێ چەندێ ل سەر مللەتێ مە

ناسەپینیت، ئانەکو یاسا نەشێت چو زاراڤێت لاواز و سەقەت بچەسپینیت، و نەشێت چوویت باش دروست بکەت، و باشترین رێ بۆ ڤێ چەندێ دیتن و چێکرنا زاراڤێت جوانە، دا ملەت وەرگریت.. و ب سەدان نموونە ل سەر ڤێ چەندێ هەنە..

پێدڤییە ئەم کارەکێ مەزن ئەنجام بدەین، و گەلەک ب هشیاری و زیرەکی، کەلەپووری خۆ یێ کەڤن ئەکۆلین و بەرهەمێ نڤیسینێ مللەتێ خۆ ل بەر چاڤ دانین، ئەوێت بەری چەند چەرخەکا هاتینە نڤیسین و هەتا نوکە، دا جوانترین زاراڤ و پەیڤان ژێ دەربێخین، و ژ لایەکیڤە ئەو دور و مرواری بەرزە نەبن و ژلایەکێ دیڤە، مفای ژ هەبوونا وان وەرگرین.. و دڤێت ئەڤ کارە ژی د ناڤ هەمی زاریێت کوردیدا بێتەکرن، و هەمی پێکڤە کۆم ببن، هەر وەسا ڤەرە بۆ بەرهەلستی و بەربەرەکانیا شوڕەشا تەکنولوژی یا ئەڤرۆ. ئەم ب زیرەکی کارەکێ وەسا ئەنجام بدەین، دا زمانێ مە یێ کوردی بێ بار نەبیت، ژ ڤێ لێڤانا زاراڤێت هەمە جۆر د غاردانا شارستانیا ئەڤرۆدا، دا زمانێ مە پێتێنەکا سەرکەفتی دگەل زاراڤێت ئەڤرۆ بکەت و بشێت زاراڤێت ل بار و گونجای بۆ راستیێ پڕ لق و چقێ ئەڤرۆ ببینیت..

دڤێ وێ ڕاستیێ ژی ژبیر نەکەین، کو شوڕەشا تەکنولوژیا ئەڤرۆ، پترین هژمار ژ زاراڤێت بیانی دئێختە د ناڤ فەرهەنگا زمانێ مەدا.. زاراڤ هەنە، دڤێ ئەم زاراڤەکێ کوردی یێ جوان ل جهێ وی ببینین، و ب چو ڕەنگا نەشێین وەسا بهێلین، زاراڤ ژی هەنە، بێت بووینە زاراڤێت جیهانی و باشترە گەر وەکە خۆ بمینن، و دا ئەم ژ پەنجەرەکا کوردی جیهانا ئەڤرۆ ببینین.

ئەرێ هندە زاراڤێت وەکی (سینەما، تەلەڤزیۆن، ڕادیۆ، کۆمپیوتەر، سەتەلایت، دیجیتال) وەکە خۆ بهێلین، یان ژی وەکی هندە زمانزانێت عەرەب بۆ نموونە هەول بدەین پەیڤێت خومالی بۆ ببینین، هەر وەکی وان ژێرە دیتین و داتراشین، و پاشی کەسێ گوه نەدایێ و ئەو پەیڤ ب بەر ناڤێدا چوون. بۆ نموونە وان پەیڤا: (المشواف) بۆ تەلەڤزیۆن دانا، یان (المذیاع) بۆ ڕادیۆ، و(الحاسوب) بۆ کومپیوتەر، و (اللحقوم) بۆ هەمبرگر.. ل دویف هزرا مە، ئەم ژی دێ تووشی خەلەتیەکا بەرچاڤ بین، گەر وەکە وان

بکەین، و بلا ئەو زاراڤێت جیهانی، وەکە خۆ بمینن، چونکی ملله‌تێ مە ب باشتر و ساناهی تر وەردگریت..

هندە پەیڤێت دی ژی هەنە، هەر دبنەڕەتدا (بیانی) نە، لێ کوردان، ژ بۆ سانا هیکرنێ لڤینەك (حرکە) دایێ، دا بۆ وان نەرم ببیت وقالبێ مەزیکا کوردی وەرگریت ؛ مینا پەیڤا (ترومبێل) بو (ئوتومبیل).. و.. هتد..

بێ گومان هندە نڤیسەرێت کورد هەبوون، بەری بیست سالەکا هەول دابوو ، مینا عەرەبان ، ل سەر ئەزمێ (سیّارە) ناڤێ ترومبێلێ بکەنە (گەرێن) لێ سەر نەگرت و زوی هندا بوو.. لێ بێ گومانە، کوردان زیرەکانە هندە پەیڤ بۆ چێکرییێت نوی دیتینە مینا (بالەفر) و (شەمەندەفەر) بۆ (طیّارة) و (قطار)..

هەر وەسان خالەکا دی ژی هەیە، دەمێ ئەم ل زاراڤێت خۆ ێیت کەڤن دگەڕین، دڤێ ئەم ژبیر نەکەین، شاعر و نڤیسەر و زانایێت مەیێت بەرێ، هەتا پلەیەکا پێشکەفتی شارەزایی د ئەزمانێت ڕۆژهەلاتیدا هەبوو، لەوما ئەم مشە زاراڤێت فارسی و عەرەبی و ترکی دنڤیسینا واندا دبینین. هەر ئێك ژ ڤان زمانا ژی ئەگەرا خۆ هەبوو، فارسی ل سەردەمەکێ درێژ زمانێ ڕەوشەنبیرێ و شعرێ و ئەدەبی بوو، ئەمازە ڤی زمانی گەلەك کار ل سەر شاعرێت مەیێت کەڤن کرییە، هەر وەسا (عەرەبی) ژی زمانێ دینی و پەرستنێ بوو (العبادة)، لەوما هژمارا زاراڤێت عەرەبی ژی د کەلتوورێ مە یێ کەڤندا زۆرە، و چونکی ترکێت عوسمانی، بۆ پتر ژ چار چەرخا دەسەلاتدار بووینە ل کوردستانێ، لەورا هندە پەیڤ و زاراڤێت ترکی ژی د کەلتوورێ مەدا هەنە، لێ ڕێژا ترکی کێمترە ژ فارسی و عەرەبی..

دێ بلا بۆ خۆشی وەرگرتنی، ئاڤرویەکێ ل کەلتوورێ خۆیێ کەڤن بدەین، و بەرپەڕێت هندە نڤیسینێت کەڤن تێکڤە دەین، دا بزانین کا زانایێت کورد، چ زاراف ب کار ئانینە بۆ دەربرینا هزر و بیرێت خۆ ل وان ڕۆژان..

بۆ نموونە چەند زاراڤەکان ل جەم جزیری (١٥٦٧ز ـ ١٦٤٠ز) ببینین کو د هۆزاناویدا هاتینە[٣]

١- سازەند: زاراڤەکە، بۆ وی کەسی ب کار ئینایە، یێ سازێ لێ ددەت، هەروەسا ل ناڤ کوردان، سازەند، شازبەند، شاز بێژ ژی ل کارە،

٢- ئابینە: زاراڤەکە بۆ (خۆدیك) یان (قودیك) ب کارتینیت، هەر وەسا عەینەك، نەینك، ئاوێنە ژی ل کارن..

٣- شەپال: زاراڤەکە ، ب ڕامانا جوان ، خشکوك ، شەنگ و شۆخ ، ل کارە..

٤- چیچەك: گولەکا بچووکە ، زێرە دبێژن ، گول چیچەك ، نها ژی هەیە و ل کارە..

٥- بریان: بریانی ، خوارنەکە ، نوکە ژی هەیە ، کو گوشتێ وێ تێتە براشتن و سوور کرن.

٦- دۆژەه: دۆزەخ، جەهنەم..

٧- گەه گەه: جار جار، دەم دەم، گاڤ گاڤ، هەروەسا پەیڤا (گەه) بۆ (مفصل) ژی ل کارە..

٨- خویا: دیار ، ئاشکەرا ، ئەشکەرا ، ئاشکار..

٩- غوباری: جورەکێ خەتییە، هەر دبسان پەیڤێت ڕەیحانی، دیوانی، (ثولث)، موسەلسەل ژی وەکی جورێت خەتێ عەرەبی ل جەم جزیری هاتینە و هندەك ژ وان ل جەم (خانی) ژی هەنە..

١٠- ئافراند: چێکر، خولقاندن، ژێدەرێ وێ ژی دبیتە (ئافراندن)، کو نها ژ بۆ(ئیبداع) د ناڤ نڤیسەراندا ل کارە..

١١- گلەه: گلی، گل و گازندە، گلەیی، ل کارن..

١٢- بەیهوودە: بێ مفا، بێ فەیدە، پووچ، بەلاش، ژ خوە.

١٣- بت پەرستی: سەنەم پەرێسی..

١٤- بێدار: هشیار، نەنڤستی..

١٥- زۆخ: کێم و عەداف، ئاڤا پیس ژ برینا تێت.

١٦- کەرخین: گەلەك وەستیان، ڕەقبوون، زۆر ماندووبوون،

١٧- شال: شوینکا هریێ، هەتا بەری چەند سالەکا ژی ل ناڤ کوردان یا بەلاڤ بوو..

١٨- گفتوگۆ: دان و ستاندن، گەنگەشە..

١٩- جانەوەر: خودان ڕوح، جاندار، بۆ حەیوانان پتر ل کارە.

٢٠- گرامی: فارسییە، و د کرمانجیا ژووریدا (گرافی) ل کارە، ئانەکو ب بها و قەدر گران.. عەشیرەتەك ل کوردستانا باکوور هەیە، ژێرە دبێژن گرافی.

٢١- زەغەل: ب تەشقەلە، ب حیلە.

٢٢- پەرکەندە: ب فارسی ژێرە دبێژن، (پراکندە)، ئانەکو پەرت و بەلاڤ..

٢٣- خەستە: نەساخ، نەخۆش، خەستەخانە ئانەکو نەخۆش خانە..

٢٤- ظازی: ڕووس ، ڕووت..

٢٥- تیرێژ: تیرۆژ ، تیشك..

٢٦- فەرەنگ: الأفرنج..

٢٧- سورمەدار: چاڤ کلدای ، چاڤ ب کل..

٢٨- زەریاڤ: باڤ زەر..

هەر وەسا شاعرێ ناڤدار (خانی) د ئێکەمین فەرهەنگا عەرەبی / کوردیدا ب ناڤێ (نوبهار) کو ل سالا (١٦٨٣ز) دانایە ، هندە زاراڤێت جوان ب کار دئینیت، ئەم هندە نموونا ژ وێ فەرهەنگێ ژی ببینین کارەکێ باشە[1]:

١- ڤێك ئێخستن: ب ڕامانا تەرتیب کرن، یان کۆمکرن ل کارە، کارێ وێ (فعل) دبیتە (ڤێك بێخە)..

٢- چاڤناس: ب ڕامانا عارف، مدرك تێت.. زاراڤەکێ جوانە بۆ وێ مەبەستێ..

٣- گەرەو: ب ڕامانا (الرهن ، الرهین) ل کارە.. د کوردی یا ئەڤرۆدا ب زارێ کرمانجیا ژووری دبێژن: ئەز کەتمە (گەرەوا) وی.. هەروەسا ل کرمانجیا خوارێ ژی دبێژن: وەرە (گرەو) دەکەین..

٤- مفرەق: ب ڕامانا (سفر) ئانەکو (مس) ب کار ئینایە، ب کرمانجیا ژووری دبێژن: فلانە تشت ڕەقە تو دبێژی (پولا و مفرەقە).. ئانەکو (فولاذ و نحاس)..

٥- قەلا: ب ڕامانا (الرصاص) ب کار ئینایە، کو ب کرمانجیا خوارێ ژێرە دبێژن

(قورقوشم)..

٦- گاف: ب رامانا (الخطوة) بكار ئینایە، یا دیارە هەتا نهو ژی ل كرمانجیا ژووری، (گاف) بۆ هەمان مەبەستێ ل كارە، و ل كرمانجیا خوارێ (هەنگاو) ە، ل كرمانجیا ژووری (پێنگاف) ژی هەیە، لێ دیارە هەردوو كورت بووینە و بووینە (گاف).. بێ گومانە لە كرمانجیا ژووری (گاف) بۆ دەمی ژی ل كارە، دبێژن: گافەكا دی دێ هێم، ئانەكو دەمەكێ دی، دیارە ئەڤە ژی، هەر ئێك رامانە دگەل (گاه) ا فارسی، و د كرمانجیا ژووریدا بوویە ((گەه)) ژی ئانەكو (دۆن) یان (سرە)..

٧- جەرگ: ب رامانا (الكبد) ب كار هاتیە و نوكە ژی هەر وەسایە و ل ئاخافتنا هەولێرێ هەر (جەرگ) مایە، لێ ل ئاخفتنا سلێمانیێ بوویە (جگەر)..

٨- گورچك یان گورچیك: ب رامانا (الكلیة) ب كار هاتییە و نها ژی هەر وەسایە، لێ ل دەڤەرا (بەهدینان) ژێرە دبێژن [گولچیسك] و ل كرمانجیا خوارێ (گورچیلە)..

٩- میهدەر: ب رامانا (الشفاعە) ب كار ئینایە، و پەیڤەكا گەلەك جوانە، كو نها ل جەم مە نەمایە، و ژ بەر كارتێكرنا ئیسلامێ، هەر (شەفاعەت) ل كارە، باشترە گەر (میهدەر) ب كار بینین...

١٠- گەنم رەنگ: ب رامانا (ئەسمەر) بكار هاتییە..

١١- رەوال: ب رامانا (ئەمرەد) یان (جەحێل) یان (سنێلە) ب كارهاتیە. و نوكەژی د كرمانجیا ژووریدا مایە..

١٢- ماك: بۆ (دایك) ب كار ئینایە، و هەتا نوكە ژی د كرمانجیا ژووریدا هەیە، دبێژن (براماك)، واتە ئەو برایێ ژ دایكێڤە دگەهتێ، ئانەكو كورێت دایكەكێنە، لێ تەنێت بابەكینە، هەروەسا دبێژن: بەرخی یدە بەر ماكێ، واتە بەر گوهانێ دایكێ، دا شیری بخۆت، هەر دیسان د كرمانجیا ژووری و خوارێدا، پەیڤا (ماكەر) ل كارە، ئانەكو (ماك كەر)، واتە ماكا كەری، یان دایكا كەری..

١٣- بێ گاف: ب رامانا (مەجبوور) ب كار ئینایە، و زارافەكێ گەلەك جوانە، و ل جەم مە نەمایە، وەسا باشە سەر ژ نوی بكەڤیتە د ناڤ ئاخافتنا مەدا، ئەز (بێ گافم) واتە،

[ئەز مەجبوورم]..

١٤- ڤالا: بۆ (الخالي) يان (الخاوي) ب كار هاتيە و ل كرمانجيا خوارێ (والا) دبێژنێ.. لێ ب رامانا ڤەكرى (المفتوح) تێت، ل كرمانجيا ژوورى هەر ب رامانا بەرێ مايە، ئاصان د ڤالانە ئانەكو (قاپەكان بەتالن)..

١٥- ئێورگەهـ: ب رامانـا (الريـع) يـان (المكـان) ب كـار هاتيـە، نوكـە ژى ل كرمانجيـا ژوورى مايە، و گەلەك دنڤيسينێت مەلا مەحموودێ بايەزيديدا ب كار هاتيە..

١٦- هژاندن: بۆ (رجّ) ب كارهاتيـە، زاراڤـەكێ جوانـە و نـها ژى ل كـارە، و بـۆ كـارى (فعـل)، دبێـژن: هژيـا، دهژيێـت، بهژينـە، هاتـە هژانـدن، هژانـدن (ژێـدەرە)، د هنـدە زاراڤۆكێت كرمانجيدا دبێژن [هەژيا، هەژاندن.. هتد ].

١٧- كەلاشتن: زاراڤەكێ جوانە ب رامانا (شەق كرن) ل كـارە، و نوكـەژى هەيـە، و دەمێت كارى (فعل) دبنە:

كەلاشتبوو، كەلاشت، بكەلێشە، دكەلێشيت، (كەلاشتن) ژێدەرە..

١٨- باردار: بۆ ژنا (حامل) ب كار ئيتايە.

١٩- ئاڤس: بۆ ژنا (حبلى) ب كار ئيتايە.

٢٠- بهاتن ، پهاتن: زاراڤەكـە ب رامانـا (نوبـان) بكـار ئيتايـە، و د كرمانجيـا ژووريـدا (بهوژين) ژى هەيە، لێ ب رامانا (انصهار) تێت..

٢١- برازتن، براشتن: بۆ (شواء) بكار ئيتايە، نوكـەژى ل كرمانجيـا ژوورى ل كـارە، و ل كرمانجيا خوارێ (برژاندن) ل كارە.

٢٢- زوها: زاراڤەكێ جوانە، و هەر ميتا نووكە ب رامانا (نيڤ هشـك) ب كـار هاتييـە، هەژى گوتنێيە كو هەردوو پەيڤێت (زوها) و (كزر) نـها ژى ل كرمانجيـا ژوورى ل كـارن و رامانا هندێ ددەن، كو ئەرد يان جلك يان هەر تشتەكێ دى، ژ ڤوناغا (تەرى) بێ دەرباز ببيت، و هێژ بباشى هشك نەبيت، ژێرە دبێژن (زوها) يان (كزر)، ((زوها)) پتر بۆ جلكا بكارتێت، و ((كزر)) بۆ ئەردى..

٢٣- هونژين، پونژين: ب رامانا (النعاس) يان (سنە) يان خەوەكا سڤك بكار ئيتايە.

٢٤ـ فرووزی یان فرویزی: زاراڤەکێ جوانە و تنها ژی ل کارە، لێ کێم بوویە و رامانا (فیش) یان (فیکە) ددەت..

٢٥ـ گلی: ب رامانا (الشکایة) یان (الشکوی) ب کار تێنایە و تنها ژی هەیە، و د کرمانجیا ژووریدە دبێژن: فلانە کەس گلی و گازندا دکەت.. ئەم بۆچی ڤی زاراڤی بۆ (الشکوی) یا دادگەهێ بکار نائینین؟

هەروەسا گەر ل نڤیسینەکا دن یا کرمانجی بنێرین، چەندین زاراڤێت جوان ژ مەرە دیار دبن، ئەوژی بۆ نموونە نڤیسینەکا مەلا مەحموودێ بایەزیدییە، کو ل نیڤا ئێکی ژ چەرخێ نۆزدەی ژیایە، ئەو نڤیسین ژی ب رەنگی فەرهەنگەکێ نڤیسییە و هەردوو شێوێت (هەکاری) و (بایەزیدی) ژ خوەرە کرینە نموونە، و ئەڤ بابەتە، هێژا پروفیسۆر مارف خەزنەدار د پەرتووکەکێدە بەلاڤ کرییە، بناڤێ [لە بابەتی مێژووی ئەدەبی کوردییەوە]..[*] هەژی گوتنێیە کو (بایەزیدی) زمانزان بوویە ژبلی هندێ کو مێژوونڤیس و نڤیسەرژی بوویە ، دێ بلا چەند نموونەیەکا ژ زاراڤێت وی ژی وەرگرین:

١ـ <u>ئاخفت</u>: مرۆڤەک ئاخفت، (تحدث)..

٢ـ <u>ئاخافت</u>: مرۆڤەک دگەل مرۆڤەکێ دی ئاخفت [تحدث الیه].

٣ـ <u>ڤاری</u>: دەری رێ، ب رامانا دەرکەفتن ژ رێ تێت، هەروەسا ب رامانا (الإنحراف) یان دوورکەفتن ژی تێت..

٤ـ <u>ئاشیڤکرن</u>: ب رامانا (خەپارە کرن) تێت.، ئانەکو(العزق) ب عەرەبی.

٥ـ <u>ئێورین</u>: ب رامانا ساکن بوون یان نیشتەجێ بوون ل کارە، و بەری چەند رێژەکا پەیڤا (ئێورگەهـ) یا بۆری..

٦ـ <u>کەڤر</u>: بەرێ مەزن..

٧ـ <u>برەک</u>: ب رامانا (مشار) یان (المنشار) تێت و زاراڤەکێ جوانە بۆ وی ئامیری..

٨ـ <u>بەرەڤاژی</u> یان <u>بەروڤاژی</u>: ب رامانا (المعکوس) یان (المقلوب) تێت، ب کرمانجیا ژووری دبێژن: رەنیا من بەروڤاژی یا تەیە ئانەکو (مەعکوسێ) وێیە.

٩ـ <u>بژی</u>: ب رامانا (زلوف) تێت.

١٠- پوڕ: ب ڕامانا (پرچ) تێت. (پوڕ) سوور، ئانەکو پرچ سوور..

١١- پزدان یان پستان: ئانەکو (مەمك) یان (چچك) پتر بۆ مرۆڤان ل کارە..

١٢- گوهان: بۆ گیانەوەران ل کارە، و د کرمانجیا خوارێدە، (گوان) ژێرە دبێژن، ئانەکو (الضرع) ب عەرەبی..

١٣- ب کوتەکی: ب زۆری، (ب کوتەك) ئانەکو (ب زۆر)..

١٤- بەلاش: (هەروە) یان (ژخوە) یان (بادی هەوا) یان بێ بەرامبەر..

١٥- بژوین: پاکژ، پاقژ، (بژوین کرن) ئانەکو پاقژ کرن، پاکژ کرن..

١٦- بێدادی: زولم، جەبر، ئەز بێدادیێ قەبوول ناکەم، ئانەکو ئەز زولمێ قەبوول ناکەم.

١٧- بێوازی: لاواز یان زەعیف.

١٨- بێ وەجی: بێ خێری، بێ مفا، بێ فایدە..

١٩- بشافتن: ب ڕامانا (الترشیح) بۆ مادەیێت کیمیایی ل کارە.. تنها ژی هەر د کرمانجیا سەریدا هەیە..

٢٠- پەرتال: تشت، مەتاع..

٢١- پەسن: ب ڕامانا (مەدح) تێت..

٢٢- پشك: (پەش) د کرمانجیا خوارێدە، هەر وەسا ل دەمێ لێکفەکرنا تشتەکی، دبێژن؛ دێ پشك کەین؛ یان دێ پشکێ هاڤێین، ئانەکو (قرعە)..

٢٣- تەمەری: کاکول، گوپك.. هەر وەسا ئەو گوپکێت ب ستوییێ هەسپی داتێن یان ب زێنیدا شۆڕ دبن. من باوەری هەیە ناڤێ "تەمەر" ژی هەر ژ هندێ هاتبیت.

٢٤- جڕەنیخ: مجادلە، گێرە شێوێن ل کرمانجیا خوارێ..

٢٥- چەکمە: ئانەکو (جزمە)، چەکمە سوور، واتە (جزمە سوور)..

٢٦- حەنەك، یاری، لاقردی: ئانەکو گەمە، گاڵتە، وازی..

٢٧- خانێ مال: مەلا مەحموودێ بایەزیدی، بۆ (المطبخ) ب کار ئینایە، و ب هزرا من زاراڤەکێ جوانە، و هەتا نوکە ژی مە گرفتاوی هەیە بۆ ناڤکرنا (المطبخ) ێ، هندەك

دبێژنێ: (لێنانگه ه) یان (لێنێتگه ه)، لێ جهێ خۆ ب دروستی نەگرتییە، و (خانی مال) یان (خانیمال) باشترە..

٢٨ـ دابەڕستن: ب ڕامانا (جڤـین دان) یـان (جوێن دان) یـان (خەبەر گۆتـن) ب کـار ئینایە، و (دابەڕستن) هەتا نووکە ژی ل کارە، (دابەڕست) ئانەکو خەبەر گۆتن..

٢٩ـ دامایی: ب ڕامانا (خەم گرتی) یان (حەزین) ب کار ئینایە و ئـەڤ زاراڤـە نووکە ژی ل کرمانجییا ژووری گەلەك بێ بەلاڤە.. مرۆڤەکێ دامایە، ئانەکو خەمۆکە.

٣٠ـ دراڤ: بۆ (پارە) ب کار ئینایە، یان بۆ (النقد، النقود) و نووکـە ژی ل کـارە، د کەڤندا (پارە) بۆ جۆرەکێ دراڤی ب کار هاتیـە، ب (فارسـی) پـارە، ئانـەکو "پارچـە"، هەر چەندە د کوردیدا نووکە (پارە) جهگیر بوویە..

٣١ـ ڤەزەلیان: درێژ بوون، کەفتن، ل کارە..

٣٢ـ دژوین: زاراڤەکە بۆ تشتێ (قرێژی) ب کار تێت و نووکە ژی ل کارە، هەر چەندە زاراڤەکێ کێم بەلاڤە..

٣٣ـ سوبا: بتنێ، تها ژی د کرمانجیدا هەیە، دبێژن فلانە کەس (سـرت و سـوبا) یـە، ئانەکو بتنێیە و بـێ گرێدان و کـار و پەیوەندییـە، دبێـژن فلانـە (ژن) بـا سـوبایە، واتـە زاراوکێت بچووك نەماینە وبتنێیە و کارێ وێ کێم بوویە..

٣٤ـ شمك: سۆلێت ژنان، ئەو پێلاڤێت ددەنـە سـەر پـێ خـو.. ب عـەرەبی (صـندل) زێدە دبێژن..

٣٥ـ سۆلبەند: ئانەکو نالبەند، نالێت دەوارا چێ دکەت..

٣٦ـ تەمراندن، طەمراندن: ئانەکو ڤە مراندن، یان کوژاندنەوە..

٣٧ـ ڤر: درەو، نهاژی ل کوردستانا باکوور ل کارە..

٣٨ـ ڤرەك: دەروین، درۆزن، ل کوردستانا باکوور ل کارە..

٣٩ـ قلوپانك: تەقلە.

٤٠ـ قیڤار: ستری، کەربەشك، گیایەکێ ب ستربیە، ب دڕکە..

٤١ـ کوارا ئاری: ئەنبارا ئاری، مەخزەن، کۆگا..

٤٢- لێباندن: خاپاندن، حیله لێ کرن، د سەردا برن، فێلێ لێ کرن.

٤٣- لێب: حیلە، فروفێلێ..

٤٤- لێبوك: مقلّد، ترانەکەر..

٤٥- مەزاختن: خەرج کرن..

٤٦- مێرخاس: شەرهەنگێڤ، شەرەنگێو، شەرەنگێز..

٤٧- نختە: رۆژێت باران و عەور..

٤٨- هلباسکین: رابوونە بەر سنگێ ئێك، بۆ کارێ شەری..

٤٩- هەمیان: کەمەرا زێران..

هەروەسا بنێرە ڤان نموونان، ژ دەقەکێ (مەمێ ئالان) یێ فۆلکلۆری[٦]..

١- جڤات: مجلس، نوکەژی ل کارە..

٢- باج: (ضریبە)، نوکەژی ل کارە..

٣- شیلان: مەعزومات، خوارنا بەلاش، دبێژن: شیلان ل تەکیا شێخی هەیە، ئانەکو ل تەکیا شێخی خوارنێ ب بەلاشی ددەن..

٤- تەپسی: سێنێك، قاپ، نوکەژی ل کارە، لێ ئەو خوارنا دوی ئامانیدا تێتە چێکرن، ناڤێ ئامانی وەرگرتییە..

٥- کەزی: زولف..

٦- کوم: کولاڤ..

هەروەسا چەند نموونەیەك ژ فەرهەنگا [الهدیه الحمیدیه] وەکی ڤانە[٧]:

١- ئازا کرن: إعتاق، إعفاء، گەردەن ئازا کرن..

٢- ئاڤس: الحامل والحبلی من النساء خاصةً..

٣- ئاڤسبوون: الحَبَل..

٤- ئالیستن: لَحس، ئامان ئالیستن..

٥- ئاوار: حلوی تعمل من الدبس والدقیق، هەروەسا هەتا نوکە ژی، بۆ مرۆڤەکێ تێکڤەدانێ دکەت و ئارێشا ل ناڤبەرا خەلکی چێ دکەت، دبێژنێ: (دارکێ ئاوارێ) وەسا

دیاره دارکەك هەبوو، ئاوار پێ تێکڤە ددا، لەوما ئەو ناڤ وەرگرتییە..

ل ڤێرە ب زەلالی بۆ مە دیار دبیت، کو کەلتووریّ مە یێ کەڤن، بەری چەند سەد سالەکا و هەتا نوکە، نەهاتیە خزمەت کرن، ودوڕ و مراری ژێ نەهاتینە وەرگرتن، چونکی هژمارەکا باش ژ زاراڤێت کەڤن بۆ ئەڤرۆ ژی بکارتێن و دگەل سەروبەریّ زانستییّ ئەڤرۆ دگونجن، هندەك ژ وان زاراڤا، بێ گهورین و داتراشین تێنە ب کار ئینان، بۆ نموونە زاراڤێ (نختە) چەند جوانە بۆ ب کار ئینانا ڕۆژانە، ئەگەر، ل TV بێژین، کەشناسی وەسا دیار دکەت، سوباهی و دۆسبە دێ (نختە) بیت، ما خۆشتر نینە ژ هندێ گەر بێژین: سوباهی و دۆسبە دێ (عەور و بە فر و باران) بن..

یان پەیڤا (سەقا) بۆ (جوّ) نها ل (TV) ب کار تێت تشتەکێ جوانە و ڕێکوپێکە، دبێژن: (سەقا) یێ ئەڤرۆیێ خۆشە، (سەقا) دێ سوباهی تێکچیت..

## ئەنجام

ئەم گەهشتینە ویێ ئەنجامیێ، کو (زاراڤەزانی) ئەڤرۆ زانستەکێ هویرە، و دارشتنا زاراڤان کارەکێ ب ساناهی نینە، ئەڤرۆ بەری هەر رۆژەکا دی فەرە ژ مەرا ئەم ل پێشییێ ل زاراڤێت کەڤنێت کوردی بفێرین، ئەوێت هەتا نها ماینە د ناڤ بەرهەمێت ئەدەبێ مە یێ کەڤندا ، ئەم ب جوانی لێ بگەرین و ساخ کەینەڤە، هەروەسا پشتی هنگی، ئەم ب شێوەکێ زانستی و دووربینی و شارەزایی کاری دگەل زاراڤێت ئەڤرۆ بکەین، و ل دویف یاسا و دەستورێت زمانێ کوردی رەفتاری ڤێرە بکەین، و پرێت شارستانی ژی ل ناڤبەرا خۆ و جیهانا ئەڤرۆ بهێلین ژبۆ مفا وەرگرتنێ ژ ویێ شارستانییێ، دا زمانێ مە یێ کوردی ژ لایەکیڤە مفای ژ کەلتوورێ خو وەرگریت، و ژ لایەکێ دیڤە، مفای ژ ئەڤرۆ و سوباهیا شارستانییا جیهانی وەرگریت..

زێدەر و ژێدەر:

١ـ رەشید فندی، کۆڤارا رۆشنبیری نوێ، ژمارە (١١١) بەغدا (١٩٨٦) گوتارێ، زاراڤێت ئەدەبی د مەم و زینا خانیدا بپ ٣٠٣.

٢ـ د. علی القاسمی، مقدمه ڤ علم المصطلح، الموسوعه الصغیره (١٦٩) بەغدا ١٩٨٥، بپ ١٧-١٨.

٣. دیوانا مەلایێ جزیری، بەرهەڤکرن و ڤەژارتنا، تحسین ابراهیم دۆسکی، چاپخانە هاوار ، دهوک سالا ٢٠٠٠.

٤. نوبهارا سەیدایێ مەزن، ئەحمەدێ خانی، خرڤەکرن ول دویف چوون و تویژاندنا (صادق بهاوالدین)، بەغدا ١٩٧٩.

٥ـ د. مارف خەزنەدار، لە بابەت مێژووی ئەدەبی کوردی یەوە. بەغدا، ١٩٨٤ بپ ٣٩٠-٤٠٦.

٦ـ ژێدەرێ بووری، بپ ٣٧٧.

٧ـ ضیاوالدین پاشا الخالدی المقدسی، الهدیّە الحمیدیه ڤ اللغه الکردیه، تحقیق، د. محمد موکری، لوبنان سالا ١٩٨٧ ، چاپا دووێ.

ملخص البحث

حول اشتقاق المصطلحات في اللغة الكردية

رشيد فندي

تبحث الدراسة في أهمية المصطلحات في مختلف اللغات ومنها اللغة الكردية، وطرق البحث في كيفية استخراج المصطلحات من المؤلفات الكردية القديمة، واشتقاق المصطلحات الخاصة بالعلوم الحديثة، وضرورة التعامل مع المصطلحات العالمية. كما تطرقت الدراسة الى بعض المصطلحات الكردية القديمة كنماذج للبحث، وضرورة الاستفادة منها في التعامل اليومي..

## *Abstract*
## *Terminology in Kurdish Language*

*Rasheed Findi*

The study shows the significance of terminology to varieties of languages and among them kurdish writing and how to derive scientific terminology learning from terminology valid throughout the world. The study also deals with some old kurdish terminology as samples for resaerch and their benefit in our daily life.

# قۆناغەكانی سەرهەڵدان و گەشەكردنی
# میرنشینە كوردییەكان لە سەردەمی عەباسیدا

د. زرار صدیق توفیق
كولێجی ئاداب/ زانكۆی دهۆك

**مەبەست لەم باسە:**

بە درێژایی سەدەكانی سێیەم و چوارەم و پێنجەمی كۆچی/ نۆیەم و دەیەم و یازدەهەمی زایینی، چەندان میرنشینی گەورە و بچووك لە لایەن سەردار و سەرۆك هۆز و خێڵەكانی كوردەوە دامەزران و لەگەڵ دانانیان بە دەسەڵاتی خیلافەتی عەباسیدا فەرمانڕەوایی زۆربەی ناوچەكانی كوردستانیان دەكرد، یەك دوانێكیشیان توانییان سەربەخۆیی سیاسی و ئابووری تەواوی خۆیان بەدەست بێنن و هەنگاوی گەورەیان بۆ ئەم مەبەستە نا، وەك لێدانی دراو (سك النُقود) ی تایبەت بەخۆیان و ناوهێنانی میری كوردی فەرمانڕەوا لەخوتبە (إلقاء الخطبة) ی ڕۆژانی هەینیدا، بۆ ئەوەی خۆیان بخەنە ڕیزی نەیاران و بەرهەڵستكارانی خیلافەتەوە و بیرلە پچڕاندنی پەیوەندیی دۆستانە لەگەڵ دەسەلاتی ناوەندیدا بكەنەوە.

بێ گومان ئەم میرنشینانە لەپڕ و لەیەك كات و ساتدا دەرنەكەوتوون ، بەڵكو بەچەند قۆناغێكی گەشەسەندن و پێشكەوتن و كەلالەبووندا تێپەڕیون و وەك بەرهەم و دەرئەنجامێكی گۆڕانكارییە ئابووری و كۆمەلایەتی و سیاسییەكانی جیهانی ئیسلامیی ئەو سەردەمە سەریان هەڵداوە، ئەم دەركەوتن و گەشەسندن و كامڵ بوونە ماوەی (٢٢٠-٤٠٠ك/ ٨٣٥-١٠١٠ز) ی خایاند.

لەم باسەدا هەوڵ دەدەین لە سەرەتایەكانی دەركەوتنی میرنشینە كوردییەكان بكۆڵینەوە و شوێن پێی قۆناغەكانی تەشونماكردنیان بكەوین.

**پێشەکی:**

لە سەردەمی دەوڵەتی ساسانیدا (٢٢٦-٦٥١ز) بە هۆی بەرفراوانیی دەوڵەت و سەختی و تووشیی زۆربەی ناوچەکانی کوردستان و بە زەحمەت بەڕێوەبردنی ڕاستەوخۆ (الأدارە المباشرە) ی لە لایەن پاشایەکانی ساسانییەوە، چەندین قەوارەی بچووك و کەم دەسەلآت هەبوون و هەر لە کۆنەوە دەسەلاتداریتیی قەلآ و شارۆچکە شوورەدارەکانی ناوچە شاخاوی و دوورەدەستەکانی کوردستانیان دەکرد، لەم بارەیەوە سەرچاوە ئەرمەنی و کەنەسییەکان (المصادر الکنسیة) کە لە لایەن ئەرمەن و سریان و گرۆ مەسیحییەکانی تری کوردستانەوە نووسراون، زانیاریی دەگمەن و نایابیان تێدایە، ئەم سەرچاوانە - ئەگەر لە بەردەستدا بن - مێژوونووس و ڤەکۆڵەران دەتوانن زۆر زانیاری و هەواڵ و دەنگوباسی بەکەڵك و گرنگ لە ناویاندا بەدەست بێنن، هەر بۆ نموونە: لە سەرچاوەیەکی کەنەسیدا هاتووە کە نەوشیڕوان، فەرمانڕەوای شارەزوور (پارێزگای سلێمانیی ئێستا) بە خۆی و چوار هەزار کەسەوە بڕوایان بە ئایینی نەسرانی هێنا [1].

کاتێکیش ئایینی ئیسلام دەرکەوت و فاتیحە موسڵمانەکان لە ساڵەکانی (١٦-٢٠ك/ ٦٣٧-٦٤١ز) دا گەیشتنە کوردستان و هەوڵیان دا دەست بەسەر شار و ناوچە و قەلآکانیدا بگرن، ڕووبەڕووی بەرەنگاری و بەرگری لە خۆکردنی هەندێك دەسەلآتدار و خاوەن قەلآی کورد بوونەوە، مێژوونووسی فتووحات بەلازوری (البلاذري) (مر. ٢٧٩ك/٨٩٣ ز.) لە باسی دەست بە سەرداگرتنی مووسڵ و دەڤەری بادیناندا، ناوی ئەو قەلآ و پێگا و شارۆچکانەی هێناوە کە بەری شالآوی فاتیحە موسڵمانەکانیان گرتووە و دەڵێت قەلآ و پەناگاکانی "المرج(ئاکرێ)؟"، باعەزرا، حەبتون، حەیانە (؟)، المعلە "مالتا(؟)"، داسین (داسەن) و هەموو قەلآیەکانی کوردان فەتح کران"[2].

---

(١) المجمع العلمي السّرياني، المجلّد الثّاني، بغداد ١٩٧٦، ص. ٣٢٤.

(٢) فتوح البلدان، بيروت ١٩٥٩، ص. ٣٢٧.

هەروەها لەدەم شێخەکانی شارەزوورەوە (مشایخ شهرزور) دەگێردرێتەوە کە وا شارەکانی شارەزوور و سامەگان (الصامغان) و داراناباد (داراباذ) بە شەڕ فەتح کران و ژمارەیەك لەکوردەکان بە کوشت چوون[3].

هەر لە کاتی فتووحاتی ئیسلامیدا ناوی خودانی بەدلیس (صاحب بدلیس)[4] و خودانی ولاتی هەکاری (صاحب الحکاریة) و خودانی قەلای هەتاخ و خودانی قولب – لە هەرێمی دیاربەکر– هاتووە[5].

لە سەردەمی خەلیفە عومەردا (عمر بن الخطاب) (١٣–٢٤ ك/٦٣٤–٦٤٤ز.) زۆربەی هەرە زۆری ناوچەکانی کوردستان فەتح کران و سەدان جەنگاوەری عەرەبی موسڵمان بە کوردستاندا بڵاوبوونەوە و دەیان هۆز و خێڵ و بنەماڵەی عەرەب گەیشتنە ولات و لە شوێنە گرنگ و بە پیتەکانی ناوچە جۆر بە جۆرەکانی کوردستاندا ئاکنجی بوون[6]، چەند سەرکردەیەکی موسڵمان کران بە والیی شار و هەرێمەکان؛ هەموو سەردار و خاوەن قەڵاو سەرۆك هۆزەکانی کورد دەسەلاتیان لە دەست دا و لە بەین چوون؛ هەندێکیان کوژران و هەندێکیشیان بروایان بە ئایینی نوێ هێنا و ئەوانەی دەرباز بوون کشانەوە ناو ڕەوەزە شاخەکان و ناوچە سەختە دەستە چەپەکان؛ هەر بۆیەش بە درێژاییی دوو سەدە، واتە: سەدەی یەکەم و دووەمی کۆچی/ حەوتەم و هەشتەمی زایینی؛ لە سێ – چوار کورتە هەواڵ بەولاوە هیچ دەنگوباس و هەواڵێکی میر و هۆزە کوردەکان لە سەرچاوەکاندا بەرچاو ناکەوێت[7]، کوردستانیش بە هەموو ناوچە و

---

(٣) هەمان سەرچاوە، ل. ٢٢٩.

(٤) هەمان سەرچاوە، ل. ١٨٠.

(٥) الواقدي، فتوح الشّام، دار الجیل، ١٩٥٤، ٢/١٥٠.

(٦) لەم بارەیەوە بڕوانە: محمد جاسم حمّادي، الجزیرة الفراتیّة والموصل، بغداد ١٩٧٧، ل.١٥٩ – ١٧٢. حسام الدّین علي غالب النّقشبندي: أذربجان، رسالة دکتوراه غیر منشورة، جامعة بغداد ١٩٨٤، ص. ٨٥ – ١٠٧.

(٧) الیعقوبي، تأریخ الیعقوبي، دار صادر، بیروت، ٢/١٤٤٠، الأزدي، تأریخ الموصل، القاهرة ١٩٦٧، ص. ٢٠٧ – ٢٠٨، ابن الأثیر، الکامل في التّأریخ، بیروت ١٩٧٨، ٥/ ٢٥ – ٢٦.

شارەکانیەوە لەلایەن خێلافەتی ئیسلامییەوە و لە ڕێگەی والییەکان و سەرۆك هۆزە عەرەبەکانەوە بەڕێوە دەبرا[8] و بواری سەربێچی و سەربەرزکردنەوە لە پێش میر و سەردارە کوردەکاندا نەمابوو.

خێلافەتی عەباسی پاش مردنی خەلیفە موعتەسەم (المعتصم) لە سالی (٢٢٧ك/٨٤٢ز) هەنگاوی یەکەمی بەرەو لاوازبوون نا و دەسەلاتی خەلیفە تا ڕادەیەکی زۆر کز و لاواز بوو، ئەوە بوو لە ماوەی (٢٣٢-٢٧٩ك./٨٤٧-٨٩٢ز.) چەند ئەندامێکی کەم ئەزموون و بێدەسەلاتی بنەماڵەی عەباسی (المتوكل، المنتصر، المستعين، المعتز، المهتدي، المعتمد) یەك لە دوای یەك بوون بە خەلیفەی موسڵمانان.

سەرکردە تورکەکان کە بە شەڕانی و بە جەربەزەیی ناسرابوون، وەك (إيتاخ، بُغا، وصيف)، ئەم هەلەیان قۆستەوە و کۆنترۆلی باروودۆخەکەیان کرد و دەستیان گرت بە سەر زۆربەی دامودەزگاکانی خیلافەتدا و خەلیفەی عەباسییان بەتەواوەتی کەنارگیرکرد و دەسەلاتێکی ئەوتۆیان بۆ نەهێشتەوە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی خیلافەتی عەباسی لە لایەکەوە گیرۆدەی چەندین تەنگەژە و ئاریشە هاتبوو، بزووتنەوەکانی شوراتەکان - خەواریج (الخوارج) و شیعە لە گەشەسەندن و تەشەنەکردندا بوون و شۆڕشی زنج (پێست ڕەش) ەکان لە سالی (٢٥٥ك./٨٦٩ز.) لە خوارووی عیراق بەرپا بوو، لاوازیی خیلافەت هەلی لە باری بۆ ئەم بزاڤانە ڕەخساندبوو[9].

لە لایەکی ترەوە دیاردەی جیابوونەوەی سیاسی لە جەستەی خیلافەتی عەباسیدا لە ڕۆژهەلاتی ئیسلامیدا سەری هەلدا، کاتێك تاهیری کوڕی حوسێن لە سەرەتای سەدەی سێیەمی کۆچی (سالی ٢٠٥ك./٨٢١ز.) میرنشینی تاهیری لە هەرێمی خوراسان دامەزراند، پاشان میرنشینی شیعەی زەیدی لە هەرێمی تەبەرستان لە سالی (٢٥٠ك./٨٦٤ ز.) و میرنشینی سەفاری (الصفارية) لە هەرێمی فارس و کرمان لە سالی

---

(٨) فتوح البلدان، ص، ١٧٦ - ١٨٢، ٢٠٠ - ٢٠٨، ٢٢٧ - ٢٢٩.

(٩) لەبارەی ئەم بزاڤانەوە بڕوانە. عبد العزيز الدُّوري، دراسات في العصور العبَّاسيَّة المتأخرة، مطبعة جامعة البصرة؛ فاروق عمر، تأريخ العراق في عصور الخلافة العبَّاسيَّة الإسلاميَّة، بغداد ١٩٨٨

(٢٥٤ك./٨٦٨ز.) دا دامەزران، دواتریش میرنشینی سامانی لە هەرێمەکانی ئەو بەری ڕووبار (بلاد ما وراء النهر) لە سالی (٢٨٩ك.=٩٠٢ز.) دامەزرا[١٠].

شتێکی ئاسایی و بەڵگە نەویستە کە ئەم بارودۆخە ئاڵۆزەی دووچاری خیلافەتی عەباسی هاتبوو کار بکاتە سەر ناوچەکانی کوردستان و دیاردەی جیاخوازی و هەوڵدان بەرەو سەربەخۆییان تێدا ڕەنگ بداتەوە، بە هەمان شێوە لە کوردستانیش دەسەلاتی خەلیفە و دەوڵەتی ناوەندی لاواز ببێت و ڕێخۆشکەر بێت بۆ چرۆکردن و نەشونماکردنی جۆرە دەسەلاتێکی ناوخۆیی لە لایەن خەڵکی کوردەوە، بەتایبەت ئەگەر ئاگاداری ئەوە بین کە کوردستان پڕە لە قەڵا و بارەگا و پەناگا و شارۆچکەی شورەدار کە بە چەند زنجیرە چیایەکی سەخت و تووش دەورە دراون؛ سەرەڕای ئەمە پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکرێت کە کوردستان هەموو مەرج و مقەویماتی میرنشینیی سەربەخۆی تێدا هەیە، هەر لە قەڵا و شورەوە وەك باسکرا تا ناوچەی شاخاوی لاچەپ و لە گرتن نەهاتوو و دەیان هۆزی ئازا و شەڕکەر و خاوەن دەسەلات[١١].

کوردستان بە شێوەیەکی گشتی ناوچەیەکی شاخاویی سەختە، زنجیرە چیایەکان وەك قەڵغانێکی سروشتی، ناوچەکانی ناوەوەی کوردستان دەپارێزن و هێڵێکی درێژی بەرگری پێك دەهێنن و بەری شاڵاوی سوپای نیزامی دەوڵەتان تا ڕادەیەکی باش دەگرن، لەسەر لوتکە و پەناگەی ئەم زنجیرە چیایانە ژمارەیەکی زۆر قەڵا و پایەگای جەنگی هەبوون کە لە لایەن هۆزەکانی بوختی (بوختانی – بۆتانی) و هەکاری و مەهرانی (میرانی) و داسەنی و بەژنەوی و هەزبانی و زەرزاری و بەرزیکانی و گاوانی و لوڕی و شازەنگانی و گەلالی و گۆرانی... هتدەوە بەڕێوەدەبران، تەنانەت مێژوونووس و جوگرافیناس یەعقووبی (پاش سالی ٢٩٢ك./٩٠٥ز. کۆچی دوایی کردوە) هەرێمی چیا

(١٠) دەربارەی ئەم میرنشینانە بڕوانە: خاشع المعاضیدي و رشید عبدالله الجمیلي، تأریخ الدُّویلات العربیّة الإسلامیّة في العصر العبّاسي، بغداد ١٩٧٩.

(١١) المسعودي، مروج الذّهب، بیروت ١٩٨٦، ٢/١٣٥، التّنبیه والإشراف، بیروت ١٩٨١، ص. ٧٩.

(اقليم الجبال) بە "ولاتی کوردە دڵڕەقەکان-دار الاکراد غليظي الاكباد) ناو دەبات[١٢]، هەر لەم بارەیەوە گەڕۆکی تورك، ئەولیا چەلەبی (مـ.١٠٦٧ك./١٦٥٦ز.) دەڵێت لە کوردستاندا حەوتسەت و حەفتا قەڵا هەیە[١٣] و (ابن شداد) (م٦٨٤ك/١٢٨٥ز) تەنها لە دەڤەری دیاربەکردا نزیکەی پەنجا قەڵاو شورە و شارۆچکەی ژماردووە[١٤].

بۆیە هیچ سەیر نییە لە گەڵ لاواز بوونی خیلافەی عەباسیدا ؛ بەرە بەرە میر و سەردارانی کورد لێرە و لەوێ دەربکەون و ناوچەیەك یان قەڵایەك بۆ خۆیان دابڕن و فەرمانڕەوایی بکەن و جۆرێك لە دەستەڵاتداریتی ناوخۆیی دەستەبەربکەن ، بە پشتبەستن بە سەرچاوەکان، دەتوانین دەرکەوتن و گەشەسەندنی میرنشینە کوردیەکان بکەین بە سێ قۆناغەوە:

**قۆناغی یەکەم:**

**قۆناغی سەرهەڵدان (نیوەی یەکەمی سەدەی٣ی ك./٩ز.)**

لە نیوەی یەکەمی سەدەی سێهەمی کۆچی/ نۆهەمی زایینیدا، بۆ یەکەم جار لە هەندێ ناوچەی کوردستاندا قەوارەی سیاسیی بچووکی کوردی دامەزران، کە یەکەم کەسایەتیی کورد لە سەردەمی ئیسلامیدا توانیبێتی بازنێك بخاتە ژێر ڕکێفی دەسەڵاتی خۆیەوە و نیوچە سەربەخۆییەکی سیاسیی بۆ خۆی دابین بکات و ڕۆڵی لە ڕووداوەکاندا گێڕابێت، ئەوا عیسمەتی کورد (عصمة الكردي) ە، کە لە سەردەمی خەلیفەی عەباسی (المعتصم) دا (٢١٨-٢٢٧ك./٨٣٣-٨٤٢ ز.)، خاوەنی شاری مەرەند بوو کە شارێکی هەرێمی ئازەربایجانە و دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی شاری خۆی و باکووری دەریاچەی ورمێوە[١٥] ؛ مێژوونووس، یەعقوبی بە (عصمة الكردي صاحب مرند) ناوی دەبات[١٦].

---

(١٢) البلدان، النّجف ١٩٥٧، ص. ٦.

(١٣) سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی، وەرگێڕانی ئاکام، بەغدا ١٩٧٩، ل: ٩١.

(١٤) الأعلاق الخطيرة في ذكر أمراء الشّام والجزيرة، دمشق ١٩٧٨، ٣/ ٢٤٦ - ٢٥١.

(١٥) دەربارەی ئەم شارە بڕوانە: ياقوت الحموي، معجم البلدان، بيروت ١٩٧٩، ٥/ ١١٠، لسترنج، بلدان

هیچ زانیارییەك ل سەر ئەم میرە کوردە نییە و نازانرێت لە چ هۆزێکە و چۆن و کەی بوتە خاوەند شاری مەرەند؟ تەنها ئەوەندە نەبێت کە لە ساڵی (٢٢٠ك، ٨٣٥ ز) دا پێوەندیی بە بزاڤی بابەکی خوڕڕەمی (بابك الخرّمي) یەوە[17] و پاشان لە لایەن سوپای عەباسییەوە دەستگیرکراو و خرایە زیندانەوە و تا سەردەمی خەلیفە (الواثق) (٢٢٧-٢٣٢ك،/٨٤٢-٨٤٧ ز) هەر لە زینداندا مایەوە[18].

هەر لەم ماوەیەدا جەعفەری کوڕی میرحەسەنی کورد لە چیاکانی داسەن، ڕۆژهەڵاتی مووسڵ[19] و سەدەقەی کوڕی عەلی (صدقة بن علي) لە چیاکانی ئازەربایجان[20] و مووسای کورد (موسى الكردي) لە جەزیرەی بوتان (جزيرة ابن عمر) دەرکەوتن، مێژوونووسی سریانی (ابن العبري) (مـ٦٨٥ك،/١٢٨٦ز.) لە سەر مووسای کوردەوە دەڵێت: "سەرۆکی کوردان بوو لە کوردستان"[21].

**قۆناغی دووەم:**

**قۆناغی گەشەسەندنی دەسەڵاتدارییەکان (٢٥٠-٣٣٤ ك. / ٨٦٤- ٩٤٦ ز.)**

لەم قۆناغەدا دەستەڵاتدارانی کورد بە ژمارە زۆرترن و لەڕووی جوگرافییەوە لە هەموو ناوچەکانی کوردستاندا بەرچاو دەکەون، سنووری دەسەڵاتداریشیان

---

الخلافة الشّرقيّة، التّرجمة العربيّة، بغداد ١٩٥٤، ل: ٢١٠.

(١٦) تأريخ اليعقوبي، ٤٧٣/٢.

(١٧) ئەم بزاڤە لە ساڵی ٢٠١ ك. - ٨١٦ ز. دا لە هەرێمی ئازەربایجاندا هەڵگیرسا و تا ساڵی ٢٢٣ ك. - ٨٣٨ ز. بەردەوام بوو، بۆ زیاتر زانیاری، بڕوانە: حسين قاسم العزيز، البابكيّة او انتفاضة الشّعب الأذربايجاني ضدّ الخلافة العبّاسيّة، بيروت ١٩٦٦.

(١٨) الطّبري، تأريخ الطّبري، القاهرة ١٩٧٧م، ١٢/٩، ٣٢٤/٥.

(١٩) ابن العبري، تأريخ الزّمان، نقله إلى العربيّة الأب إسحاق أرملة، بيروت ١٩٩١، ص. ٣٥.

(٢٠) الأزدي، تأريخ الموصل، ص. ٤٣١، ابن الأثير، الكامل، ٢٥٨/٥، ابن دحية، النّبراس في تأريخ خلفاء بني العباس، بغداد ١٩٤٦، ص. ٧٣.

(٢١) البلاذري، فتوح البلدان، ص. ٤٠٥، تأريخ الموصل، ص. ٢٥٦ - ٢٥٧.

بەرفراوانترە، تەنانەت هەندێکیان نیوچە میرنشینییەکیان پێك هێناوە، لەچاو میر عیسمەت و هاوچەرخەکانی زیاتر لەوە دەچن کە تەواو سەربەخۆ بوو بن.

لە دەڤەری هەکاری (بادینان) و ناوچە شاخاوییەکانی باکوور و ڕۆژهەڵاتی مووسڵدا ژمارەیەك میری سەربەخۆ دەرکەوتن، وەك جەعفەری کورد (جعفر الکردي)[22] خاوەنی قەڵای ئەردەمشت[23] و میر شەدادی کورد (شداد الکردي) خاوەنی قەڵای حەسەنییە (الحسنیە- زاخۆی ئێستا)[24] و چەندانی تر کە تەبەری (الطبري) (مر.٣١٠ ك./٩٢٣ ز.) بەسەرۆکە کوردەکان (رؤساء الأکراد) ناویان دەبات[25]. ئەمانە لە سەردەمی خەلیفە (المعتمد) دا (٢٥٦-٢٧٩ك./٨٧٠-٨٩٢ ز.) ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیان بەڕێوە دەبرد و سوودیان لە بزاڤی شوراتەکان (الخوارج)[26] وەرگرت و پێوەندییان لەگەڵ هاروون کوڕی عەبدوڵڵا، سەرکردەی شوراتەکاندا بەست، هەروەها لەگەڵ حەمدان کوڕی حەمدوون، سەرۆك هۆزی (بنو تغلب) لە دەوروبەری شاری مووسڵ[27]، بۆیە لە ساڵی (٢٨١ك/٨٩٤ز.) هەموویان یەك لە دوای یەك کەوتنە بەر شاڵاوی خەلیفەی بەهێز (المعتضد) (٢٧٩-٢٨٩ ك./٢٩٢-٩٠٢ ز.)، خەلیفە بە سوپایەکی گەورەوە ڕووی کردە قەڵای حەسەنیە و لەوێوە بەرەو قەڵای ئەردەمشت ملی نا و بڕیاری دا هەردوو قەڵاکە کاول بکرێن[28].

لەناو میرە کوردەکانی دەڤەری هەکاریدا میر شەداد لە هەموویان بەهێزتر بوو و

---

(٢٢) الکامل، ٦/٧٩، أنور المائي، الأکراد في بهدینان، ط. ٢، دهۆك ١٩٩٩، ص. ١٠٢.

(٢٣) ئەردەمشت قەڵایەکی سەختە، لەسەر لوتکەیەکی بەرز، لە زنجیرە چیای بێخێر، لە نێوان هەردوو گوندی ئەردەمشتەکانی لە ڕۆژاوای دهۆك، خاوەنی وەم باسە، لە ڕۆژی ١٩٩٥/٢٥ دا سەردانی وەم قەڵایەی کردووە.

(٢٤) تأریخ الطبري، ١٠/٣٨، الکامل، ٦/٧٧.

(٢٥) تأریخ الطبري، ١٠/٤٠، الکامل، ٦/٧٨.

(٢٦) دەربارەی شوراتەکان بڕوانە: مصلح مصطفی جلالي، شوراتەکان، بغداد ١٩٨٦.

(٢٧) دەربارەی حەمدانییەکان بڕوانە: فیصل السامر، الدّولة الحمدانیّة في الموصل وحلب، بغداد ١٩٧٠.

(٢٨) الکامل، ٦٠/٧٧، یاقوت الحموي، معجم البلدان، ١/١٤٧.

خاوەن سوپایەکی تۆکمە بوو. بەگەواهیی تەبەری ژمارەی چەکدارەکانی، خۆی لە دە هەزار کەس دەدا[٢٩].

لە هەرێمی جەزیرە و دەڤەرەکانی باکووری کوردستان سەرۆکەکانی هۆزی بەژنەوی (البشنویة) هەر لەنیوەی دووەمی سەدەی سێهەمی کۆچییەوە توانییان قەوارەیەکی سیاسی بچووک بۆ خۆیان پێکەوە بنێن و قەلای بەناوبانگی فینك (Pinaka) بکەنە پێگەی خۆیان. لەم بارەیەوە سەرچاوەکان دەگێڕنەوە کە هۆزی بەژنەوی ماوەی سێسەد ساڵە قەلای فێنکی بە دەستەوەیە[٣٠].

هەر لە هەرێمی جەزیرە و لە ڕۆژاوای شاری تەرسووس[٣١] کوڕی زوحاك (ابن الضحاك) تا ساڵی (٣١٥ك./٩٢٧ ز.) قەلای (جەعفەری) ی بە دەستەوەبوو. ئەم میرە کوردە لە ئیسلام هەلگەڕایەوە و بوو بە مەسیحی و پێوەندیی بە ئیمپراتۆری بیزەنتی ڕۆمانۆسی یەکەم (٩١٩–٩٤٤ ز.) هوە کرد، ئەویش پارەیەکی زۆری پێبەخشی و ناردیەوە تا بە ناوی ئەوەوە قەلای جەعفەری بەڕێوە ببا؛ تا لە ساڵی (٣١٥ ك./٩٢٧ ز.)دا بەدەستی سوپای عەباسی بەدیل گیرا و هەموو چەکدارەکانی کوژران[٣٢].

دەڤەری شارەزوور هەر چەند لە سامەڕای پایتەختی ئەو کاتەی خیلافەتی عەباسییەوە نزیك بوو، لە هەموو دەڤەرەکانی تری کوردستان پتر دەسەلاتداریتیی کوردی تێدا دامەزرا؛ ئەم دەڤەرە هەر لەکۆنەوە زێدی ژمارەیەك هۆزی گەورە و بە هێزی: وەك بەرزیکانی، شارەنگانی، گەلالی، عەیشانی، باپیری ، سێوەیلی، بوو کە خاوەنی چەندان قەلا و شارۆچکەی شووورەداربوون، لەوانە سامەگان (الصامغان) ،

(٢٩) تأريخ الطّبري، ٣٨/١٠، الكامل، ٧٧/٦.

(٣٠) الكامل، ١٤٠/٩، القزويني، آثار البلاد وأخبار العباد، بيروت ١٩٦٠، ص. ٤٣٢.

(٣١) تەرسووس، شارێکە لە ولاتی شام، لە نێوان حەلەب و ئەنتاکیە، نزیك بە ولاتی ڕۆم (بلاد الرُّوم)، معجم البلدان، ٢٨/٣.

(٣٢) الكامل، ١٩٠/٦.

دارائاباد (دراباذ)، پیر، سیروان، سرماج، زەلم، قسنان، دزدان، ...[٣٣].

زۆربەی ئەم هۆزانە تا ڕادەیەکی بەرچاو سەربەخۆیی خۆیان دەستە بەر کردبوو، تەنانەت کاروباری سیاسی و ئابووری و دارایی ناوچەکە بەدەست خۆیانەوە بوو. والی و باجگر و فەرمانبەرانی دەوڵەتی لێ نەبوون، خەڵکی شارۆچکەی شارەزوور بە گشتی ئازا و جوامێر و شەڕکەر وجەربەزەبوون، هەرگیز گوێڕایەڵی دەسەڵاتی ناوەندی نەبوون و ژێردەستی خەڵکانی بیانیان قەبول نەدەکرد ، بۆ بەرگری لە خۆکردن پشتیان بە قایمی و پتەوی شارۆچکەکە دەبەست[٣٤]، لەم بارەیەوە گەڕۆکی ناودار (إبن حوقل) (مر.٣٦٧ ك./ ٩٧٨ ز.) دەڵێت ((شارەزوور شارێکی بچووکە، کوردەکان دەستیان بەسەرداگرتووە ‥ ئەمیری تێدایە، لە لایەن سوڵتانەوە نە باجگر...))[٣٥].

هەروەها (مسعر بن مهلهل) کە گەڕۆکێکی ترە و لە ساڵی (٣٤٣ك./٩٥٥ز.) دا چۆتە شارەزوور و لە نزیکەوە ئاگاداری باردۆخی ناوخۆی ناوچەکە بووە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ((شارەزوور بریتییە لە چەند شارۆچکە و گوند‥ شارێکی تێدایە پێی دەڵێن (نیم ئەزراي)؛ خەڵکەکەی لە سوڵتان یاخین،، زۆربەی میرەکانیان لە خۆیانن،. فێری یاخی بوونن لە خەلیفەکان[٣٦].

خەلیفە لە چوار چێوەی هەڵمەتە بەرفراوانەکەیدا بۆ سەر دەڤەری مووسڵ و هەکاری، ویستی شارەزووریش لە نەیاران و بەرهەڵستکارانی پاك بکاتەوە و دەسەڵاتی ناوەندی بگەڕێنێتەوە بۆ ناوچەکە، هەوڵێکی بێ پایانی دا بۆ بەجێ هێنانی ئەم مەبەستە، بێ ئەوەی بتوانێت سەرکەوتن بە دی بێنێت، لەبەر پتەویی شارەکە و زۆری و

---

(٣٣) البلاذري، فتوح البلدان، ص. ٣٢٩، معجم البلدان، ٣/٣٧٥.

(٣٤) مسکویە، تجارب الأمم، القاهرة ١٩١٤، ٧/٣٩٨، شارەزوور بە خۆی ناوچەیەکی بەرفراوانە و زۆر شار و قەلا و گوندی تێدایە. یەکێك لە شارەکان هەر بۆ خۆی ناوی شارەزوورە.

(٣٥) صورة الأرض، بیروت ١٩٧٩، ص. ٣١٤.

(٣٦) الرسالة الثانية، القاهرة ١٩٧٠، ص. ٥٨، ياقوت الحموي، معجم البلدان، ٣/٣٧٥، القزويني، آثار البلاد وأخبار العباد، ص. ٣٩٨.

جوامێری چەکدارەکانی[٣٧].

لە نێو دەسەڵاتدارانی شارەزووردا لە نیوەی دووەمی سەدەی (٣ک./٩ز.) دا تەنها ناوی (ابن أبي الربيع الكردي) هاتووە، کە لە ساڵی (٢٩٠ک./٩٠٣ز.) دا داڵدەی سەرکردەی عەباسیی هەڵاتوو، (ابو سعید الخوارزمي) ی دا و پێکەوە بڕیاری یاخی بوونیان دا[٣٨].

لە دەورووبەری ساڵی (٣٠٠ک./٩١٣ز.) دا برایان ونداد و غانم، کوڕانی میر ئەحمەدی عەیشانی توانییان دەست بە سەر ناوچەکانی دەینەوەر و شارەزوور و سامەگاندا بگرن و میرنشینێکی بچووك دابمەزرێنن و بۆ ماوەی نزیکەی پەنجا ساڵ حوکمڕانی بکەن، ئەوەی شایانی باسە هەر یەکێکیان هەزارەها چەکداری هەبوو[٣٩]، بەمەش دامەزراندنی یەکەم میرنشینی کوردیان ڕاگەیاند.

میر غانم قەڵای قسنانی کردە بارەگای خۆی و قەڵایەکی تری ئاوەدان کردەوە و ناوی لێنا (غانم آباد)[٤٠].

دیاردەی سەربەخۆیی ناوخۆیی دەڤەرەکانی خوزستان (ئەهواز) و لوڕستان و واسیت (واسط) یشی گرتەوە، لە شەستەکانی سەدەی (٣ک./٩ز.) دا محەمەد کوڕی عوبەیدوڵلا کوڕی هەزار مێردی کورد (محمد بن عبیدالله بن هزار مرد الكردي)، وەك میرێکی ناودار لە هەرێمی خوزستان دەرکەوت و سوپایەکی گەورەی لە چەکدارانی کورد هەبوو؛ بۆیە یەعقووبی سەففار دامەزرێنەری میرنشینی سەففاری (الصفّارية) ی لەسەر هەرێمی خوزستان کرد بە والیی خۆی. میر محەمەد، بۆ پتەوکردنی دەسەڵاتی سیاسیی خۆی و وەدەستخستنی سەرفەرازیی تەواو، پێوەندیی لەگەڵ عەلی کوڕی محەمەد، سەرکردەی شۆڕشی زنجەکان لە باشووری عێراقدا گرت (٢٥٥-٢٧٠ک/٨٦٩-٨٨٤ز.).

(٣٧) مؤلّف مجهول، العيون والحدائق في أخبار الحقائق، الجزء الرّابع، دمشق ١٩٧٢، ص. ٤٧٤.

(٣٨) تأريخ الطّبري، ٩٨/١٠، الكامل، ٦/ ١٠٧.

(٣٩) الكامل، ١٠١/٧.

(٤٠) هەمان سەرچاوە، ١٠١/٧.

دەرحەق ئەم میرە کوردە مێژوونووس (ابن الاثیر) دەڵێت: "محەمەد بڕیاری دا موداراتی یەعقووبی سەففار و سەرکردەی زنجەکان بکات، تاوەکو هەڵوێستی سیاسیی لە هەرێمی خوزستان بە بەرژەوەندی خۆی یەکالا بکاتەوە"[41].

ئەوەی شایانی باسە، میر محەمەد یەکەم کوردە کە ناوی لە خوتبەی ڕۆژانی هەینیدا خوێنرابێتەوە کە مانای خۆ بە خاوەن دەسەلات زانین دەگەیێنێت؛ ئەوە بوو لە ساڵی (٢٦٢ك./٨٧٦ز.) دا بە لەشکرێکی زۆرەوە چووە ناو شاری توشتەرەوە[42] و بڕیاری دا خوتبەی ڕۆژی هەینی بەناوی خەلیفەی عەباسی (المعتمد) و بەناوی یەعقووبی سەففار و لە دواییشدا بە ناوی خۆیەوە بخوێنرێتەوە[43].

لە ساڵی (٢٦٧ك./٨٨١ز.) دا میر محەمەد بە ناچاری لە گەڵ خیلافەتی عەباسی پێك هاتەوە و ڕێزی نەیارانی خیلافەتی بەجێ هێشت و گوێبیستی هەڕەشەی سەرکردەی عەباسیی ناسراو (الموفق طلحة) بوو و بەپارە و باج و دیاری و سەربارێکی زۆرەوە خۆی بەدەست (الموفق) ەوە دا، ئەویش لێی بورد و بۆ ناوچەکەی خۆی ناردەوە، تا بە ناوی خیلافەتەوە فەرمانڕەوایی بکات[44]؛ هەر بۆیە بۆ ساڵی دواتر (٢٦٨ك./٨٨٢ز.) عەمرۆی سەففاری (٢٦٥-٢٨٩ك./٨٧٩-٩٠٢ز.)، برای یەعقووب سەرکردەیەکی نارده سەر میر محەمەد، ئەویش بە ئاسانی دەستگیری کرد و بردی بۆ لای عەمرۆ[45].

سەبارەت بە هەرێمی لوڕستان، ژێدەرە فارسییەکان دەگێڕنەوە کە لە ساڵی (٣٠٠ك./٩١٣ز.) دا هەردوو برا، بەدر و ئەبو مەنسوور (بدر و ابو منصور) دەستەلاتی

---

(٤١) هەمان سەرچاوە، ٩/٧.

(٤٢) توشتەر: ئەم شارە، لە سەردەمی عەباسیدا، مەزنترین شاری خوزستان بوو. معجم البلدان، ٢٩/٢.

(٤٣) تأریخ الطّبري، ٩/٥٢٨.

(٤٤) هەمان سەرچاوە، ٩/٥٧٧ - ٥٧٨، الکامل، ٦/٣١.

(٤٥) تأریخ الطّبري، ٩/٦١١، الکامل، ٦/٤٠.

لوڕستانیان گرتەدەست و بوون بە فەرمانڕەوای هەرێمەکە، بەدر، لە لوڕستانی گەورە و، ئەبو مەنسوور لە لوڕستانی بچووک[٤٦]، لە پاش مردنیان کوڕ و کوڕەزا و نەوەکانیان درێژەیان بە حوکمڕانیی هەردوو پارچەی لوڕستان دا[٤٧].

لە دەڤەری واسیت و لە سەردەمی خەلیفە (المقتدر)، (٢٩٥–٣٢٠ک./٩٠٨–٩٣٢ز.) دا ئیسحاقی کورد (أبو الحسن إسحاق الكردي) دەرکەوت و ژمارەیەکی زۆری کورد لە دەورکۆبوونەوە، تا وای لێ هات مەترسی بخاتە سەر دامودەزگاکانی خیلافەتی عەباسی لەناوچەکەدا، بەلاّم لە ساڵی(٣١٨ک./٩٣٠ز.) دا، (علي بن بليق) کە بەرپرسێکی عەباسی بوو لە شاری واسیت، بە غەدر ئیسحاقی کوردیی دەسگیرکرد لە گەڵ چواردە کەس لە یاوەرانیدا و ڕەوانەی بەغدای کردن و لەوێ خرانە زیندانەوە[٤٨].

لە نێوان میرەکانی قۆناغی گەشەکردندا میر دەیسەمی کوڕی ئیبراهیم شادلویە (شادکوّیە) خودانی ئازەربایجان (٣١٥–٣٤٦ک./٩٢٧–٩٥٧ز.) ناودارترین و بەدەسەلاّتترین میری کوردە کە زۆربەی شار و ناوچەکانی ئازەربایجانی لە ژێر دەستدا بوو[٤٩].

ئیبراهیم شادلۆیەی باوکی دەیسەم بە نەژاد لە کوردەکانی دەڤەری بادینان بوو، یەکێك بوو لە سوارچاکەکانی (هارون بن عبدالله الشاري) سەرکردەی بزاڤی شوراتەکان لە ولاّتی مووسڵ و جەزیرە ، دوای شکستی شوراتەکان لە ساڵی (٢٨١ک./٨٩٤ز.) دا لەسەر دەستی سوپای عەباسی ، ئیبراهیم شادلۆیە لەگەڵ کۆمەڵێ لە شوراتەکان هەڵات و ڕووی کردە هەرێمی ئازەربایجان و لەوێ کچی سەردارێکی کوردی خواست، دەیسەم

---

(٤٦) حمدالله المستوفي القزويني، نزهة القلوب، تهران ١٣٢٩ هـ. ش.، ص. ٥٢٨، نطنزي، منتخب التّواريخ، تهران ١٣٣٦ هـ. ش.، قاضي غفاري، تأريخ نگارستان، تهران ١٣٨١، شرفخان البدليسي، الشّرفنامة، التّرجمة العربيّة بغداد ١٩٥٣، ص. ٢٠.

(٤٧) الشّرفنامة، ص. ٤٤ ـ ٤٦.

(٤٨) القرطبي، صلة تأريخ الطّبري، القاهرة ١٩٨٢، ص. ١٢٧ – ١٢٨.

(٤٩) ابن حوقل، صورة الأرض، ص. ٢٨٧، مسكويه، تجارب الأمم، ٢/٢٣، الكامل، ٢٨٦/٦.

بەرهەمی ئەو ژن خوازییە بوو[50].

دەیسەم کە گەورە بوو پەیوەندی کرد بە سوپای والی ئازەربایجانەوە (ابن ابی الساج) و بە پلەکانی سوپادا سەرکەوت تا بووە جێگری والی، کە (ابن ابی الساج) لە سالی (٣١٥ك./٩٢٨ز.) دا لە شەڕی قەرامیتەکاندا[51] کوژرا؛ دەیسەم لە شوێنی ئەو بوو بە والی ئازەربایجان[52].

کاتێك سەرکردە تورك و دەیلەمەکان هەروەها میرە حەمدانییەکان و فەرماندە سەربازییەکان هەموو هەرێم و ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی ئیسلامیان بۆ خۆیان پاوەن کرد و تەنها بەغدا و دەوروبەریان بۆ خەلیفە هێشتەوە؛ میر دەیسەمی کوردیش دریغی نەکرد و کۆنترۆلی هەرێمی ئازەربایجانی کرد و بۆ ماوەی سی سال درێژەی بە دەسەلاتی خۆی دا و بەری شالاوەکانی دەیلەم و خەزەری گرت[53].

وادیارە دەیسەم تەواو سەربەخۆ بووە، بە بەلگەی ئەوەی دراوی بەناوی خۆیەوە لێ داوە و تا ئێستاش چەند دانەیەکی پارێزراون.

لەپال دەیسەمدا میرێکی دی کورد هەر لە هەرێمی ئازەربایجان هەبوو بەناوی جەعفەری کوڕی شکۆیە کە خوداتی شاری سەلماس بوو و هێزێکی سەربازیی هەبوو لە "جەماوەری هۆزی هەزبانی"[54]؛ سەرچاوەکان باسی پێوەندیی جەعفەر بە دەیسەمەوە ناکەن بەلام دوور نییە سەر بەدەیسەم بوبێت و جێگری بوو بێت لە شاری سەلماس. بە بۆچوونی حوسێن حوزنی موکریانی جەعفەری هەزبانی یەکێك بوو لە سەرکردەکانی دەیسەم[55].

---

(٥٠) تجارب الأمم، ٢/٣٣؛ الكامل، ٦/٢٨٦.

(٥١) دەربارەی قەرامیتەکان بڕوانە: محمد عبدالفتاح عليان، قرامطة العراق، القاهرة ١٩٧٠.

(٥٢) ابن الأثير، الكامل،٦/١٨٦، ٢٨٦.

(٥٣) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: حسێن حوزنی موکریانی، کوردستانی موکریان، ڕەواندوز ١٩٣٨.

(٥٤) تجارب الأمم، ٢/٦٥.

(٥٥) کوردستانی موکریان، ل: ١٩٤ – ١٩٥.

هەروەها (ابن حوقل) (مر.٣٦٧ك. –٩٧٨ز.) کە ناوچەکانی ئازەربایجان گەڕاوە ئاماژە بۆ میر محەممەدی کوڕی حەسنەویی کورد دەکات کە شارەدێی (المحمدیة) ی بەدەستەوە بووە.[٥٦]

هەر لەم بارەیەوە مێژوونوسی نەناسراو دەڵێت قەڵای ماهکی لە سەردەمی خەلیفە (المعتضد)ەوە بە دەستی تورکمان وکوردەوەیە.[٥٧]

بەم جۆرە دەبینین لە ماوەی (٢٥٠–٣٣٤ك/٨٦٤–٩٤٦ز) دا ژمارەیەك قەوارەی سیاسی ناوخۆیی لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان دامەزران بە شێوەی قەڵادارێتی (اصحاب القلاع) ، سەردارێتی خێڵەکی، میرنشینی بچووکی نیوچە سەربەخۆ ، کە هەندێکیان هەر زوو لەناوبران و هەندێکی تریشیان بەرگەی ڕۆژگاریان گرت و بوونی خۆیان پاراست و بوونە بناغە بۆ میرنشینە سەربەخۆیەکانی سەردەمی بوەیهی (٣٣٤–٤٤٧ك./٩٤٦–١٠٥٥ز.)، میرنشینی دەیسەمی بووە ڕێخۆشکەر و بەردی بناغە بۆ دەرکەوتنی میرنشینی ڕەوادی لە هەرێمی ئازەربایجان و بە هەمان دەستوور میرنشینی عەیشانی بووە بەردی بناغە بۆ دەرکەوتنی میرنشینی حەسنەوی بەرزیکانی لە شارەزور و هەرێمی چیا (إقليم الجبال) .

### قۆناغی سێهەم:

### قۆناغی پێگەیشتن (سەردەمی بوەیهی (٣٣٤–٤٤٧ك./٩٤٦–١٠٥٥ز.)

بوەیهییەکان لە بنەماڵەیەکی دەیلەمی بوون، لە دانیشتوانی هەرێمی شاخاویی دەیلەمستان (إقليم الدّيلم)، کە هاوسنووری کوردستانە و ئاو و هەوایان چوونیەکە، هەرسێ کوڕی بوەیە (عماد الدولة علي و معز الدولة أحمد و ركن الدولة حسن) لە ماوەیەکی کورتدا توانییان کۆنترۆڵی هەرێمەکانی وڵاتی ئێران بکەن و لە ساڵی (٣٣٤ك./٩٤٦ز.) دا برای بچووك (معز الدولة أحمد) چووە ناو شاری بەغداوە و دەستی

---

(٥٦) العيون والحدائق، ص. ١/١١١.

(٥٧) صورة الأرض، ص. ٢٦.

گرت بەسەر هەموو دامودەزگاکانی خیلافەتی عەباسیدا و حکومەتی بوەیهیی دامەزراند[٥٨].

بوەیهییەکان هەر لە سەرەتای دامەزراندنی دەولەتەکەیانەوە، دەرکیان بەوە کرد کە ناتوانن بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ ناوچە شاخاوییەکانی کوردستان بەڕێوە ببەن و بە ڕێگەی سەربازیی دەسەڵاتی خۆیان بچەسپێنن بەسەر وڵاتدا و میرە کوردەکان دەستەسەر بکەن، لەبەر ئەوەی کوردستان -وەك زانراوە- وڵاتێکی شاخاویی سەختە، هیچ داگیرکەرێك بیری لەوە نەکردۆتەوە سەرپاکی وڵاتەکە داگیر بکات، بەڵکو بەوە ڕازی بوونە کە ساڵانە باج و خەراج لە سەرۆکە کوردەکان وەربگرن، شەرەفخانی بەدلیسی (مر.١٠١٠ك./١٦٠١ز.) کە خۆی لە بنەماڵەی میرانی بەدلیسە هەستی بەم ڕاستییە کردوە و بە ڕاشکاوی ئاماژەی بۆ کردووە[٥٩].

(ركن الدولة حسن) ی بوەیهی پتر لە براکانی شارەزای بارودوخی تایبەتی کوردستان بوو، لە نزیکەوە ئاگاداری میر و قەڵادار و سەرۆك هۆزەکانی کورد بوو ، هەستی بە ئازایی و لێوەشاوەییی هۆزەکانی هەرێمی چیا کردبوو، هەوڵی دەدا چاو لە چالاکی و زیدەگافییان بپۆشێ ئەگەر پێی بگوترایە کوردەکان ڕێگایان بڕی و مەڕ و ماڵانیان تالان کرد، یەکسەر بەرسڤی دەدایەوە: "قەیدی ناکا کوردەکان وەك ئێمە پێویستیان بە خواردنە"[٦٠]، هەردەم دووپاتی دەکردەوە: "دەولەتەکەم بەستراوە بە دەولەتی کوردانەوە" "دولتي مقرونة بدولة الأكراد"[٦١].

لەبەر ئەم هۆکارە و چەند هۆکارێکی بابەتی و مێژوویی دی کە وەك دەرئەنجامێکی گۆڕانکارییە ئابووری و کۆمەلایەتییەکانی جیهانی ئیسلامی هاتنە گۆڕێ ؛ لە سەرەتای

---

(٥٨) الكامل، ٣١٤/٢؛ بۆ زیاتر زانیاری لە سەر بوەیهییەکان بڕوانە: فاروق عمر، تأريخ العراق في عصور الخلافة العربيّة الإسلاميّة، بغداد ١٩٨٨.

(٥٩) الشّرفنامة، ص. ٢٨.

(٦٠) مسكويه، تجارب الأمم، ٢٨١/٢.

(٦١) هەمان سەرچاوە، ٢٨١/٢.

سەردەمی بوەیهییەوە ژمارەیەك میرنشینی گەورە و بە هێز دەركەوتن لە ناوچە جۆربەجۆرەكانی كوردستانداو كە هەندێكیان شێوەیەكی پێگەیشتوو و كامڵبووی قەوارە سیاسییەكانی پێش سەردەمی بوەیهی بوون.

لە دەستپێكی سەردەمی بوەیهی میر (ابن ابي الشوك الكردي) سەرۆكی هۆزی شازەنگانی (زەنگەنە) لە ناوچەكانی حەلوان و خانەقین و مەندەلی میرنشینێكی دامەزراند كە لەسەرچاوەكاندا بە میرنشینی بەنو عەنازی (بنو عناز) شازەنگانی ناسراوە [٦٢]، ئەم میرنشینە تا سەرەتای سەدەی (٦ك./١٢ز.) بەردەوام بوو، ناسراوترین میرەكانی بریتین لە:

١ـ ابو الفتح كوڕی عەناز (٣٨١ ـ ٤٠١ ك. / ٩٩١ ـ ١٠١٠ ز.).

٢ـ فارس كوڕی محەمەد كوڕی عەناز ناسراو بە (ابو الشوك) (٤٠١ ـ ٤٣٧ ك. / ١٠١٠ ـ ١٠٤٥ ز.).

٣ـ ابو الفوارس سورخاب كوڕی بەدر كوڕی موهەلهەل كوڕی محەمەد كوڕی عەناز (٤٦٧ ـ ٥٠٠ ك. / ١٠٧٤ ـ ١١٠٦ ز.).

لە ناوچەكانی شارەزوور و كرمانشاهان و دەینوەر – واتە لەباكووری میرنشینی شازەنگانی– میر حەسنەوەیهی كوڕی حوسێن سەرۆكی هۆزی بەرزیكانی لە ساڵی (٣٤٨ك./٩٥٩ز.) دا میرنشینی (حەسنەوییەی بەرزیكانیی دامەزراند، میر بەدری كوڕی حەسنەوەیه (٣٦٩–٤٠٥ك./٩٨٠–١٠١٤ز.) ناودارترین میری میرنشینەكەیە، خەلیفەی عەباسی القادر بالله (٣٨١–٤٢٢ك./٩٩١–١٠٣١ز.) لە ساڵی (٣٨٨ك./٩٩٨ز.) دا نازناوی (ناصرالدين والدولة) ی پێ بەخشی [٦٣].

میر محەمەد كوڕی شەداد كوڕی كورتەك (قرطق) لە خێڵی ڕەوادی – ڕەوەندی كە

---

(٦٢) بڕوانە: ابن الأثير، الكامل، ٦/٣٣٥، ٣٤٥؛ ٧/٣٥٥.

(٦٣) هەمان سەرچاوە، ٧/١٩٣، بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی میرنشینی بەرزیكانی و میرنشینی شازەنگانی بڕوانە: حسام الدّين علي غالب النّقشبندي: الكرد في الدّينور وشهرزور خلال القرنين الرّابع والخامس الهجريين، أطروحة ماجستير غير منشورة، جامعة بغداد، ١٩٧٥.

خێڵێکی هۆزی مەزنی هەزبانییە– لە ساڵی (٣٤٠ك./٩٥١ز.) دا میرنشینی شەددادیی لە هەرێمی ئاران–ئەرمینیای ئێستا– دامەزراند[٦٤].

هەر لە خێڵی ڕەوادی میرێکی دی دەرکەوت بە ناوی (ابو الهیجاء) محەمەد کوڕی حوسێن کە لە دەوروبەری ساڵی (٣٤٣ك./٩٥٤ز.) دا میرنشینی ڕەوادی لە هەرێمی ئازەربایجان دامەزراند[٦٥]. میر وەهسوزان کوڕی مەملان (٤١٦–٤٥١ك./١٠٢٥ – ١٠٥٩ز.) ناسراوترین میری ڕەوادییە، دەتوانین بڵێین میرنشینی ڕەوادی درێژەپێدان و بەردەوامیی میرنشینی دەیسەمییە لە ئازەربایجان.

دەرکەوتنی میرنشینێکی کوردی لە هەرێمی جەزیرە (دیاربەکر) دواکەوت بۆ نیوەی دووەمی سەدەی (٤ك./١٠ز.)، بێ گومان ئەمەش پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی هەبوو بە هەبوونی میرنشینی حەمدانی لە ناوچەکەدا کە دەستی گرتبوو بەسەر هەموو هەرێمی جەزیرە و دەڤەری هەکاری و بووبووە بەربەستێك لە پێش گەشەکردنی قەوارە سیاسییە بچووکەکانی ناوچەکە، میر بادی کوڕی دۆستەکی حاربوختی (باد بن دوستك الحاربختي) (٣٧٢–٣٨٠ك./٩٨٣–٩٩٠ز.) دامەزرێنەری میرنشینی دۆستەکی – مەروانی، بە زەبری هێز و پاش چەند شەڕ و پێکدادانێك لەگەڵ حەمدانییەکاندا ئەمجا توانی پاشماوەیان لە ناوچەکە دەربکا و دەسەڵاتی خۆی بچەسپێنێ، هەر بە دەستی ئەوانیش لە ساڵی (٣٨٠ك./٩٩٠ز.) دا لە شاری مووسڵ بە کوشت چوو[٦٦].

پاش کوژرانی باد، خوارزاکانی، ئەبو عەلی حەسەن، سەعید ناسراو بە (ممهد الدولـة)، ئەحمەد کوڕانی مەروان کوڕی کاکی حاربوختی (مروان بن كك الحاربوختي) کشانەوە بۆ شاری حسنکێفا (حصن كيفا) و میرنشینی مەروانییان دامەزراند و درێژەیان بەدەسەڵاتی

---

(٦٤) بڕوانە: إسماعيل شكر رسول، الشَّدَّاديّون في بلاد أران، أطروحة مكاجستير، غير منشورة، جامعة صلاح الدّين، أربيل ١٩٨٩.

(٦٥) بڕوانە: حسام الدّين علي غالب النّقشبندي، أذربيجان، أطروحة دكتوراه غير منشورة، جامعة بغداد ١٩٦٤.

(٦٦) الفارقي، تاريخ الفارقي، القاهرة ١٩٥٩، ص. ٥٧ – ٥٨، الكامل، ٧/١٤٧ – ١٤٣.

خالْیان دا[٦٧].

برا بچووکەکەیان ئەحمەد ناسراو بە (نصرالدولة) بەناوبانگترین و گەورەترین کەسایەتیی سیاسیی کوردە – دوای سەلاحەدین ئەیوبی– لە سەدە ناوئجییەکاندا، بۆ زیاتر لـە نیو سەدە (٤٠١–٤٥٣ك./١٠١٠–١٠٦٠ز.) فەرمانڕەوا بوو، وەك پادشا وابوو، دەرباری جمەی دەهات لە شاعیران و سترانبێژان و نووسەران، لە سەردەمی ئـەودا دەسـەلاتی سیاسیی کورد گەیشتە لوتکە، دەوڵەتە ئیقلیمییـەکان، خیلافـەتی عەباسیی سوننی و دەوڵـەتی بوەیهی لـە بـەغدا، خیلافـەتی شـیعیی فـاتمی لـە میـسـر، دەوڵـەتی بـیزەنتی لـە قوستەنتینییە –ئەستانبوولی ئێستا– هەوڵیان دەدا پێوەندی لەگەڵ ببەستن و بـۆ لای خۆیانی رابکێشن، هەر لەگەڵ دەست بـەکاربوونی لـە سـاڵی (٤٠١ك/١٠١٠ز) دا، نوێنـەری هـەر چوارلایـان بـە پـارە و دیاریبیـەکی زۆرەوە خۆیـان گـەیاندە خزمـەتی لـە شـاری حسنكێفا، نێردراوی خەلیفـە (الحاكم بـامرالله) ی فـاتمی (٣٨٦–٤١١ك./٩٩٦–١٠٢٠ز.) نازناوی (عزالدولة ومجدها ذي الصرامتين) ی پێ بەخشی و نێردراوی خەلیفە (القـادر بـالله) ی عەباسی (٣٨١–٤٢٢ك./٩٩١–١٠٣١ز.) نازناوی (نصرالدولة وعمادها ذي الصرامتـين) ی پێ بەخشی[٦٨].

ئەم پێنـج میرنشینە کاروبـاری زۆربـەی ناوچـەکانی کوردستانیان بـەڕێوە دەبـرد، خاوەنی دامودەزگای سیاسـی، سـەربازی، دارایـی، کـارگێری و قـەزائیی خۆیـان بـوون. خەلیفەی عەباسی دانی بە هەموویاندا دەنا، میرەکان دراویان بە ناوی خۆیانەوە لێ دەدا پاش لێدانی ناوی خەلیفەی عەباسی و ئەمیری بوەیهی لەسەر دراوەکە[٦٩]، لە خوتبـەی ڕۆژانی هەینیدا ناویان لەدوای ناوی خەلیفـەوە دەهـات و دوعایـان بـۆ دەکرا، گەڕۆکی

---

(٦٧) تأريخ الفارقي، ص. ٥٩ – ٦١، الكامل، ٧/١٤٣ – ١٤٤.

(٦٨) تأريخ الفارقي، ص. ١٠٨ – ١٠٩. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: عبدالرقيب يوسف، الدولة الدوستكية في كردستان الوسطى، بغداد ١٩٧٢.

(٦٩) عبدالرقيب يوسف، حضارة الدولة الدوستكية ، بغداد ١٩٧٥، ص. ١٦٥ – ١٨٦، حسام الدين النقشبندي، الكرد في الدينور و شهرزور، ص. ٣٠٤ – ٣١٠.

شیعی ناسـری خەسـرەو (مـر.٤٨١ك./١٠٨٨ز.) کـە لـە نیـوەی یەکـەمی سـەدەی (٥ك./١١ز.) دا گەشتێکی دوور و درێژی بە جیهانی ئیسـلامیدا کـردووە و بـە شـارەکانی کوردستاندا گوزەری کردوە، باسی ئەوە دەکات کە ناوی میر وەهسوزانی کوڕی مەملانی ڕەوادی لە خوتبەدا بەم شێوەیە دەهێنرێت "الأمير الأجل سـيف الدولـة و شـرف الملـة أبـو منصور و هسوذان بن محمد مولى أمير المؤمنين" [٧٠] ، هەروەها ناوی میر ئەحمـەدی کـوڕی مەروان (نصرالدولة) بەم شێوە دەهێـنرێت "الأمـير الأعظـم عـز الإسـلام سـعد الديـن نصـر الدولة و شرف الملة ابو نصر احمد" [٧١].

لەبـەر ڕۆشـنایی ئـەم ڕاستییانەدا دەشـێ بڵێـین میرنشـینەکانی کوردسـتان لـە سەردەمی بوەیـهیدا تـەواو پێگەیشـتن و تـا ڕادەیـەك خـاوەن ویسـتی سیاسـیی خۆیـان بـوون، بـە تایبـەت میرنشـینی مـەروانی لـە هـەرێمی جـەزیرە کـە لـەم لایەنـەوە لـەو میرنشینانەی وا لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا دەرکەوتن هیچ کەمتر نەبوو.

هەر چەندە میرنشینی حەسنەوی پێش وەخت لـە نـاو چـوو (سـاڵی ٤٠٦ك./١٠١٥ ز.)[٧٢] و میرنشینی بەنو عـەنازی شـازەنگانی دووچـاری لاواز بـوون و دووبـەرەکیی نـاو خۆیی بوو (ساڵی ٤٣٨ك./١٠٤٦ز.) ، کـەچی سـێ میرنشـینەکەی تـر تـا نیـوی دووەمـی سـەدەی (٥ك./١١ز.) مانـەوە، کـاتێك کەوتنـــە بــەر شـاڵاوە بەرفراوانـەکانی سـوڵتان مەلیکشای سەلجووقی (٤٦٥-٤٨٥ك./١٠٧٢-١٠٩٢ز.) و یەك لە دوای یـەك ڕووخێـنران، ئەم بابەتەش لێکۆڵینەوەیەکی تایبەت هەڵدەگرێت.

---

(٧٠) سفرنامه، رحلة ناصر خسرو، الرّياض١٩٨٣، ص. ٣٠.

(٧١) هەمان سەرچاوە، ص. ٣٦.

(٧٢) ابن الأثير، الكامل، ٧/٢٨٠.

## ئەنجام

لە میانی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا دەرکەوت کە دەسەڵاتی سیاسیی کورد لە سەردەمی عەباسیدا بە سێ قوناغ: سەرهەڵدان، گەشەکردن، پێگەشتندا تێپەڕیوە، لە نیوەی یەکەمی سەدەی (٣ك./٩ز.) دا بارودۆخی سیاسیی نالەباری دەوڵەتی عەباسی بووە ئەگەری جیابوونەوەی هەرێمەکان لە دەسەڵاتی ناوەندیی عەباسی، ئەوە بوو لە هەندێك دەڤەری کوردستاندا دەسەڵاتدار و خاوەن قەڵاکانی کورد بۆ یەکەم جار لە مێژووی ئیسلامیدا دەرکەوتن و شارێك یان قەڵایەك یان ناوچەیەکی بچووکی کوردستانیان بەڕێوە دەبرد، لە نیوەی دووەمی هەمان سەدەدا بە هۆی لاوازیی خەلیفەکانی عەباسی و برەوسەندنی بزاڤە بەرهەڵستەکان (الحركات المعارضة)، زنجەکان، قەرامیتە، شوراتەکان (الخوارج)، لە پاڵ چەند هۆکارێکی ناوخۆییی کوردستاندا، ژمارەی دەسەڵاتدارە ناوخۆییەکانی کوردستان زۆرتر بوو، تا گەلێ ناوچەی کوردستانی گرتەوە و سنووری دەسەڵاتیشیان بەرفرەهتر بوو .

لە سەردەمی بوەیهیدا (سەدەی ٤ك./١٠ز.) بە هۆی سیاسەتی لا مەرکەزیی بوەیهییەکانەوە، لەسەر بناغەی ئەم دەسەڵاتدارییە ناوخۆییانەدا، پێنج میرنشینی گەورە دەرکەوتن و رووبەرێکی بەرفراوانی کوردستانیان بەڕێوە دەبرد، ئەم میرنشینانە خودان دامو دەزگای سیاسی، سەربازی، کارگێڕی، دارایی و قەزائیی خۆیان بوون، تا لە نیوەی دووەمی سەدەی (٥ك./١١ز.) کەوتنە بەر شالاوی سەلجووقییەکان و یەك لە دوای یەك لە ناو بران.

## سەرچاوەكان

**يەكەم: بە زمانى عەرەبى**


- ابن الاثير، عزالدين ابو الحسن علي بن ابي الكرم محمد الجزري (ت ٦٣٠هـ/١٢٣٣م).

١- الكامل في التأريخ ، دار الفكر ، (بيروت ١٩٧٨) .

- الازدي ، أبو زكريا يزيد بن محمد بن أياس (ت ٣٣٤هـ/٩٤٥م) .

٢- تأريخ الموصل ، (القاهرة ١٩٦٧) .

- البدليسى ، الامير شرفخان بن شمس الدين الروذكى (ت١٠١٠هـ / ١٦٠١م) .

٣- الشرفنامة ، ترجمة الى العربية محمد جميل بندى الروْذبيانى ، (بغداد ١٩٥٣).

- البلاذري ، أحمد بن يحيى بن جابر (ت٢٧٩هـ/٨٩٢م).

٤- فتوح البلدان ، (القاهرة ١٩٥٧) .

- ابن حوقل ، أبو القاسم محمد بن علي النصيبي (ت ٣٦٧هـ/٩٧٨م) .

٥- صور الأرض ، (بيروت ١٩٧٩).

- ابن دحية ، أبو الخطاب عمر بن حسن بن علي (٦٣٣هـ/١٢٣٦م) .

٦- النبراس في تأريخ خلفاء بني العباس ،(بغداد ١٩٤٦).

- إبن شداد ، عزالدين أبو عبدالله محمد بن علي بن ابراهيم (ت٦٨٤هـ/١٢٨٥م) .

٧- الاعلاق الخطيرة في ذكر امراء الشام والجزيرة ،القسم الثالث، (دمشق ١٩٧٨) .

- الطبري ، ابو جعفر محمد بن جرير بن يزيد (ت٣١٠هـ/٩٢٣م) .

٨- تأريخ الرسل و الملوك (تأريخ الطبري) ، (القاهرة ١٩٧٧) .

- عبدالرقيب يوسف

٩- تأريخ الدولة الدوستكية في كردستان الوسطى ، (بغداد ١٩٧٢) .

١٠- حضارة الدولة الدوستكية ، (بغداد ١٩٧٥) .

- ابن العبري ، أبو الفرج غريغوريوس بن هارون الملطي (ت٦٨٥هـ/١٢٨٦م) .

١١- تأريخ الزمان ، نقله الى العربية الاب اسحق ارملة ، (بيروت ١٩٩١) .

- الفارقي ، أحمد بن يوسف بن علي بن الازرق (ت٥٧١هـ/١١٧٧م)

١٢- تأريخ الفارقي ،(القاهرة ١٩٥٩) .

- القرطبي ، غريب بن سعيد (ت٣٦٦هـ/٩٧٧م) .

١٣- صلة تأريخ الطبري ، (القاهرة ١٩٨٢) .

- القزويني ، ابو زكريا محمد بن محمود (ت٦٨٢هـ/١٢٨٣م) .
١٤- اثار البلاد وأخبار العباد ، (بيروت ١٩٦٠).
- لسترنج ، كي
١٥- بلدان الخلافة الشرقية ، الترجمة العربية ، (بغداد ١٩٥٤) .
- المائي ، انور
١٦- الاكراد في بهدينان ، ط٢ ، (دهوك ١٩٩٩) .
-المجمع العلمي السرياني .
١٧- المجلد الرابع ، (بغداد ١٩٧٦) .
- مسعر بن مهلهل ، ابو دلف مسعر بن مهلهل الخزرجي (ت٣٩٠هـ/١٠٠٠م) .
١٨- الرسالة الثانية ، (القاهرة ١٩٧٠) .
- المسعودي ، ابو الحسن علي بن الحسين بن علي (ت٣٤٦هـ/٩٥٧م) .
١٩- التنبيه والاشراف ، (بيروت ١٩٨١) .
٢٠- مروج الذهب ومعادن الجوهر ، (بيروت ١٩٨٦).
- مسكويه ، ابو علي احمد بن محمد (ت٤٢١هـ/١٠٣٠م) .
٢١- تجارب الأمم ، (القاهرة ١٩١٤) ، اعادت طبعه مكتبة المثنى ، (بغداد (د.ت)) .
- مؤلف مجهول
٢٢- العيون والحدائق في اخبار الحقائق ، الجزء الرابع ، (دمشق ١٩٧٣) .
- ناصرى خسرو ، معين الدين ناصرى خسرو المروزي (ت ٤٨١هـ /١٠٨٧م) .
٢٣- سفرنامة (رحلة ناصرى خسرو ) ، الترجمة العربية ، (الرياض ١٩٨٣) .
- الواقدي ، ابي عبدالله بن عمر (ت٢٠٧هـ/٨٢٣م).
٢٤- فتوح الشام ، دار الجيل (بيروت (د.ت)) .
- ياقوت الحموي ، شهاب الدين ابو عبدالله ياقوت بن عبدالله الرومي (ت٦٢٦هـ/١٢٢٩م) .
٢٥- معجم البلدان ، (بيروت ١٩٧٩) .
- اليعقوبي ، احمد بن واضح بن جعفر (ت بعد ٢٩٢هـ / ٩٠٥م) .
٢٦- البلدان ، (النجف الاشرف ١٩٥٧) .
٢٧- تأريخ اليعقوبي ، (بيروت (د.ت)) .

**دووەم: بە زمانی فارسی:**

–حمد الله المستوفي ، حمد الله بن ابي بكر بن محمد القزويني (ت ٧٥٠هـ/١٣٤٩م).

٢٨– تأريخ كزيدة ، (تهران ١٣٣٩هـ.ش).

– قاضي غفاري ، قاضي احمد بن قاضي محمد بن نجم الدين غفاري قزويني (ت ٩٧٥هـ/١٥٦٧م) .

٢٩– تأريخ جهان ارا (تهران ١٣٤٣هـ.ش) .

– نطنزي ، معين الدين (ت بعد ٨١٧هـ/١٤١٤م) .

٣٠– منتخب التواريخ معيني ، (تهران ١٣٣٦ هـ.ش) .

**سێهەم: بە زمانی کوردی**

– ئەولیا چەلەبی (م١٠٦٧ك/١٦٥٦ز) .

٣١– سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی ، وەرگێرانی لە تورکی‌یەوە سەعید ناکام ، (بەغدا ١٩٧٩) .

– موکریانی ، حسین حوزنی

٣٢– کوردستانی موکریان ، (رواندوز ١٩٣٨) .

## ملخص البحث

د. زرار صديق

## الإمارات الكردية خلال العصر العباسي
## - مراحل ظهورها ونموها -

كانت هناك خلال العصر العباسي خمس إمارات كردية كبيرة معروفة ومعترف بها من قبل الخليفة العباسي، أقامها ألأمراء والزعماء الكرد المحليون، وظهرت هذه الإمارات نتيجة للتطورات السياسية والتحولات الاقتصادية والاجتماعية التي شهدتها الدولة العباسية إلى جانب توفر شروط قيام الإمارات المحلية في الأقاليم الكردية ، حيث القبائل الكردية المتنفذة والمناطق الجبلية الوعرة والإمكانات الاقتصادية الكافية. وقد مرت الإمارات الكردية بثلاث مراحل، الظهور، النمو، النضوج، فخلال النصف الأول من القرن (٣هـ/٩م) ، ظهر أوائل الامراء والحكام الكرد المستقلون بمدينة أو قلعة في الاقاليم الكردية ، وفي النصف الثاني من القرن نفسه ، ازداد عددهم وتوسعت مناطق نفوذهم وتوزعوا في مختلف المناطق الكردية ، وخلال العهد البويهي (القرن ٤هـ/١٠م) ظهرت خمس امارات كردية مستقلة وشبه مستقلة كانت صورة متطورة وموسعة للامارات الكردية الصغيرة القائمة خلال عصر ماقبل العهد البويهي ، وكانت لها نظم ومؤسسات سياسية وعسكرية وادارية ومالية وقضائية . وظلت تدار وتحكم مناطق نفوذهاحتى تعرضت خلال النصف الثاني من (القرن٥هـ/١١م) لحملات السلاجقة واسقطت واحدة تلو الاخرى.

## *Abstract*

### *Emergence and Development of Kurdish Emirates during the Abbassid era*

*Dr. Zirar Sdeeq*

During Abbassid era, there were five eminent Kurdish emirates, recognized by the caliph. These emirates were founded by Kurdish chiefs, as a result of the political changes and the economic and social evolution that took place within the Abbasid state along with conditions enhancing the emergence of those emirates.

These emirates grew according to a fixed pattern of: emergence, development and maturity. During the first half of the third century (9 th A.D.), some Kurdish independent emirates were founded round a castle or in other Kurdish regions and during the second half of the same century, these emirates expanded and the influence of their princes increased. In the fowrth century (10 th A.D.), during the Boayhi era, five independent and semi - independent emirates emerged. They had their own political, military, judicial and financial, systems. These emirates were ruled by local emires till the second half of the fifth century (11 A.D.), when they were the target of Saljooki campaigns and collapsed one after another.

# ئەكادیمیا ، فەرهەنگستان، زاراوەڕۆنان
# كۆڕی زانیاری كورد - كۆڕی زانیاری كوردستان

شوكور مستەفا

**ئەكادێمی و ئەكادێمیا:**

ئەكادیمی - نێوی كۆمەڵێكی زۆر و زەوەند لە مەڵبەند و دەزگا و كۆمەڵەی لێوەكۆڵینی زانستەكییە. واژەی ئەكادیمی لە نێوی ئەكادیمۆس، قارەمانی ئەفسانە كۆنەكانی یۆنانێرا كەوتووەتەوە. لە سەدەی ٤ ی پێش لەدایك بوونی عیسای مەسیحدا، دە نزیك ئاتێن، لەو جێیێ كە هەر بە نێوی هەمان قارەمانەوە نێونراوە، پلاتۆن دەرزی بە شاگردانی خۆ دەگوتەوە؛ لەبەر هەندێ فێرگەكەی بە ئەكادێمی نێونراوە. لە سەدەكانی ناویندا، لە وڵاتانی ڕۆژهەڵات، برێ دەزگای ئەكادێمی بابەت: لە بەغدایێ "دار الحكمة" (سەدەی ٩)، لە خوارەزم "ئەكادێمیی مەئموون" (سەرەتای سەدەی ١١) و بە تەنیشت ڕوانگەكانی مەراغە (سەدەی ١٣) و سەمەرقەندەوە (سەدەی ١٥) برێ كۆمەڵەی زانست و فەلسەفە نێوویانگیان ڕۆیشتووە. لە سەدەكانی ١٥ ـ ١٦ دا، لە ئیتالیا بەو كۆڕ و كۆمەڵانەی كە دەگەڵ زانستە مرۆڤەكییەكاندا (لە بنەمادا دەگەڵ زمان و ئەدەبیاتدا) سەرگەرم بوون، ئەكادێمی گوتراوە.

بەڵام هەر لە نوای سەدەی ١٧ ەوە ئەو كۆڕ و كۆمەڵانەی كە بە كێشە و گرفتەكانی خۆرسكەوە خەریك بوون، بە كار براوە. هەروا لە نیوەی سەدەی ١٧ ەوە، لە زۆر وڵاتی جۆێ جۆێدا، چەندین ئەكادێمی دامەزراون و بەمە چەندین بوار لە زانستەكان تێك ئێخراون. دە ساڵی ١٧٢٤ دا ئەكادێمیی پێتەربورگ لە ڕووسیا دامەزراوە. ئەوڕۆ لە زۆرینەی وڵاتانی جیهاندا، ئەكادێمیگەلێ لە گۆتێن ئەكادێمیی مەیدانی، هاتوونە گۆڕێ (ئەكادێمیی نەتەوەكیی وڵاتانی یەكگرتووی ئەمەریكا، كۆمەڵەی پادشاییی لۆندەرە و ئامۆژگای فەرەنسا و هتد..) زۆربەی ئەكادێمیییەكانی هەندەران، تا ئێستا كۆمەگ و

یارمەتیی بەرچاوەکیی وا، کە بەر دڵ بگرێ، دە کاری زانستییەکانیاندا بۆ فەراهەم نەکراوە، تەنانەت چالاکیی ئەکادێمییەکان لە بواری وتوویژ لەبارەی کێشە و گرفتەکانی زانستدا و ئەرشیفبەندی کردن و شەن و کەوکردنی بەرهەمەکانیانەوە، بە پاداشت و سەرقەڵەمانە و شتی لەو جۆرە بابەتانە، تێن و گوڕیان وێ دەدرێن و کاروباریان بە ڕێوە دەچێ.. جگە لەمانە، لە هەندەران بە برێ دەزگا و مەڵبەند و کۆڕ و کۆمەڵانی دیکەش کە بە کاری زانستانەوە سەرگەرمن، هەر ئەکادیمی دەگوترێ.

بە ڕاستی، کەڵکەڵەی ئەکادیمی دامەزراندن - پیاو هەق بڵێ - هەر لەپاش لەنگەرگرتنی دەسەلاتی عەرەبی موسڵمان لە شام و کووفە و واسیت و بەسرە و ڕەی و بەلخ و بوخارا و سەمەرقەند و بەغدا و پاشانەکێ لە باکووری ئەفریقا و ئەندەلوس، کە تا نزیکەی سەدەیەکیش زمانی ڕەسمیی کاروباری دەوڵەت بەڕێوەبردن، لە شامێ بە ڕۆمی و لە میسر بە قیپتی و لە مێزەپۆتامیا و فارس و ئازەربایجان بە ئارامی و سوریانی و فارسی بوو، وردە - وردە لە ئاکامی گەشەساندنی سەرومڕی پێداویستەکانی ڕۆژانەی ژیاندا، وەچەکەرە کەوتووە و حوکوومەتی ئیسلام، ناچار دە هەمبەری لێشاوی ئەو پێداویستانەدا، زانا و پسپۆڕ و لێزانی لە دەوری خۆ خڕ کردووەتەوە: زانا حەڕانییەکانی نسێبین و حەڕان، سوریانەکانی مێزەپۆتامیا، کوردەکانی بە فەرهەنگی وان ڕاهاتوو لە دەور و بەری هەردوو چۆمی تیر (دیجلە) و فرات لە وەرگێڕانی کەلەپووری یۆناندا دەوری گرینگیان گێڕاوە.. بە سەدان، زاراوەی نوێیاویان لە فەلسەفە، زانست، هونەر، کۆمەڵناسی، مێژوو، جوغرافیا، زمان، ئەدەبیات، ستێرناسی، کەلام و شەرع و هتددا، هێناوەتە گۆڕێ. ئیسحاقی کوڕی حونەین (م.٢٩٨ک) و مەتای کوڕی یۆنس قەنائی (م. ٣٢٩ ک) و سابیتی کوڕی قورەی حەڕانی (م. ٢٨٨) و عەبدوڵلای ڕووربێه (ڕۆژبەیانی) ی کوڕی موقەففەع (م. ١٤٢ک) و کوڕی میسکەوەی (م.٤٢١ ک) و کوڕی باجە (م. ٥٣٢ ک) و کوڕی شینە، ین سینا (م. ٤٢٨ ک) و کوڕی توفەیل (م. ٥٩٢ ک) و هتد. کەسانێکن لە بواری وەرگێڕان و زاراوە داناندا لە سەرلەبەری زانستەکاندا، کەس دەسکی لە دوو نەکردوون.

ئەگەر لە فەرهەنگ و کەشـکۆلْ و پـەرتووکی جۆر بە جۆری عـەرەبی بنۆڕین، بە سەدان زاراوەی هەر یەکە لە زمانێ، هەر یەکە لە زانستێ، هەر یەکە لە هونەرێ و هتد.. مان بەرچاو دەکەوێ. لە کتێبی "الدّخیل فی العربیّة" و "شفاء الغلیل" و "المزهر" ی سیووتی و چەندین کتێبی دیکە، بنۆڕی هـەنگێ لـەبۆت ڕوون دەبێتـەوە کـە زمـانی عەرەبی دە سەرەتای دامەزرانی دەوڵەتی ئیسلامیدا، دە هەمبەر هـەزاران زاراوەی جۆر بە جۆری سـەرلەبەری زانسـت و فەلسـەفە و هونـەرەکاندا چەندە و تـا چ ئەندازەیـەك کەنەفت و دەستەپاچە بووە؟، بەلام سرشتی مـرۆ و کۆمـەڵی مـرۆ، هەمیشـە ـ بتـەوێ و نەتەوێ ـ بەرەو پەرەساندن و گەشەکردن و فراژی بوون هـەنگاوی هـەڵێناوە و ژیـان لـە گۆڕان و گۆڕانکاریی سەرومڕ، هێندەی تـرووکـەیێ نەوەسـتاوە و دە هـەموو هـەنگاوێکدا پێناوی بەرهەست و نابەرهەستی هێناوەتە گـۆڕێ و هـەر یەکـەش دە فەرهـەنگی زمـانی مرۆدا، زاراوەی پڕ بە بـاڵای خـۆی ویسـتووە و کارەکـە لـە ڕانـەوە نـەهاتووە و بـە بـێ ئەمەش کار سەر ناگرێ.. ئەوەتا، وەك دەبینینەوە، سەرلەبەری وڵاتانی سەرزەوین ، لـە هەمبەر لێشاوی گۆڕانکارییەکانی دنیای فەلسـەفە و زانست و هونـەردا، بـە هـەموو لـك و چڵ و پۆپەکانیەوە، بە دامـەزراندنی ئـەکادیمی و ئامۆژگـا و ئـەزموونگاوە سـەرگەرمن و هـەر چـەندیش دەکـەن پـێ ڕاناگـەن، چ جای نەتەوەیـەکی تـازە دە دنیـای باخەبـەردا چاوپشـکوتووی وەك کـوردی لێ قـەوماو، کـە دژمنـانی بـێ ویژدانـی، هـەرگیز دەرفـەتی پشـوودانی نـەداوە و ڕوزەبڕی کـردووە و لـە کـاروانی پێشـکەوتنی وەدوا ئێخسـتووە.. فەرموو ئەوە دەوڵـەتی فەرەنسا ـ بەش بەوەندەی من بیسـتوومە ـ شـەش ئکـادێمیی هەن:

١ـ ئەکادێمیی زانستەکان

٢ـ ئەکادێمیی زانستەکانی ئاکاری و سیاسی

٣ـ ئەکادێمیی فەرەنسا

٤ـ ئەکادێمیی بەڵگەنامە و دەستاوێژ و ئەدەبیات

٥ـ ئەکادێمیی گەنکوور

٦ـ ئەكادیمیی هونەرەجوانەکان

هەروەها رووسیا ئـەکادیمیی زانستەکانی هـەس، ئینگلستان و ئوتریش و ئاڵمان و هتد.. کێیەیان بێ ئەکادیمین؟ دەوڵەتانی عەرەب: لە شام، لە عەممان، لـە قاهیرە، لـە ئەرپیبات (الرباط) و هتد..(المجمع اللُغويّ" و "المجمع العلميّ" خۆیان هەن.. ئێران هـەر لـەمێژە فەرهەنگستانی بـۆ خـۆی دامـەزراندووە. تورکیـە هـەر لـەو جـۆرە.. بگـرە دەوڵەتەکانی ئازەربایجان و ئوزبەکستان و تاجیکستان و قرغزستان و قازاخستان، هەر یەکە ئەکادیمیی زمان و ئەدەبیات و زانست و چی و چیی نییە؟!

زانایانی بە رەگەز و بنەچەکە کورد و تورك و فارس و سوریانی و ئارامی و هینـدی و هتد.. دە مەیدانی زاراوپێناندا، گاڵەیان کردووە. ئەوانە هەروا نەهاتوون لە خۆڕا مل لـەو کارە بنێن، بـەڵکو لـە دەستوور و یاسا و ڕێسای بـەرینانی خۆیـان نوارییـە و چـەندین ڕێسای سەر بە زمانی عەرەبییان پشکنیوە و ئەوی لـە یـاریووە، هـەڵیان هێنجاوە و لـە سەر ئەو ڕێسا و یاسا خۆماڵییانە زاراوەیان ڕۆناوە و دارشتووە. فـەرموو ئێمـە، کوردی هەزار چەندمان زاراوە بۆ ئەم لێشاوە زانستانە دەستەبەر کردووە، کە ژمارەیان لـە ١٤٤ زانست تێ پەڕیوە.

زاراوەزانان، هەر وەکو لە بەراییەوە گوتم، بـەوە دەگوتـرێ کـە دەستـەیێ، تـاخمێ، بڕێ، گرۆیێ، تیرەیەکی تایبەت بێنن لەسـەر دانـان و بـەکارهێنانی واژەیـەك ڕێك کـەون (أقرب الموارد) ، یا بە عورف، بە بەندویاو لەسەر شتێ بۆ دیاری کردنی مانـا و واژەیـێ، غەیری ئەو مانایەی کە دە بنیچەدا بۆی داندراوە، ڕێك کەون (مؤيد الفضلاء)، یا واژەیـێ کە کۆمەڵێ بۆ خۆی مانایەکی، غەیری مانای ئەسڵی و مانای بۆ داندراوی وی، دای نـابێ (نـاظم الأطبّـاء)، یـا واژەیـێ کـە لـە نێـوان تـیرەیێ لـە نەتەوەیـەك، مانایـەکی بڕیارلەسەردرياگ، ببەخشێ، یا بەرەیێ بێ لە زانستێك، هونەرێکدا لە دانانی واژەیـێ بـۆ مانایەکی تایبەت بەو زانستە یا هونەرە، دەگەڵ یەکدیدا ڕێك کەون، کە ئـەو واژەیـە، دە زمـاندا مانایەکـەی ئەوەیـە و دەو زانسـتەدا شـتێکی دیکەیـە. خـاوەنی کەشـشـاف دەفەرموێ: عورفـی تایبـەت ئەوەیە کـە خـەڵکێ بێـن نـاوێ، پـاش ڕاگوێزتنی لە مانا

کۆنەکەیەوە، بۆ مانایەکی تەرت و نویٚ بەکاریبێنن، یا پێوەندیی دوو شتان، چ لە گشت و تایبەت و چ لە هاوبەشی و چ لە وێکچووندا، دووەمیان بە مانایەکی تایبەتی یەکەمیان بەکاریەریٚ (تعريفات)، ئەمەش هەر مەجازی خواستنەوە و مەجازی ئەقلی دەگرێتەوە: ئەگەر پیاو سەروساختی خزمایەتیی واژەکان لە دەلالەت کردندا بناسێتەوە، وەك پێوەندیی "سەبەب و موسەببەب"، "مەکان و مەکین" رابردوو و ئایندە"، "جوزئییەت و کوللییەت"، لازمییەت و مەلزوومییەت، ئالییەت، گشت و تایبەت، رەگەز، بری و پەی ئامەد، خوێشاوەندی، سیفەت و مەوسووف، موزاف و موزاف ئیلەیهی، رێزلێنان، دراوسێتی، دووفاقی، غالبییەت و وێکچوون، یا جۆری کینایەت (مێتافۆرە) ەکان، ئیدیۆمەکان بە وردی دەرك بکا، بۆ زاراوە سازی دانامێنێ،، بەلاّم کاتیٚ خوێندەواری زمانیٚ لە زمانەکان وە بن لێشاو و گۆتاوەڕۆی زوانێکی دیکەوە دەکەویٚ و مجێز و سەلیقەی دەشێویٚ، یان دەژاکیٚ، دیارە زەینی زمانە خۆڕسکەکەی خۆی کوێر دەبیٚ و دەستەپاچە و مجرۆ و موزمەحیل دادەنیشیٚ و وەك کوردی دەسخەڕۆی لە هەردوو دینەکەی لیٚ بەسەر دیٚ. زاراوەدانان کاری هەر کەسیٚ نییە و دەبیٚ لەو زانستانەدا کە زاراوەیان بۆ دادەنیٚ، مەلەوانی چا بیٚ. خۆ کارەکە بەوەندە پێك نایە کە هەر بابایەك هات گوتی ـ هەر لەبەر هێندیٚ سمێلی سوورە ـ هەمزاغایە. ئەبو تاهیری مەجدی فەیرووزابادی کە بە ڕەگەز ئێرانی نەژادە، جارێکیان لە جەنگەی هەلّپە و لە دووی واژەی عەرەبی گەڕاندا، بە عارەبە زنیٚ، لە جیاتیی وەی، أطفئي السّراج بێژیٚ: "دەفەرمویٚ: "اقتلي السّراج.. " ئەمە چ دەگەیەنیٚ، کەسی مامی؟ ئەمە ئەوە دەگەیەنیٚ، کە ئەوەی زاراوە لە زمانێکدا دادەنیٚ، ئەگەر بە زگماك زمانەکە زمانی خۆی بیٚ، چێتێکە و ئەگەر ئی خۆی نەبیٚ چێتێکی دیەکەیە.. فەیرووزابادی وێڕای ئەو هەموو لێزانی و ئاشقە زمانی عەرەبییەی، کەچی هەر زمانی زگماکی مادەرزادی بە سەر زاریدا زالّ بوو. جارێکیان ئەم پرسیارەم لە مامۆستای بەهەشتیم مامۆستا مستەفا جەوادی بە ڕەگەز کوردی خەلکی لای خالس، کە لە کوللییەی شەریعەت مامۆستای مێژوومان بوو، پرسی: فەرمووی فەیرووزابادی، ڕەگەزی دیار نییە، فارس بە ئی خۆیانی دەزانن،

چونکە، زێتر کورد و هێندێ فارسی زوانی لە کوردزوانەوە نزیک دەڵێن: "چراغ را بکش"؛ هەروەها فەرهەنگە فارسییەکانیش (فەرهەنگی د. م. معین "کشتن" ی بە مانای کوژاندنەوە نووسیوە.

بۆ پێناسەکردنی ئاراوە، زۆری بە باریکان و بە قەویان لەسەر ڕێسراوە: خواجا نەسیرووددینی تووسی - کە زۆری ڕك لە کورد دەبۆوە - دە پاشکۆی ئاوەڵێکچووەکاندا، پوختەی فەرمایشتەکانی ئەوەیە کە واژە دە مانای ئەسڵی خۆدا و هاوچوونیەکیدا بەکار ببرێ باشە. بەڵام بە ڕەچاوکردنی مانا ئەسڵییەکەی، بە مەرجێ ئەو وێکچوون و هاوخزمایەتییەی کە دە ئەسڵەکەدا هەن، لە کاتی گوتن و نووسیندا ڕەچاو نەکرێ، ئەمەش بە دوو بەشەوە دەکرێ: یەکەمیان ئەوەیە کە لێچوو لە دەربڕیندا، دەگەڵ پێچوو (ئەسل)ەکەدا یەکسان بێ و بەمە دەگوترێ "نێوی ڕاگوێزتە"، وەك بەکاربردنی واژەی "مانگ" هەر لە سەرەتارا و بە ئەسڵ، بە مانای تۆپەڵ (جیرم)ی ئاسمانی و بە ڕاگوێزتن و ئەریەتی، بە مانای مەودایەکی تایەن داندراوە. هەروەها بە مانای هاووێنەش بەکاردەبرێ. هەروەها واژەی (عدل) ی عەرەبی بە مانای داد، کە ناوی مانایە و بە مانای دادگەر (عادل)، کە سیفەتی کارابیە بۆ موبالەغە، بەکار دەبرێ. هەروەها "ئاورشێن" لە کوردیدا، بۆ دوو سیفەتی لێك دووفاق: سیفەتی بەرکاری و سیفەتی کارایی، بەکاردەبرێ، بەو ئامێرەی کە ئاوپرژێنی پێ دەکرێ (ئاورێژ = آب پاش) و بەو شوێنەش کە ئاورشێن دەکرێ، هەر ئاورشێن دەگوترێ. دیارە لە مانای دووەمدا، لەگەڵ فیعلی "کردن"دا، دەبێ بە "ئاورشێن کراو"، کەچی کورد هەر بۆ خۆی بۆ ئەو چتەی کە دەی ڕێژێ، لە قسەیەکی ئەستەقدا، "ئاورێژ" ی گوتووە، نەك ئاورشێن - "نە کورت و نە درێژ کۆڵەمست و ئاورێژ".. واژەی "باوەشێن" و "نێلاترێن" یش هەر لەو بابەتەن.. دووەمیان ئەوەیە، کە لێچوو پتر بەسەر پێچوودا زاڵ بێ و کە گوتت و درکاندت، پێچووت بە درەنگەوە بە بیردا بێتەوە. ئەمەش دوو جۆرە: یەکەمیان بەکارهێنانی لە ڕوانگەی زۆرینەوە، بەمە دەگوترێ (باو = عورف)، وەك: دەست بە ئاوگەیاندن دە ئەسڵدا بە مانای بۆ داندراوی خۆی کە دەست بە ئاو شوشتنە و بە

عورفی مەجاز بە مانای پیسایی کردن و تارات گرتن و خۆ پاکژ کردنەوەیە. دووەمیان ئەوەیە کە بەکارهێنانەکە لە لایەن تاخمێکی تایبەکاری زانستێ، هونەرێکەوە بێتە گۆرێ. بەمە دەگوترێ زاراوە (مصطلح). موستەلەح واتە: مەردمەکە لەسەر ئەوە رێک بکەفن کە واژەیەك لە مانایەکەوە وەگوێزێ لەبۆ مانایەکی دیکە و ئەو واژەیە بۆ ئەو مانایە وە خاس (صالح) بزانێ، مانای (اصطلح علیه) دە بنیچەدا، واتە: بە چاك زانین. وەك: بەکارهێنانی واژەی (قدیم) ی عەرەبی، بە مانای کۆنە دە بنیچەدا و بە مانای ئەوە کە هەر لە سەرەتارا هەبووە، بە زاراوەی فەلسەفە و کەلام. تێوە لێچووەکان دەبن بە سێ پاژەوە: یەکیان ئەوەیە کە ئەسڵەکە لە دربڕیندا زووتر و گورجتر بە بیردا دێ و دە زەیندا زێتر خۆش باوە و ئەمەش مەجاز و خواستنەوەیە. دووەم ئەوەیە کە لێچوو زووتر و خێراتر بە بیردا دێ و ئەویان دە زەیندا زاڵترە. بەمەش دەگوترێ "لەباوی گشت و زاراوە = عورفی عام و مصطلح". سێیەم ئەوەهێیە کە ئەسڵ و فەرع دە بیرهاتنەوەدا، هەرێك یەکسان بن و بەمەش ڕاگوێزتنی ڕووت و پەتی دەگوترێ.

بە ڕاستی، زاراوە ناسی، ئەو زانستەیە کە دەپەرژێتە سەر لێوەکۆڵین و وردکردنەوەی زاراوەکان. گاتفرێد شووتز، پرۆفیسۆری زمانی ئەڵمانیایی (١٧٤٧ - ١٨٣٢) یەکەم کەسێ بوو کە ئەم زاراوەیەی بەکاربرد. زاراوەکە پاش مەودایێ، ڕێی کەوتە نێو زمانی ئینگلیسییەوە و بە مانای (پێرستی نێوان) بەکاربرا. پاشان دەڵییە نێو زمانی فەرەنسزییەوە و پاشترێ، جلکی بەکارهێنانێکی جیهانیی دەبەر کرد. لە فەرهەنگە هەمە جۆرەکاندا، پێناسەی زۆر و زەوەند بۆ تێرمینۆلۆژی (زاراوە ناسی و زاراوە) دەردەست کراون. تەنانەت وەختە بکارم بێژم، هێند زۆرن لە شمارە بەدەرن: "کۆمەڵە زاراوەگەلی هونەری سەر بە یەك زانست، یا هونەر و چەمکانی سەر بە وی (فەرهەنگی زانستان، گەلێ ئەدەبیات و هونەری ڕەنگ کاری، زاروارەگەل، یا واژەیەك کە دە زانستەکان، هونەرەکان) دا بەکار دەبرێن. (فەرهەنگی وێبستەر)"١. کۆمەڵە واژە گەلی هونەریی سەر بە یەك زانست ، لێوەکۆڵین، یا گرۆیەك لە لێوەکۆڵان ، ٢. لێوەکۆڵینی پێڕۆی زاراوە، یا واژە و ئاوێتەگەلی تایبەت، کە لەبۆ نێو لە چەمکی تایبەت

تان بەکاردەبرێن و هەروەها لە بنەما هەموانەکییەکانی سەر بەم لێوەکۆڵین و لێوەتوژینە، بەکاردەبرێن (فەرهەنگۆکی ڕووبێن)، بە ڕەچاوکردنی پێناسەگەلێك کە فەرهەنگە جۆراوجۆرەکانی زاراوەسازی بە دەستەوەیان داوین و بەم ڕوونکردنەوەیە کە بە پێناسەی ئەم زانستە لە قەڵەم دراوە، یەکجار هەمراتەکی بەرچاو دەکەوێ، دەتواندرێ پێناسەیەکی ورد و گردەبڕ لەمەڕ زاراوە ناسی دەردەست کرێ: دە لێوەکۆڵینی "مەتد" دا، لە نێونانی چەمکەکانی سەر بە ڕشتەکانی پسپۆڕەکیدا، هەڵیەتە بڕێ واژە و ناوێتەگەل، گرۆیێ لە خەڵك، یا تەنانەت تاکە کەسێکیش بە کاری دەبەن، هەر زاراوە دەگوترێ. جا، بەم پێناسەیە، دەبێ زاراوە بە هاوواتا vocobulary لە قەڵەم بدرێ، بەلانەکینێ ئەوەهێت لە بیرنەچێ، کە کارێکی تەنکی وەك تارای وەوی ها لە مەعبەبنیاندا.. بە بیروبۆچوونی زانایانی ئایدیالیست و نیوە ماتریالیست و نیوە ئایدیالیست ڕەنگە - هەرچەندە بە نێکەڵ و پێکەڵیش بێ - شتهایەکیان لەم ڕووەوە نەنگاوتبێ، بەڵام ماتریالیستی دیالێکتیك کێشەکەی یەکلا کردووەتەوە و دەڵێ: - مرۆ لە زیندەوەری دیکە بە وشیاری (ئاوەز) جوێ دەبێتەوە، واتە زیندەوەری بێ ئاوەز هەرگیز ناتوانێ وێنەی شتانی؛ سەرەبەخۆ بە بیردا بێنێتەوە. تەنها هەر مرۆیە، کە بەهرە و یارای ڕووت کردنەوە = تجرید - ی هەس. شتان بێ ئەوەی لەبەر چاوی زەق بێتەوە، دەبەر زاری، یا دەبەر گوێی، یا دەبەر دەستی، یا دەبەر لووتیدا بن، ناڕاستەوخۆ هەست پێ دەکا، بەڵام زیندەوەری بێ ئاوەز و بەستەزمان بەو جۆرە نییە.. ئەو شتان تەنێ ڕاستەوخۆ هەست پێ دەکا. هەروەها وەك پاڤلۆف دەفەرموێ، بە ڕاهێنانیش بە پێی تێئۆریی جەمسەربوونی مەرجەکی (نظرية الإقتران الشرطي) یش چتی بەبیردێنێتەوە، بێ لەوەش مرۆ خەسیەتە گشتەکانی شتان یەکسەر دەقۆزێتەوە و یارا و بەهرەی تایبەتی ئاوەز، شتان بەو خەسیەتە گشتانە دەناسێتەوە. کە دەڵێین"دار" تەنێ دارێکی لە مێشکدا نییە، بەڵکو خەسیەتەکانی سەرلەبەری دارانی دە مێشکدایە و بە هۆی ئەو خەسیەتە هەموانەکییەوە، تاکان دەرك دەکا. کەواسا، هەموو بوونەوەرێ تاك (تایبەت) دە بوونێکی هەموانەکی (عام) دا دەرك دەکا، ئەوجا تاکیش بێ کۆمەڵ بە بیردا نایە،

واتە، دە کات و شوێن و ناوی خەڵکانی دیکـەدای بە بـیردا دێ. دیارە مـرۆ، بـەم پێیـە ڕشتەی بوونەوەرێکی کۆمەڵـەکیی بە ئـاوەزە، بـێ کۆمـەڵ نـاژیێ.. بـێ کۆمــەڵ ـ یـا مێشکێشی بە زگماک تەواو بێ ـ هیچ فێر نابێ؛ زمان، فەرهەنگ، شارستانیەت، ژیاری و هتد.. فێر نابێ. دە جەنگەی ئەرك بە خەرجدان و کار و کۆششـتدا فێری شتان دەبـێ، ژیاری و شارستانییەت، بە کار و ئەرك بە خەرجدان دێنە گۆڕێ.

ئینجا، زمان قاڵبی هەموو ئەزموونەکانی مرۆیە. بە درێژاییـی تەمـەنی لـە خەسیەتی مێژووینەی وی، زمان نەبا، مرۆ وەك هەموو بەستەزمانێکی لێ بەسەر دەهات. وەلێ چۆن چۆنی ڕەفتار دەگەڵ زمان دەکا؟ دیارە، مرۆ شتان بە پچڕ پچڕی و پەرت و بڵاوی و بێ بەندوباری و بێ سەروکاری نابینێ و بیریان لێناکاتەوە. شتان پێ بە پێی یاسا و ڕێسای هۆکار و ئاکام و ناچارەکی و ڕێکەوت و ئازادی، بیر لێ دەکاتەوە. بۆ خۆت دەزانـی هـەر یەکە سەروکاری دەگـەڵ شتێکی دیکەدا، دە تـۆڕی پێوەنـدی گشـت و ڕەهـا (عموم و خصوص موتلەق) و گشت و تایبەتی یەکسەرە (عموم و خصوص من وجـە) و دووفـاقی (تناقض) و یەکسانی (مساواة) دا، هەیە. جا، ئەوانە، چ لە شکڵ و شێوەی بەرچاو، بەر بێن؛ بەر چەشکە، بەر بیستن و بەر وێ کەوتن (لەمس)، جا بە خەسیەت، بـە بیچم، بە قەوارە، بە ڕواڵەت و گەوهەر و هتدا دەبینێ و دەرك دەکا. کەواسا، مرۆ لـە کـاری دەرك بە شتان کردندا، هەمیشە لە تۆڕی دنیای مایەکی و مانایەکیدا ئەمسەر و ئەوسەر دەکـا، شتان بە شتان دەچوێنێ، هێندێ کاو دەی ئەنگێوێ و هێنـدێ جار نـای پێکـێ.. بـەڵام هەمیشـە بـە ئامـادە بوونـی یاسـا و ڕێسـایەکانی ئـاوەز، چ بـە مـەنتیقی فۆرمالیسـتانە (ڕواڵـەت)، چ بـە مـەنتیقی دیالێکتیکانـە، لـە مێشـکیدا، کـە بـە ئــەزموون دەردەسـتی کردوون، ڕەفتار دەکا. هەر لەبەر وەشە، کە چەندین شێواز و ڕێبازی بۆ نێولێنـانی مانـا و ئـەزموونی ئـرت و ئوێـاو دەدۆزێتـەوە و بـۆ هــەموو ڕشـتەکانی زانسـت و هونـەر و فەلسەفە، زاراوەی لەبار و لەشان سووك و خۆشباو دادەنێ. دیـارە ئـەم هونەرەشـی لـە ئاکامی بەرەوپێش چوونی ئامێرە مایەکییـەکاندا وەدەسـت هێنـاوە. هـەر ئەمەشـە، کـە جوداوازیی لە نێوان کۆمەڵگەیەکی، کە بە سەر هــەموو پێداویستەکانی خۆیدا ڕادەگا و

کۆمەلگەیەکی دیکەی پاشکەفتی، وەك کۆمەلگەی کوردی لە کاروان بە جیّ مای، کە بە سەر زۆر شتاندا ڕاناگا. گەلق، ئەوڕۆ کورد چەند زاراوەی - وەك لە پێشـترێم باس کرد - لەو هەموو بواری جۆراوجۆری زانستەکانی دنیاییدا، داناوە و ژیانی شارستانیی ئەوڕۆی خۆی پێیان دەستەبەر کردووە؟

بەلأم نەتەوەی کورد - پیاو هەق بێژێ - سەرەڕای ئەو هەموو کۆت و زنجیری زمان و فەرهەنگی تورکی و عەرەبی و فارسییە، کە بە درێژاییی دە - دوازدە سەدە، سەرومڕ لە دەست و پیّ و بیر و هۆشی ئالأون - مالم قـەبرە - لـە پاراستنی بـەندوباوی نەتـەوەکیی خۆی، بە تایبەت زمـان و ئـەدەبیاتی زارگوتیی دەوڵەمـەند و ڕەنگینـی پشتاوپشت لـە بیرنەکردووی دریغی نەکردووە. دژمن ئەگەر توانیبێتی سەرلەبەری هەموو شتێکی کورد و کوردستان چەپاوکا و بە تالأن و بڕۆی بەرێ؛ وەلیّ هەرگیز نەیتوانیوە بیری نەتەوکی و نەتەوەکەی و فۆلکلۆرەکەی بە تالأن و بڕۆ بـەرێ. خۆشبەختانە، ئەگـەر دەستی بڕوا، هێندەی کەلـەپوور هەیـە، کـە دەتـوانم بلێم لـە ئـی تورکیش و عـەرەبیش و فارسیش دەوڵەمـەندترە. هـەر ئەوەشـە کـە یـەکێکی وەك خـانیی ئـەمر ئـەم هەستوخوسـتی نەتەوەکییـەی لـە شـاکاری مـەم و زینەکـەیدا، بەوپـەڕی گەرموگوڕییـــەوە دەربڕیـوە و خوێندەوار و ڕۆشنبیری کورد، چ وەك مەلا و فەقیّ، کە خاوەنی کەشفوزنوونن، حـاجی خەلیفەی تورك، دەڵێ: ئەو حوێندەوارە کوردانە نەبان، هیچ ئاسەوارێکی ڕۆشـنبیری لـە قەڵەمڕەوی دەوڵەتی عوسمانییاندا نەدەما - دەڵێ "اونلر طفره صتـان أولدیلـر. "و چ شێخ، چ ئەفەندیی فێست بەسەر و سیدارە لەسەر، کاسـکێت لەسـەر و قالْپاخ لەسـەر و هتد.. بـە هەڵبەسـت هۆنینـەوەی کـوردی و کـۆڕ و کۆمەڵـەی ڕۆشنبیری دامـەزراندن و ڕۆژنامە و کۆوار دەرکردن، دە مەیدانی ڕۆشـنبیریدا، دریغییـان نـەکردووە. بیریـان لـەوە کردووەتەوە، کە دەبیّ منداڵی کورد فێرگەی بە کوردی خوێندنی بۆ بکرێتـەوە.. کتێبـی بە زمانی زگماکی خۆی هەبیّ. ئەوەندی بە بیرم دیّ؛ عەبدوڕەحمانی شەرەفکەندی، مام هـەژاری ئـەمر و عـەبدوڕەحمانی زەبیحـی، کـاك حەسـەنی قزلْجـی و محەمـەدەمین شێخولئیسـلام، هێمنـی موکریـانی، وەك بۆیـان وەگێڕام، قـازیی ئـەمر دە سـەرویەندی

کۆماری ساوای مەهابادیٚ، بیری لەوە دەکردەوە فەرهەنگستانی کوردی دامەزرێنیٚ. ئەنانەت بۆیان وەگێڕام، کە چۆن زاراوەی "پێشمەرگە" ڕانراوە؟ حیکایەتەکەی مەشهوورە،، گۆیا دە گەرمەی مشتومڕدا، چاپچییەکەی گوتوویە: ئەو هەراو بگرەی بۆ چییە؟! بە "فیدایی" بڵێن "پێشمەرگە"، چونکە "پاشمەرگە"مان هەیە..

بە ڕاستی، زاراوەدانان، هەر وەکو لە پێشتریٚ گوتم، وێڕای سەلیقەی زمان زانی و لە یاسا و ڕێسای واژە تەرەکین زۆر باخەوەر بوون، ئەویٚ، لە مێژووی کورد، لە جوغرافیای کورد، لە کۆمەڵناسیی وی، لە ئابووریی وی، لە ئەفسانەکانی، لە سەرچاوەکانی بیروباوەڕی کەونارای، لە ئایینەکانی، و تاد.. فرە وەسەلیقە ویٚ. دەبیٚ بە لانی کەم لەم قاڵبانەی زمانی کوردی شارەزا و پسپۆڕ بی و لە جیاتی "کارەکەی کرد" نەبەژیٚ "بەکارەکە هەڵسا" کە تەرجەمەی "قام بە" ی حارەبییە و بە کوردی تەرجەمەی پیت بە پیتییەکەی ئەو مانایە نادا، ئەمەش هەروەك "نۆکەر"، کە "تسع زمایل" دەردەچیٚ:

١ـ نیشانەکانی سیفەتی کارایی:

ـ "ا": *زانا، توانا، بینا، یالاٚ.*

ـ "گار": *سازگار، کردگار، پەروەردگار.*

ـ "کار": *ستەمکار، بەدکار، نوێکار، تازەکار.*

ـ "ان": *ڕەوان، شادان، خەرامان، نالاٚن.*

ـ "ندە": *کوشندە، برێندە، فڕێندە، عەفرێندە.*

ـ "گەر": *جادووگەر، دادگەر، شانۆگەر.*

ـ ئەوەت لە بیر نەچیٚ، کە سیفەتی کارایی ئەگەر "ندە" ی لە پاشەوە پێوە بلکیٚ، زێتر بە مانای فیعل و سیفەتی ڕەقتەنی و کائەکیدا بە کار دەبریٚ، وە نموونە: شاییی ڕۆبیندە، کە لە گەرمیان باوە، بەلاٚم هێندیٚ کاویش بە مانای هەمیشە بە کاردیٚ، تیرێکی کوشندەی تیٚ گرتم. سیفەتگەلیٚ کە بە "ان" دواییان دیٚ، زێتر مانای *حالٚ* دەبەخشیٚ، واتە سیفەتەکە بەردەوام نییە، بە نموونە: کاورا زگی *ڕەوانە*، ڕەوانییەکە هەر چند سەعاتێکە، یا: بە *هەڵەداوان* هات، واژەی داوان بە فارسییەکەی *دوان* ـ ە، لە

دوین ـ ەوە هاتگە، واتە هەڕاکردن و دەودەوانێ و قۆشمە. ئەگەر سیفەتەکە بە "ا" دوایی بێ، ئەوە دەلالەت لە هەمیشەگی دەکا، وەك *زانا، دانا*. ئەگەر وە "کار" کۆتاییی هات، ئەوە، مانای فرەپێوەنان و موبالەغە دەبەخشێ، وەك: *ستەمکار*، واتە: فرە ستەم. لەوەش وریا بە، کە فەرقی "گار" و "کار" ئەوەیە کە گار وە واچەگەلێکەوە دەنووسێ، کە لە فیعل تەرەکیاین، هەرچی "کار" ە، وە ناوی مانا و واژە نەتەرەکییەکانەوە دەلکێ، وەلێ جگە لە ناوی مانا، وە فیعلییەوە دەلکێ، وەك: ئاسنگەر، شیرگەر، ئەمەیان سەروکاری لێل سیفەتی کارابیدا نییە.

**موتوربەی سیفەتی کارایی:**

١ ـ حالەتی وەباڵدان (ئیزافە)، کە سیفەت وەباڵ پاشەخۆ دەدرێ، وەك: *بڕندەی پۆلا، کوشندەی* دژمن.

٢ ـ دواخستنی سیفەت و تێ بردنی نیشانەی "ندە"، وەك: *سەرفراز*، لە سەرئەفرازندە ـ وەوە و سەربڕ لە سەربڕندە ـ ەوە هاتگن. دیارە ئەمانە وەك فارسییان ڕەفتار دەگەڵدا کراوە.

٣ ـ کاتێ سیفەتی کارایی دەگەڵ بەرکار یا یەکێ لە قەیدەکان (ئاەڵکارەکان) ی، وەك: زۆر، کەم و تاد.. دا هات هەنگێن نیشانەی سیفەت تێ دەبرێ، وەك: *زۆرویژ، کەمدوو*.

**نیشانەکانی سیفەتی بەرکاری:**

١ ـ سیفەت پێش دەکەوێ: *پەروەردەی* ناز، *ئالوودەی* داوێن پیسی.

٢ ـ سیفەت پێش دەکەوێ و نیشانەی وەباڵدان تێ دەبرێ، وەك: *ئالوودە ناموس*.

٣ ـ سیفەت پاش دەخرێ و چ گۆڕان نائێتە گۆڕێ، وەك: خە*وئالوودە* (خەوالوو).

٤ ـ سیفەت پاش دەخرێ و "دە" تێ دەبرێ، وەك: *نیعمەت پەروەر، نیشتمان پەروەر*،

٥ ـ سیفەت پاش دەخرێ و "دە" دەمێنێ، وەك: ژەمبردە، سەرمابردە، بابردە.

**نیشانەکانی سیفەتی نیسبەت:**

١ ـ "ی" بە دوای واژەوە دەنووسێ، وەك: *ئاسمانی، خاکی، کوردی*.

٢ ـ بزوێنی "ە" بە دوای واژەوە دەنووسێ، وەك: یەكشەوە، دووساڵە، چلە، حەوتە.

٣ ـ "ین" لە دوای واژەوە بێ، وەك: جۆرین، بەفرین (بۆ جۆر و ڕەنگی هەڵماتی بەرد).

**نیشانەی سیفەتی لێكدریاگ:**

١ ـ لێكدانی وێكچوونەكی، وەك: سەنگدڵ، كەوانبرۆ، پۆڵادەست.

٢ ـ لێكدانی دوو ناو، وەك: ئازارپیشە، خیانەت پیشە، جاسووسی پیشە.

٣ ـ لێكدانی دوو ناو بە ئامراز، وەك: خەتجەر بەدەست، سەربەكڵاوە (بۆ شەستەباران).

٤ ـ لێكدانی ناو بە ئامرازی جۆراوجۆر، بابەتی ئەوتن:

آ ـ بە "ب" ، وەك: بەغیرەت، بە حەیا. (هێندێ جار ئەم "ب" یە ئەوێ وە "و")

ب ـ بە "هاو"، وەك: هاوڕێ، هاودەم، هاودەنگ.

ج ـ بە "نا" و "نە"، وەك: نامراد، نەمر.

د ـ بە "بێ"، وەك: بێ ئاوەز، بێ هۆش.

و ـ بە "مەند"، وەك: هونەرمەند، زەرەرمەند.

ز ـ "وەر"، وەك: دادوەر، جانەوەر، دەمەوەر.

ح ـ بە "ناك"، پتر مانای دەرد و ناساغی دەبەخشێ، وەك: نمناك، دەردناك، ترسناك، خەمناك.

**سیفەتی بیستەنی و قیاسی:**

١ ـ ناو مانای وەسفیی هەوێ و موشتەق نەوێ، وەك: گران، تەنگ، دزێو.

٢ ـ واژەیێ دەلالەت لە ڕەنگ بكا، وەك: سپی، سوور، زەرد.

٣ ـ سیفەتی بیستەنی زێتر لە لێكدانیدا، دوادەكەوێ، وەك: ڕووسوور، ڕووزەرد، ئێسك گران. هێندێ جار پێش دەكەوێ، وەك: سیاماڵ، مردەماڵ، زندەماڵ.

ڕاستیت گەرەكە، ناكرێ لێرەدا من هەرچی دەستەڵاتی زمانی كوردی هەس، گشتی لەم وتارەدا وەسەر كەمەوە، دیارە مەرامم لە وەبیرهاوردنەوەی ئەی قاڵب و میسالەیلە، ئەوەیە، كە كەسێ خۆی ئەڕای زاراوە داڕژتن خرهەڵ داوێ، تەنیا زمان زانی بەش كارەكە نێكا، ئەوێ، وەك وتم، قرە لە دیرۆكی كورد، لە جوغرافیای كوردستان و لە

ئابووریی کورد، لە کۆمەڵناسیی کورد و خۆلاسە لە گشت چتێکدا زۆرزان وێ.. بێینە سەر ڕاستی، ئەوەی من دیاردیم بۆ کردن، ڕەنگە تنۆکێ وێ لە دەریای زوان کوردیی خاوەن پێنج شێوەی فرە زەنگین و دەوڵەمەند.. جا ماگەسەوە ئەوەیچتانە عەرز خزمەت کەم، کە ئاخۆ بواری قیاس کردن لەسەر ئەم قالبانە چەندە و قەڵەمڕەوی تا کوێ دەڕوا؟ ئەمە زێتر دەکەوێتە سەر سەلیقە و زەوق و شارەزایی و کوردی زانین و بە زوانی بیانییەوە ئالوودە نەبوون و کەمێ جورئەتیش و گوێ ڕایەڵیی زەوقی خەلکەکەیش ناوێ لە بیر بوەینەوە. دیارە ئەمن لە کوردێکی گرێچکە بە تەنێ بە کوردییەکی بەرتەسکی شارێ، ناوچەیێ و شێوەیێ ڕاهاتبێ؛ یا زێتر بە زمانێکی غەیرە کوردیی خوێندبێ و دەگەڵ ژیانی کوردەواریدا، سەروکاری کەم بووبێ؛ ئەوە عوزری خۆی بە دەستەوەیە و لێی ڕاناپەرمووم، شێرم بە گوێ بۆ بگرێ.. من پێم وایە هەر کەسێ لە مەمانان دەرکی هەمبانەی خۆ وەکا، ڕەنگە لە هەر چتە شەمەیەك بکا.. خۆ نەتەوەکانی دیکەش لە سەرەتاوە کۆڵیان لە کۆڵی مە زۆر ڕەنگینتر نەبووە، بەلام لێل ئەوەشا، ئەم شاکارییە: مەردی مەیدانی خۆی هەبووگە و تا ئەو مەردمەیلە خامە وەدەس بووگن، هەر ئەوانەیلە سەردەفتەر و سەرمەشق و دەمڕاست و جێی متمانە بووگن.. خولایە، یەکدوو کەڵە زوان زانێکی دیکەی وەك مام هەژار و ئەحمەدی خانی و نالی و تاد.. مان بۆ بڕەخسێنێ.

لەمەڕ قیاس وەکاربردن، ئەملاو ئەولای بۆ نییە، هەر وەك زانایانی زاراوەشناسی یەژن، ئەم بژنە ڕێیانەش دەبێ پیا بڕۆین:

١ ـ دەبێ لە زانستی بنەواشەکانی واژەڕانان "علم الوضع" باخەبەر بین. ئەهلی ئوسوول لەم هونەرەدا، لەمێژە فەرموویانە: "يصطلح على المعنى لأدنى ملابسة"، بە کوردییەکەی واتە: مەرج نییە زاراوەیێ کە بۆ مانایەك دادەنرێ، لە سەتا سەت پراوپڕی یەکدی بن، دەکرێ بە بۆرە خزمایەتییەك شاوشەوکور بنەوە، ئەوجا خزمایەتییەکە بە درێژاییی ڕۆژگار، دەچەسپێ و کارەکە دەبڕێتەوە.. کێ بە خەیاڵیدا دێ، واژەی "مسرح" یان "مرسح" کە ئەورۆ بە شانۆ دەگوترێ، بە زمانی عارەبی بە مانای چێرەگە

و لەوەرگە بووە؟! کێ بیری بۆ ئەوە دەچێ کە "الفن" و "المفن" کە ئەمێستاکە وە سنعەتکار و هوونەرمەند، دەبێژرێ، وە زوان ئارەوی، بە مانای ".." ی فرە ڕەوتخۆش و لەنجە و لار بووە؟!..

خۆلاسە، زاراوەدارێژ دەبێ جگە لە قالبەکانی زمان، لەم قالبە مەنتیقییانەیش وریا بێ: گشت ـ تایبەت،وەک: زێدەوەر ـ کەروێشک، یەکسان، وەک: ئاسک ـ ئاسک، دووفاق، وەک: پیاو ـ ناپیاو، هاودژ، وەک: مرێگ ـ زنگ، بانێك و دووهەوایی، وەک: ڕەش و سپی.

دیارە لەم قالبانەدا، سەرلەبەری چوارچێوەی هاوپێوەندییەکانی چەندایەتی ـ چۆنایەتیی بزفتی دنیای ماتریال کە قاوغی شکڵیی ماددەن ڕەچاودەکرێن و بۆ ئەمەش ئەمڕۆ سوود لە زانستی ماتماتیکا لە هەموو پراکتیزەکانیدا وەردەگیرێ و ئامێر و دەزگای زۆر وردیش بۆ پێوانەی وردترین ڕێژەیەك لە ماددە بە خێراییی دەنگ و ڕووناکی، هاتوونەگۆڕێ و خێرایی خەستکەرەوە (معجّل) ی وا پەیدا بووە، وێنەگرێ بە خۆ و کامێراکەیەوە دەتوانێ بچێتە نێو پرۆتۆنێکەوە و وێنەی زۆر بە ئاب و تابیشی لێ هەڵ گرێ..

٢ ـ بەسەرکردنەوە (استقراء) ی دەنکە ـ دەنکەی واژەکانی زوان هەر یەکە لە نیگای لە ڕستەدا، چ بە پێی بنیاتگەرایی، یا بە پێی بردنەوە سەر ماك (تأویل)، بەکاربردندا، لە ڕووی ئێتیمۆلۆژییەوە، ڕەچاوکردن.، وە نموونە: ئەگەر لە ناوەکانی ئەسپاب و ئامێرەکانی ئاسیاوێکی کوردەواری بۆ هێندێ زاراوەی ماشێنی سوود وەرگرین، ڕەنگە تا نزیکەی ٤٠ زاراوەمان وەچەنگ کەون.

٣ ـ گردوکۆیەکی وردی هەرچی زاراوەکانی سەرلەبەری پیشەکانی ناو کوردەواری هەس، بکەین. ڕەنگە لە هەر پیشەیەك چەندین زاراوەیەکمان لێ وەچەنگ کەوێ، کە بۆ ئەوڕۆی دنیای سنعەت و تەکنۆلۆجیا، زۆرمان پێویست پێ دەبێ.

٤ ـ سەرلەبەری واژەکانی زمانی کوردی، بە هەموو شێوەزارەکانیەوە، ئەوەی کە نەهاتووەتە سەر کاغەز، گردوکۆکرێنەوە، ئەمە لەسەر ئەکادێمیا و ئەکادێمی و دەستووری زاراوەڕانان.

بەش بە حاڵی ئەوەی کە کوردەکە لەم مەیدانەدا، تا ئێستا چیی بە چی کردووە، هێندەی بە بیرم بێتەوە، بزاوتی کورد، بە تایبەت لە کوردستانی عێراقدا، دە هەموو داخوازە ڕۆشنبیرییەکانی کورددا دەزگایەکی لە جۆری "کۆمەڵەی زانستی" کە ئینگلیسەکان لە سلێمانی دایان مەزراندووە، هەر نووسیاریێ واژەیەکی کوردیی پەتیی، لە بریی تورکی و عەرەبی و فارسی نووسیبا، فەرمانڕەوای ئینگلیسی ئەو سەروبەندەی شاری سلێمانی، ڕوپیەیەکی خەڵات کردووە.. مەلا و وەسەوادی کورد، زۆریان بیر لە داهێنانی واژەی تازە، ڕستەی نوێباو، نەخوازا بۆ زمانی شیعر، کردووەتەوە.. بەڵام بە داخەوە، سەبارەت بەوە، کە زمانی کوردی نەببوو بە زمانی خوێندنی تەواو و زمانی فەلسەفە و زانست و هونەر، وەک زمانی عەرەبی و زمانانی خاوەن دەسەڵاتی سیاسی، دیارە هەر لە قاوغ و قەپێلکی زمانێکی هەواری شوان و گاوانی و گوندنشینی و کشتوکاڵ و چەند وردە پیشەیەکی سەر بە ئابووریی هەریەشخۆی کز و بێ هێز و بنبەستدا گینگڵەی خواردووە.. بەڵێ، ڕاستە ئەدبیاتێکی لە گوێن ئەدەبیاتی "دیوان"ی فارس و عوسمانی، لە سەر دەستی نالی و سالم و کوردی و تاد.. هاتە گۆڕێ، بەڵام زێتر لە بەر سێبەری ئەدەبیاتی فارسی و تورکیدا چەکەرەی کردبوو، زمان خۆت دەزانی هەر شیعر نییە، پەخشانیشە، ئەم پەخشانەیش کاتێ ئەشەنە دەکا، کە زوانەکە بوێتە زمانی زانست و فەلسەفە و هونەر و دەوڵەت و قودرەت و تاد.. ئێ ناشکوری نەبێ ئەمەیش تا ئێستا سەری نەگرتووە. بەڵێ ڕاستە زمانی کوردی زمانەکەی سەردەمی کۆمەڵەی زانستی نییە و ئەوڕۆ تا دوا پلەی خوێندنی لیسە بە کوردی دەخوێندرێ، وەلێ هێمان فرەمان ماگە..

لە بابەت دامەزراندنی کۆڕی زانیاری کورد لە بەغدایێ، کە یەکێ لە داوخوازە گرینگەکانی نەتەوەی کورد و حیزب و پارتەکانی بووە، جێی تێڕامانە..

بە ڕاستی، دامەزراندنی کۆڕی زانیاری کورد لە بەغدایێ هەر لە دوای مۆرکرانی ڕێککەوتننامەی ١١ ئازار، دەپێش هەموو کەسێکدا، مام هەژار و کاک سەعید ناکام و کاک فەرەیدوون عەلی ئەمین ، بە فرۆکەی عەلیکۆپتەر، تەشریفیان هێنایە بەغدایێ،

بەندە هەرسێکیان دۆستم بوون، بە خوایشتی خۆیان، بە خزمەتیان گەیشتم باسی زۆر شتانمان کرد. بەلام لە پاش چەندین کۆڕ و کۆڕگێڕان، کۆڕی زانیاری کورد، بەم جۆرەی پاین هاتە گۆڕێ:

١ـ کاك ئیحسان شێرزاد سەرۆك

٢ـ کاك مەسعوود محەمەد جێگری یەکەمی سەرۆك

٣ـ مامۆستا عەلائوددین سەججادی جێگری دووەمی سەرۆك

٤ـ د. کەمال ئەحمەد مەزهەر ڕازگری گشت

٥ـ د. ناجی عەبباس ئەندامی کارا

٦ـ د. عەبدوڵلا نەقشبەندی ئەندامی کارا

٧ـ د. ئەحمەد عوسمانی برای د. مەحموود عوسمان ئەندامی کارا

٨ـ د. پاکیزە ڕەفیق حیلمی ئەندامی کارا

٩ـ کاك موقەددەم عەزیز ئاکرەیی ئەندامی کارا

١٠ـ عەبدوڕەحمان شەرەفکەندی، مام هەژاری نەمر ئەندامی کار

١١ـ شێخ محەمەدی خاڵ ئەندامی کارا

١٢ـ پرۆفیسۆر قەناتی کوردۆ ئەندامی کارا لە سۆڤیەت

١٣ـ د. کامەران بەدرخان ئەندامی کارا لە فەرەنسا

کۆڕی زانیاری کورد، یەکەم کۆبوونەوەی لە ١٩٧١/٢/١٧ دا دەست پێ کرد و تا دوایی ساڵی ١٩٧٢ کۆبوونەوەکانی بە ٥٣ کۆبوونەوە گەیشتن. کۆڕی زانیاری کورد لە بەغدایێ، دە نێوەرۆك و کرۆکدا، لە هەڵبژاردنی ئەندامان و سەرۆك و جێگر و ڕازگردا، دەبوا دەگەڵ دەستەی گشتی کۆڕی زانیاری عێراقدا دەنگ بدا، هامانا: لەو کارەدا سەربەخۆ نەبوو، بەلام لە بودجە و کارگێڕیی خۆ بە خۆدا، سەربەخۆ بوو.

دیارە بێ لە ئەندامانی کارای کۆڕ، ئەندامانی شەرەفیشی هەبوون، کە ئەم زاتانەی پاین بوون:

١ـ مامۆستا تۆفیق وەهبی ئەمر

٢ـ د. عەبدوڵلا نەقشبەندی/ پاش وەی دەستی لە ئەندامیەتیی کۆڕ، لەبەر سەرقاڵیی دیکەی، وەکێشا.

هەروەها ئەندامی یاریدەریشی هەبوون و ئەم زاتانەی پایین بوون:

١ـ فائیق وشیار

٢ـ عەبدولحەمید ئەترووشی

٣ـ شاکیر فەتاح

٤ـ د. نەسرین فەخری

٥ـ ڕەوشەن بەدرخان

٦ـ مەمدووح سەلیم

٧ـ ئەکرەم جەمیل پاشا

٨ـ عەلی سیدۆ گۆرانی

٩ـ عەرەب شەمۆ

١٠ـ حاجی جندی

١١ـ محەمەد مستەفا کوردی

١٢ـ د. جەمال ڕەشیدی بژیشك

١٣ـ جەمال عەبدولقادر بابان

١٤ـ محەمەد مستەفا

١٥ـ د. کەمال محەمەد سعید خەیات

١٦ـ د. سامالٚ مەجید فەرەج

١٧ـ د. عەزیز ئەحمەد

١٨ـ د. ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر

١٩ـ سادق بەهائوددین ئامێدی

٢٠ـ عوسمان عەونی

٢١- کامیل بەسیر

٢٢- کەمال جەلال غەریب

٢٣- حافز مستەفا قازی

٢٤- تاهیر نەقشبەندی

٢٥- محەمەد ئەمین عوسمان

٢٦- شوکور مستەفا (دوای چەند مانگێ؟)

٢٧- محەمەدی مەلا کەریم (پاش چەند مانگێ؟) و هتد..

هەروەها کۆڕ ئەم لیژنانەشی لە ئەندامانی کارا و یاریدەر و شەرەف، دامەزراند:

١- لیژنەی زمان و زانستەکانی

٢- لیژنەی ئەدەبیات و کەلەپوور

٣- لیژنەی زانستە کۆمەڵەکییەکان

٤- لیژنەی زانستە پەتییەکان

٥- لیژنەی فەرهەنگ دانان

٦- لیژنەی وەرگێڕان و کتێب دانان و بڵاوکردنەوە

٧- لیژنەی ژیاریی ئیسلام

٨ - لیژنەی کتێبخانە و کۆوار

٩- لیژنەی لێوەکۆڵینی زمان

١٠- لیژنەی زانستەکانی ئابووری

دیارە ئەم لیژنانە پتر بایەخیان بە زاراوەدانان دەدا.. بڕێ زاراوەی کارگێڕی، زاراوەی زانستەکانی خوێندن بە کوردی و هتد.. بەش بە حاڵی ئەوان ڕۆژان داندراون و سەرلەبەر بۆ وتوویژ لە سەرکردنیان لە لایەن خوێندەوارانەوە، پەی دەر پەی لە کۆواری کۆڕدا، کە ساڵی جارێ، بە بارستێکی گەورە دەردەچوو، پاشان بە سیپارە و کتێبیش، بەسەر یەکەوە، بڵاوکراونەوە.

کۆڕ بڕێ کتێبی بەردڵ گریشی بڵاو کردۆتەوە، بە نموونە: پەرچڤەی کوردیی

شەرەفنامە، بە کوردییە پاراوەکەی مام هەژار، شرۆڤەی دیوانی نالی، شرۆڤەی دیوانی مەحوی، دیوانی فەقێ قادری هەمەوەند، شیرین و فەرهادی خانای قوبادی،، سێ بەرگە کتێب لەمەڕ حاجی قادری کۆیی، سۆرانیی داستانی دمدمی عەرەب شەمۆ و ئەفسانەی چیای ئاگریْ و هتد.. لە چاپەمەنییەکانی کۆڕن.

کۆڕ چاپخانەی خۆی لەبۆ فەراهەم کرا. دەستەی کادرۆی تایبەتی خۆی لۆ دامەزرا. کتێبخانەی دامەزراند؛ کارگێڕی لێزانی بۆ دامەزراند. بە هەزاران کتێبی بە زمانانی جۆراوجۆری دنیایێ کڕین و بە دیاری خڕکردەوە، ژمارەی کتێبانْ خۆی لە ٢٥ هەزار کتێبانْ دا، چەندین گۆوار و ڕۆژنامەی کۆکردنەوە و دە خزمەت ئەندامانی کۆڕ و لێوەکۆڵانیدا دانان. نزیکەی ٥٥٠ دەستنووسی بە عەرەبی، فارسی ، کوردی، تورکی، ئازەری، کوردیی باکوور ئەرشیفبەندی کردنْ و تا وێستاکەش لە کۆڕی زانیاری عیراق، دەستەی کورددا، پارێزراون. هەروەها، چەندین بەڵگەنامە و دەستاوێژی بە زمانانی جۆراوجۆر بە مایکرۆ فیلم و ڕوونووس، خڕکردوونەوە.

کۆڕ دە پێشدا، لە خانککەیلێکدا کاری دەکرد، کە لە تەواوە کۆڕی زانیاری عێراقی تێدا دەحاوایەوە؛ پاشان حوکوومەتی بەغدا ٥٠ هەزار دینار و کۆڵبەنکییان ٥٠ هەزار دیناری دیکەیانْ بۆ ڕۆنانی تالاری کۆڕی زانیاری کورد لە بەغدایێ بەخشی، کاک ئیحسانْ شێرزاد نەخشەی لەباری بۆ کێشا و حەسیب سالح بە قۆنتەرات دە عۆدەی گرت و لە ساڵی ١٩٧٩دا، کۆڕ ڕایگوێزتە تالاری نوێی خۆی.

کۆڕی زانیاری کورد لە بەغدایێ لە ساڵی ١٩٧٤ دا، پاش هەڵایسانەوەی شۆڕشی ئازادیخوازنەی نەتەوەی کورد بە سەرکردایەتیی بارزانیی نەمر، لە کوردستانی عێراقدا، بە نەمانی چەند ئەندامێکی، کەلێنی تێ کەوت.. مام هەژار هەر زوو چووە شاخی و، د. کەمال ئەحمەد مەزهەر و کاک ئیحسان شێرزاد، پاش نسکۆی شۆڕش، لابران. بە پێی یاسای کۆڕ یەکەم جێگری سەرۆکی کۆڕ، کاک مەسعوود محەمەد بوو بە سەرۆکی کۆڕ. لە ساڵی ١٩٧٦ دا شوکور مستەفا کرا بە ڕازگری گشتی کۆڕ. بەلام کاک مەسعوود لە سەر هێندێ نووسینی، کە حوکوومەت بە دڵی نەبوون، لە سەرۆکایەتیی کۆڕ وەلا نێخرا،

ئەویش تۆرا، چووە عەممان.. پێم وایە نزیکەی مەودایەکی لەوێ مایەوە، وەلێ پاشان وەگەڕا بەغدایێ. پاش وەی کاک مەسعوود وەلا نێخرا، بە پێی یاسا، مامۆستا عەلائوددین سەججادی، دووەم جێگری سەرۆکی کۆڕ بوو، ئەو بوو بە سەرۆکی کۆڕ.

دوایی، سالی ١٩٧٩ ی بەسەردا هات، کۆڕی زانیاری کورد حوکوومەتی بەعدا لەبەریەکی هەلوەشاندەوە و ناوەکەی بوو بە "کۆڕی زانیاری عێراق/ دەستەی زمانی کوردی" و ئەم زاتانە بە ئەندامیەتیی ئەم دەستەیە دامەزرێندران:

١. کاک عەزیز ئاکرەیی سەرۆکی دەستە

٢ - مامۆستا مەلا کەریمی بیارە ئەندام

٣. د. کامیل بەسیر ئەندام

٤. د. جەلال سالح ئەندام

٥. د. جوامێر مەجید سەلیم ئەندام

٦. د. حەسەن کەتانە ئەندام

٧. مامۆستا مووسا عەبدوسسەمەد ئەندام

هەر چەندە ئەم بەرێزانە کوردی دلسۆز و پیاوی باش بوون، بەلام بە داخەوە هیچیان، لە مامۆستا مەلا کەریم، کە لە کابینەی پێشووی کۆڕدا ئەبوو بە ئەندام و د. کامیل بەسیر بەولاوە باوەڕ ناکەم سەروساختیان بە زمانی کوردییەوە هەبووبێ.

دە سالی ١٩٨٠دا کاک عەزیز لە بەغدایێ دوور کەوتەوە، د. جوامێر بوو بە سەرۆکی دەستەی کورد. تا ئەوڕۆش هەر ئەوە لەو دەستەیەدا ماوەتەوە. دەستەی کورد، درێژەی بە دەرچوونی گۆوارەکەدا و نزیکەی ١٨ ژمارەیەکی تا هەنگێ دەرچووبوو، تا سالی ١٩٩٥ یش هەر بەردەوام بوو.

هەرچی کۆڕی زانیاری کوردستانە، بەش بە وەندەی بەندە، لە ماوەی ١٩٩٨ەوە تا ٢٨ /٢٠٠١/١١، کە کۆڕەکە هێشتا دانەمەزرابوو، هێندێ کاری ئەنجام دا، کە ئەمانەی پایینن:

١. وەرگرتنی پارچە زەوییەك بۆ بۆنانی تالاری کۆڕ، کە کاک نێچیروان بارزانیی بەرێز

زۆر جوامێرانە بڕیاری فەرموو و پاش تاپۆکران و نەخشە و پەیکەرەی لەبار بۆ داندرانی، لە ساڵی پارەوە، دەست بە ڕۆنانی کراوە و نزیکەی ٩ ملیۆن دیناری لە بودجەی فەرمانڕەوایی هەرێمی کوردستان بۆ تەرخان کراوە و لە مانگی ٤ ڕابردوودا بەڕێز سەرۆکی حوکومەتی هەرێمی کوردستان، کاک نێچیروان بارزانی، بەردی بناخەی بۆ دانا. بە هەویاین کە لە کاتی دەستنیشان کراوی خۆیدا، ئەو تالارە تەواو بێ[1].

٢- بڕێ ئەسپاب و پێداویستی دوو سێ ژوور پۆشتە کردنەوە و پێناوی کارەبایی و لە چاپدان و شمەکی باش وەك بەرکول بۆ سەرەتای کۆڕ دابین کراون.

٣- ١٤ - ١٥ لیژنە بۆ بە زاراوەکانی کتێبە فێرگەییەکاندا چوونەوە، داندراون و لە کاتی دیاری کراوی خۆیاندا، ئەو کارە ئەنجام دراوە و نزیکەی ٤٠ هەزار دینار بە پاداشت بە ئەندامانی پسپۆڕانی بەڕێزی ئەو لیژنانە خەلات کراوە و ئێستا دەبەر دەستی لیژنەی پشپۆڕی کوردان و کاریان لەسەر دەکرێ.

بەش بە حاڵی دامەزراندنی کۆڕ، لە ٢٠٠١/١١/٢٨ دا ٥ ئەندامی تەرخان بۆ کۆڕ لە

---

[1] پیاو هەق بێژێ، بۆ پارچە زەوی پەیدا کردنەکە، جەنابی کاک شێخ مەئموون بریفکانی، وەزیری شارەوانی و کاک ئەندازیار یوسف کەننا، وەزیری کاروباری نیشتەجێکردن زۆریان جوامێری نواند کاک مەهدی خۆشناو، جێگری پارێزگاری هەولێر و سەرۆکی یەکیەتیی نوسەرانی کورد / لکی هەولێر، کە زۆر مەردانە و دڵسۆزانە ئەو پارچە زەوینەی بۆ پەیداکردین و بەڕاستی ئەو نەیا، ئەو زەوییەمان لەو شوێنە بەرچاو و لەبارەدا، وەگیر نەدەکەوت ماڵی ئاوا بێ. هەروەها زۆر سپاسی ئەندازیاری پارێزگای هەولێر، خانم چیمەن ساڵح، کە زۆر بە پەرۆشەوە یارمەتیی داین، دەکەم. هەروا ئەندازیارانی بەڕێز: کاک جەوهەر پەترۆس جەرجیس و کاک جەلال جەوهەر سەعدوون شوانی، زۆر زیرەکانە، توانییان ئەوەی بەندە بۆ تالارێك کە بۆ کۆڕی زانیاری کوردستان بگونجێ بە بیرمدا دەهات، دە تەزەر بگرن و لە ٥ - ٦ کۆبوونەوەی جۆربەجۆردا، بە تێروتەسەلییەوە، وتوویژ لەسەر پەیکەرەی ئێکرای کرا و لە رووی مێژووی کوردستان و ناوچەی مێزۆپۆتامیا و مێژووی ئیسلام و عێراقەوە، نەخشەی تەرز و لەباری میعمارییەتی شیاوی بۆ کێشرا و بە شێوەی بەرجەستە پەیکەرەی بۆ دروست کرا. هەروەها، منەتباریی خۆم بۆ ئەندازیاری بەڕێز و دڵسۆز، کاک زانا مستەفاغای عوزێری دەردەبڕم، کە مەردانە بە سەر بەقۆنتەراتدان و ڕەسمییاتی دیکەی ڕۆنانی تالارەکە ڕاگەیشت.

لایەن ئەنجومەنی وەزیرانەوە دانران، هەروەها لە پاش ئەوان، بە پێی یاسای کۆڕ، ٦ ئەندامی دیکەش بە ناوی ئەندامانی کاراوە، پاش دەستیشان کرانیان لە لایەن پێنج ئەندامی تەرخانی کۆڕەوە، دامەزرێندراون.

لە بارەی سەرۆکی کۆڕەوە، کاک د. شەفیق قەزاز، وەزیری کاروباری مرۆڤایەتی بە بریکاری، بە سەرۆکی کۆڕی زانیاری کوردستان و جێگری سەرۆك و سکرتێر هەڵبژێردران. ئەنجومەنی کۆڕ دەستەی باڵای کۆڕی هەڵبژارد، کە بریتین لە پێنج ئەندامی تەرخانی کۆڕ، بۆ بە سەر کار ڕاگەیشتن، لە پێشەوە، تالارێکی گەورەی ڕێك و پێکی بە نزیکەی ملیۆنێ دینار بۆ کۆڕ کڕیوە و پاش پڕنەسپاب وپێداویست کرانی، کۆڕ دەستی بە کارەکانی خۆی کردووە. نزیکەی ١٠ـ١٢ کۆبوونەوەی ئەنجام داوە، هەروەها بڕێ گرفتی ڕێنووسی کوردیی یەکلاکردووەتەوە، بە یاسای کۆڕدا چووەتەوە و پێشنیهادی ئەندامان و پسپۆڕانی لەمەڕ گەڵاڵە کردوون و خۆی بۆ ڕێنمایینامەدانانی ئامادە کردووە.

دەستەی باڵای کۆڕیش تا ئێستا بە پێی پێویست زێتر لە ١٠ کۆبوونەوەی بۆ کاروباری بە پەلە ئەنجام داوە.

کۆڕ، بۆ پتر پتەوکردنی هاوپێوەندییەکانی دەگەڵ زانایان و پسپۆڕ و لێزانانداء بە سەرچەند بە پیرەوە چوونێکی میوانانی هەندەراندا ڕاگەیشتووە و سەرۆکی کۆڕ دەگەڵ بڕێ پسپۆڕ و زانا و لێزانی کوردی دوورە وڵات و نێو وڵاتدا سەروکاری گەڵاڵە کردووە.

کۆڕ تا ئێستا ئەم لیژنانەی لە ئەندامانی کۆڕ دامەزراندووە:

١- لیژنەی ئەدەبیات

٢- لیژنەی ڕێزمان

٣- لیژنەی کۆوار دەرهێنان

٤ - لیژنەی بە سەر کەلەپوور و دەستنووس و بەڵگەنامە و دەستاویز ڕاگەبشتن و خڕکردنەوەیان.

٥- لیژنەی دانانی فەرهەنگێکی کوردی - کوردی، کە سەرلەبەری زارەکانی کوردی بگرێتەوە، بە پێی نوێترین و لەباوترین دەستووری فەرهەنگ دانان و ڕێ و ڕەسمی تازە.

٦- کۆڕ بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری پێویست، ١١ کارمەندی کارگێڕی و ژمێریاری و کۆمپیوتەر و شووفێر و هتد.. دامەزراندووە.

٧- جینێرێتەری گەورەی بۆ کۆڕ کڕیوە.

٨ - دوو - سێ ئوتومبیلی بۆ ئەندامانی تەرخان و هاتوچۆی کارمەندانی کڕیوە.

بۆ ئەم باسە ئەم سەرچاوانەم خوێندووەتەوە:


١ - Materyalist Felsefe sozlugu

٢ - Azerbacan Anseklopedyasi

٣ - لغت نامەء دهخدا

٤ - شفاء الغليل

٥ - الدَّخيل في العربيَّة

٦ - المزهر للسّيوطي

٧ - مێژووی دامەرزراندنی ئەکادێمیا لە جیهاندا/ بە تورکی

٨ - تەعریفاتی سەیید شەریفی جورجانی

٩ - ئوسووڵی فیقە (جمع الجوامع)

١٠ - مێژووی زاراوەڕانان، گاتفرێد شووتز

١١ ـ بنیاتگەری و زاراوەرانان

١٢ ـ زمان لە نیگای مارکسیزمەوە

١٣ ـ بەرجەستەکاری و رووتاندن.

١٤ ـ المنعكس الشّرطي/ د. نوري جعفر. (بافلۆف)

١٥ ـ سیمانتیکا (دەلالەتکاری) لە رووی ئایدیالیزمەوە (پرۆتاگۆراس و ئەفلاتوون/ لە باسی زماندا)

١٦ ـ یاسای کۆری زانیاری عیراق

١٧ ـ یاسای کۆری زانیاری کورد لە بەغدایێ.

١٨ ـ یاسای کۆری زانیاری کوردستان لە هەولێر

١٩ ـ بریارەکانی کۆری زانیاری کوردستان.

## ملخّص البحث

شكور مصطفى

### الأكاديميا، وضع المصطلحات
### المجمع العلمي الكردي و المجمع العلمي الكردستاني

يتناول البحث موضوع تاريخ الأكاديميات وأصول وضع المصطلحات وتأريخ تأسيس المجمع العلمي الكردي العام ١٩٧١ في بغداد و المجمع العلمي الكردستاني العام ٢٠٠١ في اربيل.

## *Abstract*
### *Accademies and Terminology*

*Shukur Mustafa*

The Study is about the history of academies and their work regarding terminology, the establishment of the Kurdistan Academy in Baghdad in the year 1970, and the Accademy of Kurdistan in Arbil in 2001.

# بناڤێ خودێ مەزن و دلۆڤان
# هۆزا بەرگری د هۆزانێت (تیریژ)یدا

د. عەبدوڵلا یاسین ئامێدی

**پێشەکی:**

ئەدەبێ کوردی جیهانەکا بەرینە و هۆزان ژی پشکەکا مەزن و سەرەکییە د پێک ئانینا وێدا. هۆزانا کوردی ب درێژاپا مێژوویا خۆ تایبەتی و بابەتێت جوراجور هەبووینە؛ گوهرین کاری گەلەک جارا د وان بابەتادا هاتینە کرن ژ لایێ ڕوخساری و ناڤەرۆکێ ڤە. واتە: هۆزانا کوردی تووشی گوهرینێ بوویە، ئەگەر لە سەردەمەکی هۆزانا کوردی تەنها بابەتێ دلداری و ئەڤینی یان ئایین و سۆفیگەری ب خۆڤە گرتبیت، یان هندەک جارا دگەل بابەتێت ستایش و مەی نۆشی و ئامۆژگاری.. دهاتە تێکەل کرن، جار هەبوویە هۆزانا کوردی ژبۆ دەربڕینا هەستا نەتەوایەتی و نیشتمانی، یان دیارکرنا ئاریشێت جڤاکی و هندەک جارا ژی ژبۆ خزمەت کرنا دۆزا ڕەوایا گەلێ کورد ژ پێخەمەت ئازادی و ڕزگاریێ هاتیە نڤیسین.

هۆزانا بەرگری ژی ئێک ژ وان بابەتایە، کو هۆزانڤانا هەول دایە ب ڕێکا وێ خزمەتا بزاڤا ڕزگاریخوازا گەلێ خۆ بکەت خامێت خۆ د وێ ڕێبازا پیرۆزدا بکارئانینە. ئەڤ چەندە ژی خویا دبیت د بەرهەمێت خانی و حاجی و سالم و بێ کەس و جەگەرخوین و .. هتد.

ژ بەر ڤێ چەندێ ئەم دکارین بێژین کو هۆزانا بەرگری ژی پشکەکا مەزن و دەولەمەندە د پێکهاتا هۆزانا کوردیدا. (تیریژ) ێ هۆزانڤان ژی خامێ بەرگری کرنێ ب دەستێ خۆ گرتییە و خۆ د جیهانا هۆزانا بەرگرییدا تاقی کریە و پرانیا هۆزانێت وی ئەو بێهن و بۆ ژێ دهێت. لێ هەتا نهۆ سێ دیوان ب چاپ گهاندینە و چ ڤەکۆلینێت زانستی دەربارەی هۆزانێن وی نەهاتینە ئەنجامدان، نەمازە هۆزانێت بەرگری؛ ژ بەر ڤێ چەندێ من ئەڤ بابەتە هەلبژارد، هیڤیدارم بشێم مافی بابەتی بدەمێ و ڕۆناهیێ بەردەمە سەر ڤی لایەنێ گرنگ د ناڤەرۆکێت هۆزانا ویدا.

### ژیاننامێ (تیرێژ) ی

ناڤێ وی (نائیف)ە، کورێ (حەسق) یە، ل سالا (١٩٢٣) ز. ل گوندێ (نجیمی)، قەزا قامشلو، پارێزگەها جزیرێ هاتیە دونیایێ؛ ژ مالبات و خێزانەکا هەژار و دەست کورت بوو، (دەمێ ئەمەنێ وی بوویە [٦-٧] سال، بابێ وی مالا خۆ ڤەدگوهێزیتە [سێمتیکێ] و ل وی جهی ئاکنجی دبیت و ل چەم (مەلا ئیبراهیمێ گولی) دەست ب خواندنا قورئانا پیرۆز و چەند پەرتوکێت ئایینی دکەت و ل دویڤ ئاموژگارییێت سەیدایێ خۆ پێنگاڤا دهاڤێت و دچیت)[1] . ل سالا (١٩٣٧) ێ و ل سەر داخوازا سەیدایێ خۆ پێگیری کرن ب ئاموژگاری و ئاخافتنێت وی ((دچیتە قوتابخانا حکوومی ( فەرمی) ل بازێرێ ئاموودێ و (٥) سالان بەردەوام د بیت ل سەر خواندنێ، بەلێ ژبەرمەرجێت ئابووری نەشیا بەردەوام بیت ل سەر خواندنێ، بەلێ ل وێرێ پێوەندی و تێکەلیێن وی ب چەند مرۆڤێت وەلاتپارێز و نیشتمان پەروەر مینا جگەرخوین، قەدری جان، حەسەن هشیار، نورالدین زازا خورت د بن))[2] . ئەڤان ناڤدارا کار تێکرنەکا مەزن هەبوو ل سەر ژیان و هەژاندنا هەستا وی یا نەتەوی و پتر ڤێری کوردایەتیێ بوو، ب هزرا من هەر ئەڤ ئەگەرە بوو، کو تیرێژ پالدای (ل سالا ١٩٣٨ بچیتە د ناڤ رێزێت کۆمەلا سەر ب خۆ یا کوردی (خویبوون) ژ بەر هەندێ پتر ژ جارەکێ هاتییە گرتن و زیندانکرن)[3] .

هەر وەکو مە ل سەرێ دیارکری، کو ئەڤ هەڤبەندی و تێکەلیا دناڤبەرا ویدا و وان رەوشەنبیر و زانا و نڤیسەر و هوزانڤانادا، بۆ ئەگەرا هندێ کو ئەڤین و حەژێکرنا ڤەهاندنا هوزانا د دلێ ویدا خورت بیت، دیارە ئەڤ رێکە ل دەڤ (تیرێژ) ی باشترین و پیرۆزترین رێك و رێرەوە کو دوی سەردەمیدا خەبات و بزاڤا خۆ یا نیشتمانی پێ بدۆمینیت، ئەخاسمە پشتی (تیرێژ) شیای (( گەلەك ژ سەرکردە و ناڤدارێت کورد بنیاسیت، وەکی (هەمزە بەگێ مەکسیمی) کو ئێك ژ پشکدارێت شۆرەشا (شێخ سەعید) ێ پیران ل سالا ١٩٢٥))[4] . ئەڤ چەندە بۆ ئەگەرا خورتبوونا پتر پێوەندی کرنێ ب وان کەسان ئەڤێت رۆلەکێ مەزن و گرنگ دیتی د رێڤەبرنا شۆرەش و سەرهەلدانێت کورداندا. ئەڤێ جۆرە نیاسین و هەڤبەندیێ کاریگەرییەکا ئێکسەر ل

سەر (تیرێژ)ی کربوو، ئەڤە ژی بوویە ئەگەرا بلند بوونا ئاستێ وی یێ شۆرەشگێری و هاندەرەکێ ب هێز و موکم بوو، کو بەردەوام بیت ل سەر ڤەهاندنا هۆزانا د پاشەڕۆژێدا.

دیارە ئەڤان هەمی ئەگەرا پێکڤە سەیدایێ ( تیرێژ) هاندایە، کو د گەنجاتیا خوەدا دەست ب ڤەهاندنا هۆزانا بکەت. ئەخاسمە پشتی (خەلکێ (ئامووود) یێ بڕیار دا، کو ئەندامێت (یانا کوردستان) و کۆمەلا (خویبوون) بهنێرنە دەف (کامیران بەدرخان) ی ل بەیرووتێ لە سالا ١٩٤٣، ئاکو دیڤچوونەکێ ل سەر بەلاڤکرن و هنارتنا ڕۆژناما (ڕۆژا نوی) بکەن، ئەوا دهاتە وەشاندن ژ لایێ بەدرخانیاڤە ب زمانێ کوردی)[4].

تیرێژ بەری ب دیدار و چاڤ پێکەتنا (بەدرخان) ی شاد بیت هەست ب ڤەهاندنا هۆزانەکێ کریە، سکرێ هزر و بیریێت وی هاتیە پەڤاندن و دوڕ و یاقیت و گەوهەر ڤەهاندینە و شەوق و تەیساندنا وان بوویە ڕۆناهی و فەنەر و چرا بۆ هەر چار پارچێت کوردستانێ، ئەخاسمە کوردستانا باکوور، ناڤەڕۆکا وێ هۆزانێ ل سەر بابەتێ ڕەوش و خەمل و بەلاڤکرنا ڕۆژناما (ڕۆژا نوی) بوو، ئەڤ جۆرە هۆزانە جهێ دلخوشیا (کامیران بەدرخانی) بوو؛ چونکە ئەڤە ئێکەمین هۆزان بوو، تیرێژ بڤەهینیت و پێشکێش بکەت. بێگومان ڕازیبوون و پەسەندکرنا هۆزانێ ژ لایێ کامیرانی ڤە، دلنیایی و باوەر ب خۆکرن ئێخستە د ناڤ هزر و هۆش و بۆچوونێت ویدا، ئێدی ئەڤ دەستپێکە بۆ پالدەرەکا ب هێز و خورت، کو تیرێژ دەست ب ڤەهاندنا هۆزانا بکەت ب شێوەکێ بەردەوام و بێ ڕاوەستیان. هەژیە بێژین ئێدی ژ هنگی وەرە هەتا نهۆ ((نازناڤێ خۆکرە (تیرێژ) داکو وەکی تیرۆژکێت ڕۆژێ ڕۆناهیێ بێخیتە سەر ئەدەبیات و فۆلکلۆر و مێژوویا کوردا))[6] . بەلێ دیارە سەیدایێ (تیرێژ) نە هەر بڤێ چەندێ ڕازی دبیت، بەلکو خەبات و چالاکیێت وی کارێت سیاسی و جڤاکی ژی ڤەدگرن. بۆ نموونە (کۆمەلا خویبوون) داخاز ژ چەند ئەندامێت خۆکر، ئێک ژ وانا سەیدایێ تیرێژ بوو، کو بچنە دەڤەرا ماردین، ژ پێنخەمەت بەلاڤکرنا هندەک چاپکریێت نوی، ئەڤێت دهاتین چاپکرن ژ لایێ کۆمەلێ ڤە))[7] . ژ بۆ هشیارکرن و ئاگەهدارکرنا ئاکنجیێت وان دەڤەرا ل سەر ڕەوش و سەر و بەرێ کوردان د وی سەردەمیدا. بەلێ وەسایا دیار بوو، کو ئەڤ

بەلاڤکرنە جهێ نە ڕازیبوونا هێزێت تورکی بوو، ژ بەر هندێ رابوون ب دیڤچوون و ڤەکولینێ ل سەر وان کەسان ئەڤێت رابین ب ئەنجامدانا ڤی کاری. ژ بۆ هندێ کو [تیریژ] گیانێ خۆ رزگار و قورتال بکەت و نەکەڤیتە بەر دەستێت هێزێت تورکا، (نەچار دبیت جل و بەرگێت ژنکا بپوشیت و ل بەر خۆ بکەت، بڤێ فێلێ شیا هێزێت تورکی بخاپینیت و گیانێ خۆ بپارێزیت و ژ بازێرێ (ماردین) ێ دەرکەڤیتن)[8].

بەلێ دگەل هندێدا (تیریژ) خاڤ و سست نەبوو، بەلکی هەر بەردەوام دبیت سەر ئەندامەتییا خۆ د ناڤ ریزێت (کۆمەلا خۆیبوون) دا، هەتا سالا (١٩٤٦) ئانکو پشتی ڕزگاربوونا حکوومەتا سوریا ژ دەست هەلاتا فەرەنسا.

ل سالا (١٩٥٤) ێ، (تیریژ) (ب دەستی دەزگەهێت سەرکوت کەر د هێتە گرتن و دئێخنە د ناڤ زیندانێدا. هەروەسا دیواناکا وی یا دەست نڤیس ژی هاتە گرتن و تالانکرن، ئەڤ چەندە بوویە ئەگەرا هندێ کو ئەو دیوان نەهێتە چاپکرن و بەلاڤکرن)[9].

ئەڤ گرتنە نەبوو ئەگەرا هندێ کو (تیریژ) ژ قاد و مەیدانا خەباتێ دوور بکەڤیت، چونکە پشتی ژ زیندانێ هاتیە بەردان، ئەوی (ئێکسەر قەستا ڕێکخستنێت نەتەوەیی و رامیاری کرد بوو ئێک ژ ئەندامێت چالەنگ د ناڤ ریزێت (پ. د. ک.) ئەوا ل (١٤) خزیرانێ سالا ١٩٥٧ ل سووریێ هاتیە دامەزراندن. ئەڤێ پارتێ هاریکاریا وی کر، کو بەردەوامیێ بدەت نڤیسین و بەرهەمێت خۆ یێت ئەدەبی بەلاڤ بکەت)[10].

تیریژ مرۆڤەکێ هشیار بوو، ژ بلی هندێ کو هۆزانڤانەکێ ژیهاتی و خودان هەلویست و شیانێت وی دبێ سنوور بوون. هەردەم دگەل مللەتێ خۆیێ کورد دژی، ئاگەهداری ڕەوش و سەر و بەرێ هەر چار پارچەیێت کوردستانێ بوو، چونکە دەمێ شۆرەشا ئیلولێ ل (١٩٦١) ێ دەست پێکری، ئەوی خۆ ب شۆرەشێ ڤەگرێدا، ژ نێزیک ئاگەهداری دەنگ و باسێت شۆرەشێ بوو. هەروەسا ئەو گەلەکێ دلخبار بوو، ب کەسایەتیا سەرکردێ شۆرەشێ (بارزانیێ نەمر) و شێوێ ڕێبەری و ڕێڤەبرنا وی بۆ شۆرەشێ، ئەڤ چەندە ژی د ناڤ بەرهەمێت ویدا خویا و دیارە)[11].

ئێك ژ ئەگەرێت هندێ کو ئیرێژ خودان هزر و بیرێت بەرفرەه و دەولەمەند بوو، ئەوە کو وی [مفایەکێ باش و مەزن ژ خواندنا پەرتوکێت کوردی و عەرەبی دیتیە](١٢) ئەڤە بوویە ئەگەرێ هندێ کو (ئیرێژ) ی ئاسۆیەکێ بەرفرەه هەبیت و پتر مەلەڤان و هۆستایێ پەیدا بکەت د بوارێ ڤەهاندنا هۆزانادا و گەلەك بابەتێت دی ژی ... هتد.

هەژییە د دوماهیا ئاسناما ژیانا ویدا بێژین، کو ئیرێژ هەتا نهۆیێ ساخە و ژیانا خۆ ل دەڤەرا (حەسەکە) دبەتە سەر و ئێ بەردەوامە ل سەر بزاڤ و چالاکیێت خۆ، ئەمازە د بوارێ ڤەهاندنا هۆزانادا و ب تایبەتی هۆزانێت بەرگری و شۆرەشگێری.

**بەرهەم و نڤیسینێت (ئیرێژ) ی**

مەبەست ژ ڤێ خالێ ئەوە؛ کو بەرهەمێت هۆزانڤانی بەرچاڤ بکەین و بدەینە نیاسین، چونکە هەتا نهۆ ئەڤ هۆزانڤانێ خەباتکەر وەکو پێدڤی دناڤ جڤاکێ کوردیدا، نە گەلەکێ بەرنیاسە، بەلکو تنێ ژ لایێ هندەك نڤیسەر و ئەدەب دۆست و رەوشەنبیرا ڤە دهێتە نیاسین و ئاگەهداری بەرهەم و بزاڤێت وینە. ب هزر و تەخمینا من ئەڤەژی دزڤریتە هندێ کو بەرهەمێت وی ب تیپێت لاتینی هاتنە چاپکرن و پرانیا خەلکێ مە، شەهرەزای خواندنا وی شێوێ نڤیسینێ نینن. لەوما مە ب فەری دیت، کو رۆناهیەکێ بەردەینە سەر وان کتێب و دیوانێت وی یێت هاتینە چاپکرن و بەلاڤکرن و زانیاری و پێزانینێت راستەڤینە و پێدڤی ژی دەربارەی دیار و ئاشکرا بکەین.

**ا- دیوانا خەلات:**

دهێتە هژمارتن کو ئێکەمین بەرهەمێ سەیدایێ (ئیرێژ) ە، بۆ جارا ئێکێ ل سالا (١٩٥٢) دا هاتە چاپکرن، بەلێ نەهاتە بەلاڤکرن، ژ بەرڤێ چەندێ د ئەگەرا چاپکرنا وێ دیوانێدا هاتە زیندانکرن، پشتی ژ زیندانێ دەرکەتی بۆ جارا دووێ هاتە چاپکرن؛ بێ کو ناڤێ چاپخانێ و سالا چاپکرنێ ل سەربیت. هەروەسا دیوانا (خەلات) بۆ جارا سێ ژ لایێ بنگەهێ (نیشتمان) ڤە، ل سالا (١٩٩١) ل ستۆکهولم ل سوید هاتیە چاپکرن. ئەڤ دیوانە ژ (٢١٣) لاپەرا پێك دهێت و بڤی ئاوایێ خوارێ دابەش کرییە:

أ - سەرڕپێهاتیا ئەڤینێ (٢) هۆزانن.

ب - بەشێ مارش و رستان (٢١) هۆزانن.

ج - بەشێ گازن و شینان (١٠) هۆزانن.

د - بەشێ ئەڤینێ (٣٦) هۆزانن.

هـ - چەند رستێن چاندی و چیرۆکی (٩) هۆزانن[١٣].

هەژی گۆتنێیە کو هەمی هۆزانێت دیوانا (خەلات) کلاسیکی نەوبابەتێت جۆراوجۆر بخوڤە گرتینە و ژ هەست و سۆزەکا پاقژ و بێگەرد هاتینە ڤەهاندن و کێش و سەروادارن.

**٢- دیوانا زۆزان:**

ئەڤ دیوانە ل سالا (١٩٩٠) ل شامێ هاتیە چاپکرن، (دلاوەر زەنگی) پێشگۆتن ژێرا نڤیسییە، قەوارێ وێ ناڤنجییە و ژ (١٤٥) لاپەرا پێك دهێت. ئەڤ دیوانە ل سەر چوار پشکا هاتیە دابەشکرن:

أ - سیپان و پەروین: هۆزانەکا درێژە و ب شێوەکێ داستانکی هاتیە دارێژتن، ژ لاپەرە (١- ٣٢) یە.

ب - برێ ئەڤینێ: (٤٤) هۆزانێت دلداری و ئەڤینێ نە، ژ لاپەرە (٣٣) ێ دەست پێ دکەت هەتا لاپەرە (٦١).

ج - هەلبەستێن پەروەری و خوەشخوان: ژ (٣٨) هۆزانا پێك دهێت هەر ژ لاپەرە (٦٢) هەتا لاپەرە (١٢٥) ە.

د - برێ شینێ: ژ (٨) هۆزانا پێك دهێت و ژ لاپەرە (١٢٦) هەتا لاپەرە (١٤٥) ە[١٤].

**٣- دیوانا جوودی:**

ئەڤ دیوانە ل ئادارا سالا (١٩٩٨) ێ، ل بەیرووتێ، ل چاپخانا ئەمیرال هاتیە چاپکرن. ژ (١٧٥) لاپەرا پێك دهێت و ڤان بابەتێت ل خوارێ دیارکری بخوڤە دگریت.

أ - سیامەند و خەجێ، هۆزانەکا داستانکییە، ژ لاپەرە (١١) دەست پێدکەت هەتا لاپەرە (٣٦).

ب - برێ جڤاکی و پەروەری: ژ (٣٥) هۆزانا پێـک دهێـت، ژ لاپـەرە (٣٩) هـەتا لاپەرە (١١٦) ڤەدگریت.

ج - برێ ئەڤینی: ژ (١٦) هۆزانا پێك دهێت و هـەر ژ لاپـەرە (١١٩) هـەتا لاپـەرە (١٤٢) بخوڤە دگریت.

د - برێ دیـاری و شینی: ئـەڤ بەشـە ژ (١٢) هۆزانا پێك دهێت و هـەر ژ لاپـەرە (١٤٥) هەتا (١٧٥) بخوڤە دگریت.

**٤ـ کتێبا سەرپێهاتیێن کوردا:**

ئەڤ کتێبـە ژ (٥٠) لاپـەرێت قـەبارە نـاڤنجی پێـك دهێت و ژ لایێ کۆڤـارا (ژانـین) - ١ - سووریا - قامشلۆ - هاتیە وەشاندن.

بابـەتێت ڤـێ کتێبێ دەربـارەی چـیرۆك و سـەر پێـهاتیێت فۆلکلۆریـنـە، نەخاسمـە ئەڤێت د ناڤ کوردێت سووریێدا هاتینە رویدان و ڤەوماندن.

ژ بلـی ڤـان بەرهـەما (تـیرێژ) ی کتێبـەك ب نـاڤێ (وەرگێرانـەك بـۆ پـەیدابوونا پێغەمبەری (س، خ) تفیسیبە)[14]. ئەڤ کتێبە وەکی (مەولودناما) بـە. بـەلێ هـەتا نـهۆ وەکو دەستنڤیس مایە و نەهاتیە چاپکرن.

(تیرێژ) هەر بڤـێ چـەندێ نارازەستیت، بـەلکو چاڤـەرێ ژێ دهێتـە کـرن، کـو د پاشـە رۆژێدا هندەك بەرهەمێت دی تر چاپ بکەت. چونکە ئـەڤ هۆزانڤانـە مرۆڤـەکێ دلسـۆژە و خەمخۆرە بەرامبەر دۆزا میللەتێ خۆ، خامێ وی بێ رەنگێن هەر دویێ مژارێدا خەباتێ دکەت و دهێتە ب کارئینان.

**ناڤەرۆکا بەرگرییێ د هۆزانێت (تیرێژ) یدا.**

تیرێژی دهۆزانێت خۆدا، دەرگەهێ گەلەك بابەتا ڤوتایە و ب زیرەکی و چـالاکی خـۆ دنـاڤدا بەردایە. مـاڤێ هـەر بابەتـەکی هـەروەکی وی ڤیبـای دایـێ، مینـا بابـەتێ هۆزانـا بەرگری، داداری و ئەڤینی، وەسف، نیشتمانی، ستایش و شـانازی، جڤـاکی و سیاسـی، پەند و ئامۆژگاری، مەی نۆشی و ... هتد.

بەلێ یا دیارە کو باهرا پتر خۆ د بوارێ هۆزانـا بـەرگریدا دبینییە، هەسپێ خـۆ تێدا

بەزاندییە، چونکە پرانیا هۆزانێت وی دەربارەی زۆلم و ستەمکاریا ل سەر نەتەوێ کوردە، ئەگەرێت بۆ دەستپا وان تێدا دیار دکەت، هەروەسا رێکا خەباتا راستەقینە و دروست پێش چاڤ دکەت، ژ پێنجەمەت رزگاریا کوردستانێ. دیسان گەلەک جەختێ ل سەر ئێکگرتن و تەبایی و جانفیدایێ دکەت و ب زمانەکێ شرین و زەلال و رەوان وان بیر و هزرا خویا و پێشکێش دکەت. بەلگە و گرۆڤە بۆ ڤێ هەلویستێ سەیدایێ تیرێژ گەلەکن، چونکە ئەو بخۆ گەوهەرێ هۆزانا لدویف بۆچوونا خۆ بۆ خەلکەکی دیار دکەت، دەمێ دهێتە زمان و دبێژیت:

- ما روومەتا شعرێ چییە، نە د خزمەتا مللەت دەبێ

رۆناهیا شعرێ چییە، پەسنێ وەلات کو تێدا نەبێ

چیکم ژ وێ شعرا رزی، دا نەگرە سەودا و مەژی

دەردێ دل و جانێ ناکوژی، چاخێ کو جەوهەر تێدا نەبی[١٦]

هەر وەکو مە دایەخویاکرن، کو پرانیا هۆزانێت وی دەم دانەکێ ژ هزر و بیرێت بەرگری، ئەڤ چەندە ژی ئاشکرا دبیت، دەمێ مرۆڤ ئاڤرەکێ ل هەر سێ دیوانێت وی (خەلات - رۆژان - چرودی) بدەت و خۆ بەردەتە دناڤ لاپەرێت واندا، دێ وەکی چاڤێ رۆژێ رۆهن و دیار بیت کو (تیرێژ) ب پایە و پەیسکا ئێکێ ب هۆزانڤانەکێ بەرگری دهێتە ل قەلەم دان. چونکە ب راستی باهرا پتر ژ هۆزانێت وی، هەر وەکو د وان دیوانادا هاتین، دەربارەی بابەتێ بەرگریێ نە ژ بۆ سەلماندنا ڤێ ئاخفتنێ، پێدڤییە بەرەڤ هۆزانێت وی بچین و ناڤەرۆکا وان شرۆڤە بکەین، داکو نیاز و مەخسەدا مە ژنڤیسینا ڤی بابەتی بەرچاڤ ببیت. د هۆزانا (ئەم ل پێ دۆزا خوەنە) گەلەک هزرێت بەرگری و بەرخۆدانێ دیار دکەت و دەردبریت، مینا هندێ کو ب زمانێ پێشمەرگەی کو جەڤەنگێ خۆراگری و بەرخۆدانا مللەتییە پەسنا خۆ دکەت، و داخوازیا ژیانەکا سەرفراز دکەت:

ئەم ل پێ دۆزا خوەنە

ئەم هەمی پێشمەرگەنە

ئەم ل خوە پڕ ئەولەنە

سەرفرازیێ دخوازم [17]

گازی دوژمنی دکەت کو ئێدی زۆلم و زۆرداریێ ژ وی قەبوول ناکەن، گەل یێ هشیار بووی و هەمیا خۆ ب چەکێ زانین و خاندنێ زەنگین کریە:

ئەم نە بەن و کۆلەنە

ئەی ستەمکار، ئەی تەرەس

ماهەیا کەنگی نەبەس

مللەتێ کورد ئەڤ شیار بوون

پێکڤە ژیر و خوەندنە [18]

د سەر هەندێ را ژی مللەتی هەمیان دەستێ خۆ دایە یەك و خەبات و بزاڤێ دکەن، و ل سەر ڕێبازا ئازادیێ بەردەوامن، گەلێ کورد ژ بەرگری و بەرخۆدانێ ڤاریێ نەبوویە، و ڤێ ڕێکێ بەرنادەت و ل سەر لێڤە نابیت و پاشەرۆژ هەر بۆ مللەتییە، دەما دبێژیت:

رۆژ هەلات، ڤا چوویە شەڤ    گەل هەمی، دەست دایە هەڤ

ئەو دکن کار و خەباتێ    ئەڤ ل پێ دۆزا خوەنە

مللەتێ کورد نامرە    قەت ژ ڤێ ڕێ ناگەرە

هەر وەکی تیریژ دبێ    چاخ و دەورانێ مەنە [19]

تیریژ د هۆزانا (ئەی وەلات) دا، سۆزا ئاخێ خۆ بەرامبەری خوشتڤی و حەژێکرنا نیشتمانی دەردەبڕیت، ژ پێخەمەت ئارزاندنا هەست و سۆزا مرۆڤێ کورد کو خوشتڤی و ئەڤینیا وەلاتی، ئەڤینیا چیا و دۆل و نهال و باغ و بیستانێت وەلاتی ل دلێ واندا بچینیت و بچەسپینیت، ژ بۆ هندێ کو گیانێ بەرگریکرنێ ل دەڤ وان بهێز و موکوم بکەت و ئاستێ ئەڤینداریا وەلاتی لنك وان بلند بکەت، هەر وەکی ئەو سۆز و پەیمانێ بەرامبەر ڤێ ئەڤینداریێ ددەت، کو دەست بدەتە دارێ تڤەنگێ کو ئێدی چوکا خۆ ژ سەر عەردی نە ڕاکەت، ژ بو بەرگریکرنێ ژ سەروەریا وەلاتی:

دەست ل سەر داریێ تفنگم، چۆك ژ عەردی نابرم

پاسیپان و لەشكەریێ ئارمانج و نیشانیێ تەمە

ئەی وەلات ئەز جانفیدایێ، دەشت و زۆزانیێ تەمە

جانفیدایێ ئاف و دەحل و باغ و بیستانیێ تەمە

سوند و پەیمان بیێ، ل سەر من، دیێ تە پاریزكم وەلات

خوینا نارنجی بریژم، مەردیێ پێوانیێ تەمە[20]

هەروەسا هۆزانڤان بەرهەڤی و ئامادەیا خۆ دیار دكەت، كو دڕێكا وەلاتیدا گیانیێ خۆ بسۆژیت، لێ بیێ ئامادە نینە ل هەمبەری هیچ تشتەكیێ مەزن یان بچیك دەست ژ بوهوستەكا ئاخا وەلاتی بەردەت، هەروەسا ئەویێ چەندیێ خویا دكەت، كو د راستا وەلاتیدا هەردەم بیێ هشیارە و ب هێزە و ب شیانێت خۆ دیێ وەلاتی پاریزیت.

دەمێ دبێژیت:

جان بسۆژم، دیێ ب پێت و ئاگریێ جەنگا وەلات

ئاگریێ زەردەشتە بی، ئەز ب خوە پەروانیێ تەمە

بۆستەكیێ ئەز ژ تە نادەم، ب وەلاتیێ هند و چین

تو بهشتا مللەتە، ئەز سوور و گەردانیێ تەمە

دیێ بریم، ئەز ب شوورو خەنجەران دەستیێ چەپەل

هیمێ بنتار و ئەساسیێ، برج و ئەیوانیێ تەمە

دیێ ب هێز و هنەرا خوە، ئەز دیێ تە پاریزكم وەلات

ئالا رەنگین زۆرڤە هلدەم، ئەز ل سەر بانیێ تەمە[21]

دیسان د هۆزانا (ڤەگەرن وەلات) دا، تیریژ بانگەوازیەكیێ ئاراستەی خورتێت خوەندەڤان دكەت، داخازیێ ژیێ دكەت كو پشتیێ نەدەنە وەلاتیێ خۆ، نەهێلنە ژێر دەستیێ دوژمنا، هەروەسا گازی ڕێبەرێت وەلاتی دكەت، ئەوێن خودان بیروباوەر و هەلویستیێ جامێرانە كو ئەوژی وەلاتی بجە نەهێلن و دویر نەكەڤن، چونكە گەلەك مەترسی ددویف وەلات ڤالاكرنێدا دهێن، بەلكی داخازیێ دكەت كو هەمی پێكڤە ڕێبازا

خۆ بکەنە یەك، دابشێن بەرامبەر دوژمنێ پیس و چەپەل راوەستن و ب رێکا بەرگریکرنێ ژ وەلاتی دەربێخن.

ڤە گەرن وەلات ڤەگەرن وەلات

خۆرتێن خوەندەڤان پەیێن دیموکرات

هەموو ببن یەك کۆمەل و جڤات

ڤەگەرن وەلات ڤەگەرن وەلات

وەلات وەهێشتن ب دەستێ نەیارا

تێنەوان ب قامچی، ب قوتە دارا

کانێ مێرێن قەنج و حەیف و مەخابن

وەلات وە بەردا، ب دەستێ دژمن

مانە پەریشان کەچ و کال و ژن

ڤەگەرن وەلات ڤەگەرن وەلات

رێبەرێن وەلات بیروەر و خوەندە

ڤالا نەهێلن بازار و گوندە[٢٢]

د هۆزانا ب ناڤێ (گوە بدێرە) دا، راستەوخۆ هۆزانڤان بانگەوازیا سەرهەلدانێ ئاراستەی مللەتێ کورد دکەت و هیڤیا سەربەخۆییێ و دویر ئێخستن ژ ژینا بندەستێ داگیرکەران ژێ دخازیت، چونکە ژیانا ژێردەستی و تەپەسەریێ نەیا هەژی وانە، دوژمن د ژیانەکا پڕ خوشی و پێشکەفتیدا دژین، بەرامبەری وان ژیانا مرۆڤێ کورد دەردەسەری و پاشڤەمایی و پاشکەفتییە، ژ بەر هندێ هیڤی خازە، کو مللەتێ کورد خۆ ژ وێ دەردەسەریێ رزگار بکەت و ئاورەکێ ل خۆ بدەت و ل خۆ بزڤریت، لەو ما دبێژیت:

مللەتێ کورد رابە سەرخوە بەس ژ بن خەشمێ دەرە

ژینا بن دەستی بزانە، نەهێژایە دویەرە

برجێ دژمن هەروەکی، ئەیوانا کسرا تەڤ تــــەگار

ڤان و ئاڤابێن تە هێژا، رەنگێ ئاخوورێ کەرە[٢٢]

گەلەك جارا تێبینی دکەین، کو هۆزانڤان گـازندە و تـەحنا ئاراستـەی مللـەتێ خۆ دکەت، ئەڤە ژی شێوەکێ سروشتییە، مەبەستا وی ئـەوە کـو هەستا وان بشـاربینیت و درکێ ب کێماسیێت خۆ بکـەن. بـەلێ دگـەل هندێدا، رێکا قورتـال بـوون و سـەرکەفتنێ پێش چاڤێ وان دکەت، ب مەخسەدا هندێ کـو بوخـۆ بکەنـە بەرنامـە و ل سـەر بچن، ژ پێخەمەت ئازادی و ژینەکا سەرفراز، هەر ژ بـەر هندێیـە، شـوورێ رۆستەمی وەك رەمز و هێمایـەك بۆچـەك هـەلگرتنێ دیاردکـەت و بـەرەڤانیکرن ژ هـەبوونا خـۆ ب وی ئامـێرێ کاریگەر کو ئاکە رێکەکە سەربەخویا مللەتێ پێ بدەست ڤە دهێت دەمێ دبێژیت:

ڤایە دوژمن، بوو خوە دانێ، لـەشکەر و تۆپ و تفنگ

بێ تو خـوە دیێ حالەت و نیر و ئـــەبوور و نشتەرە

گـەر دخوازی تو خوە ئازادکە، ژ بن دەستێ ئەیـــار

بـــگرە شوورێ روستەمی، داکەڤ تو مـــەیدانا شـەرە

تـــو بڤی رەنگی بخوازی، سەرخوە بوونێ ئەی مللەت

دەست هەلانین فەرەجا خێرێیە، بەسا مـــە ژ تـــەرە[٢٣]

د هۆزانا (ئەی کچا کورد) دا، تیرێژ هۆشداریەکێ ددەتە کچا کورد کو ئەوژی رابیتە سەرخۆ و ملێ خۆ بدەتە ملێ گەنجێ کورد و خۆ باڤێتە مەیدانا خەباتێ. وەك خوشـك و برا پێکڤە هەلمەتێ بەرن، ژ بو رزگارکرنا وەلاتی کار بکەن، دیـار دکـەت کـو چ جوداهی نینە د ناڤبەرا ژن و مێرا و کچ و کورادا د ڤادا خـەباتێدا. د ڤێرەدا تێبینی دکـەین کـو هۆزانڤان رۆلێ کچا کـورد پێش چاڤ دکـەت و گرنگییـەکا زۆر ددەتـێ، ئـەوژی کـو بچاڤەکێ پڕ باوەر تەماشا دکەت. چونکە دناڤ جڤاکێ مەدا بچاڤەکێ نزم و نڤی دنێرنە ئافرەتا کورد کو شیانێت وێ دسنووردارن و نەشێت وەکی کـەنجا رابیتـە سـەرخۆ و بەرەڤانیێ ژ وەلاتــێ خـۆ بکـەت. بـەلێ تیرێژ ڤـێ دیـاردا خراپ بـەروڤاژی دکـەت و وێ دئینیتە رێزا خورتێ کورد دەمێ بارەکێ ژیانێدا دەمێ دبێژیت:

ئەی کچا کورد را بەسەر خوە
تـــــۆ چما بیٚ رووەمەتــــی

تـــــۆ ل دنیـــــایێ بنـــێرە
کـــــەس نـــــەمایە داکەتی

ملێ خوە بدە ملێ خۆرتـــان
هـــەر وەکی خـــوشك و بـــرا

ئـەڤ بکەن کـــار و خەباتـــێ
هـــــوون ژی بـــۆ وی مللەتی

شێر بخوە شێرە کـەچا کـوردا
گـــــــەرچ ژن و گـــەرچ مێر [٢٥]

هەروەسا داخـازێ ژێ دکـەت کـو وان قـەید و زنجـیرا ئـەڤێت پـێ هاتیــە گرێـدان ڤەکەت و وان تیتال و رەوشتێت جڤاکی ئەڤێت هاتینـە سـەپاندن و دانـان، ل سـەر خـۆ راکـەت، ئـەو ژی رێکـا خـۆ بگریتـە بـەر، چونکـە خۆرتێـن کـورد ل کوردسـتانا عـیراق و ئیرانێ خوینا خۆ درێژن ژ بۆ رزگارکرنا وەلاتی، ژ بـەر هنـدێ ئـەوژی دکـاریت ب گەلـەك شۆل و بزاڤ و چەلەنگیا رابیت، دەمێ وەلات تووشی هێرشێت داگیرکەرا دبیت:

بشکێن ڤـــــان قـــــەیـد و زنجیرا
بـــب هەڤـــــــالـەك سەرکەتـــی

وا ل ئــــــــیران و عـــیراقــــــێ
جەنـــگ و حـــــــالان و شـــەرە

خـــــــويـن دريّژه وا ژ جــــــانىّ
خۆرتيّن كــورد بيّن ب هەڤ كـەتى

هــــــــــەر وەكــى تــــيريّژ دبيّژه
ســەرفــرازى يـــا مــــــە يــــە

ئــــــــەم خــوه دى مــافـن بزانن
يــىّ كــــــو ئايـل تــم كــــــەتى[٢٦]

د هۆزانا (ئەى خۆرت) دا، ئەوىّ دسەلمينيت كـو هـەر خۆرتيّت ژيـر و خواندەڤانـە ئومێد و هيڤييّت مللـەتى گـەش دكـەن. لـەوما داخـازىّ ژىّ دكـەت كـو خـۆ ب زانسـت و زانيارىّ چەكدار بكەن، ژ بۆ هندىّ دا بشێن بەرامبەر دوژمنــا راوەسـتن. چونكـە زانسـت وەرگرتن ژ لايىّ هــەمى هۆزانڤانێت بـەرگرى ڤـە، جۆرەكـە ژ خـەبات و بـەرگريىّ. لـەوما دبێژيتە خۆرتيّت كوردا، نڤستن و د خەودا مان دبــەرژەوەندى و قازانجا مللـەتيدا نينـە، خۆمتكرن و بىّ دەنگى بەرامبەر داگيركەرا ڤەقەتيانـە ژ كـاروانىّ ژيـان و پيّشـكەفتنىّ، ژ بەر هنـدىّ هشـيارى و هشـيار بوونەڤـە بەرامبـەر وان رويدانيّـت دلتـەزين ئـەڤيّت دهێنـە سەرىّ مللەتى، ئەرك و كارىّ گەنج و خۆرتيّت خويّندەڤـان و رەوشـەنبيرە، چونكـە ئـەو پتر ژ هەر كەسـەكى دىّ شـێن پيلانيّـت دوژمنـا هەلوەشـينن و ژ نـاڤ ببـەن. هيڤيـا ژىّ دكەت كو رابنە سەرخۆ، خۆراپيّچن، تڤەنگىّ هەلگرن، ل خۆ بزڤرن، دنيا هــەمى كەفتيـە د قادا خەباتێدا، هەر مللەتەك داخازا سەربەستيا خۆ دكەت، كەس نەمايە بــىّ دەولـەت، بىّ كيان و قەوارىّ نەتــەوى، بــىّ ئـالا و بـەيداخ، بـىّ دەسـتهەلات، تـۆ ژى خـۆ بگەهينـە ئاستىّ وان، ئەگەر دىّ پاشڤەمينى:

خۆرتىّ ژير و خوەندەڤان، چارە و ئومێدا مللەت
رابـە ژ خـەو تـو جارەك، سەرىّ رۆژا مـە دەركەت

خۆ راپێچە برادەر ژ بۆ کار و خەباتێ

کەس نەمایە د خەودە، جیهان پێکڤە ل هەڤ کەت

ل چار کنار و هاوێر، شەڕ و حالان و جەنگە

کاروانێ ریبا ژ بێ، بنێرەڤە ب رێ کەت

ل شوونا وارا نەمینی، دەم پڕ خۆەشە برادەر

د ڤێ وەختێ نەمانە، تو کەس بێ ئال و شەوکەت[٢٧]

د دوماهیکا هۆزانێدا، ئێکسەر تەحن و گازندە و لوما ئاراستەی خۆرتا دکەت و وێ چەندێ خویا دکەت، کو چاڤ ل رێبەرێت ملەتان بکەن، ئەڤێت پێکولەکا مەزن کری، هەتاکو خۆ ژ بن دەستێ قورتال کری و ناڤ و دەنگێ وان ل جیهانێ بەلاڤ بووی. چونکە یا دیارە دمێژوویا مرۆڤایەتیێدا ئەگەر ب شەڕ و خەبات و تێکۆشان نەبیت چ ماف ناهێنە دان، بۆیە داخازێ ژێ دکەت کو ئەو ژی وەکی وان ملەتا خۆ ب هێز بکەن، ڤێرس و عەگید و خۆرتێن، مێرخوازین، جەنگاوەر بن، ئەگەر هاتوو هەوە ئەڤ چەندە نەکرو ب دەستڤە نەئانی، مسۆگەر هوین دێ مینن تەپەسەر و پەریشان، بەندەوار و بەلنگاز، ژێر دەست و بێ سەر و سەمیان، بێچارە و سکێ خۆمالی و. هتد چونکە نهۆ دەرفەت یا پەیدابووی و ڤێ هەلێ ژی ژ دەست نەدەن:

گەر را نەبی تو سەر خوە، وەلات ب پێشڤە ناچی

ئەو رێبەرێن ملەتان، تەڤ وەک تەنە ب همەت

وەلاتێ خوە ب زۆرێ، ژ بن دەستان دەرئانین

کەتن رووپەلێ تاریخ، ب مێرانی ب شوهرەت

هەتاکو ئەم وسا بن، دێ تم حالێ مە ئەڤە بە

پەریشان و بەلەنگاز، ژار و بێ سەر و سیککەت

تو گوە دێری ل ئێرێژ، پەسن ددەتە ژ بۆتە

دەست هلینی ب مەردی، خوەش بژی ئەڤ دەم و وەخت[٢٨]

د هۆزانا (دایێ من بەردە) دا، دیار دبی کو کوڕ دەستوبریێ ژ دەیکا خۆ دخازیت

کو دەرفەتێ بدەتێ پشکداریێ د شەڕێ مان و نەمانێدا بکەت، هاریکاریا وی بکەت ژ بۆ بەرهەڤکرنا هەمی پێدڤییێت شەڕی ژ رەخت و فیشك، تڤەنگ و خەنجەرا، جل و بەرگا و هتد.. داخۆ کارکەت و راپێچیت وەك لەشکەرەکێ پەیت و گورج. پاشی بەرەف سەنگەر و چەپەرێت شەرەفمەندیێ بچیت. رازیبوون و رەزامەندییا دەیکێ ل سەر ڤێ چەندێ، نیشانا هندێ ددەت کو ئێدی ئەو پشت راست دبیت کو دلێ دەیکا خۆ کرِی، ئێدی چاڤەرێیا زڤرینا وی نابیت و دلێ وێ د دیفرا نابیت، ئەگەر هاتوو مەرگێ خۆ گۆری دەیکا مەزن (کوردستان) یێ کر، دیارە ئەو دەیك کو وەلاتە ژ هەمی تشتەکی هێژا و پیرۆزترە:

دایێ من بەردە ئەزێ هەرم شەڕ
باڤێ ملێ من تڤەنگ و شەش بەر

تێغ بەر پشتا من کولنگ و خەنجەر
دایێ من بەردە ئەزێ هەرم شەڕ

رەختێ تڤەنگێ باڤێم سەر ملا
ئەزێ سێنگا خوە بدەم بەر گولا

ل بەندا منن کۆزك و چەپەر
دایێ من بەردە ئەزێ هەرم شەڕ[٢٩]

د چەند دێرەکێت دیدا، وێ چەندێ خویا دکەت کو ب هیڤی و لاڤە لاڤ و دوعاکرنێ وەلات ژ ژێر دەستێ داگیرکەرا رزگار نابیت. ژ بەر هندێ ددەتە زانین کو تەنها ب رێکا شەڕی و خوین رشتن و قوربانی دانێ، دێ شێن جە و شوێنوارێت باب و بابکالا ژ ژێر دەستێ دوژمن و دوژمنکارا رزگار و سەرفرازکەن:

ئـــەمێ رزگار كن جێ كال و بابا
سەر خوە بوو نامە؛ نـابێ ب لاڤا

دژمـــن ژ وەلات دڤێ بكـن دەر
دابێ مـن بەردە ئەزێ هەرم شەڕ[٣٠]

هۆزانڤانێت بەرگری هەر زوی هەست ب وێ راستیێ كریە كو ئێكبـوون و ئێكـەتی و تەبایی د ناڤ رێزێت ملەتیدا، بۆ مـە كـارەكی گەلـەكێ پێدڤـی و فـەرە؛ چونكـە ئـەم خودانێ ملەت و ئاخین، مێژوو و بازێرڤـانین و .. هتـد ژ بـەر هنـدێ (تـیرێژ) ی ژی ئـەڤ بابەتە ب گەرمی بەحس كریە، د هۆزانا (ببن یەك) دا، هیڤیان دخازیت كو ملەتێ كـورد ئێكگرتی بیت: ئێك هەلویست و برایێت ئێك بن، هەڤركی و دژایەتییا ئێـك و دوو نەكـەن. هەمی پێكڤە دەستا بخەنە ناڤ دەسـتێ ئێـك و ب دل و گیـان خـەبات و بزاڤـێ بكـەن و بەرگری و بەرەڤانیێ ژ مافێت خۆ بكەن. چونكە ئەڤە كێشەیەك و گرفتارییەكە هەتا نهۆ ملەتێ كورد پێڤە دنالیت و دەستەبەر و مسۆگەر نەبوویـە، ئەڤـە ژی ژ ئاریشـێت هـەرە ترسناك و ئالۆزە كو دكەڤیتـە بەرسینگ و رێیـا بزاڤـا رزگـاریخوازا كـوردی. ژ بـەر ڤـێ چەندێ هۆزانڤان داكوكی و جەختێ ل سەر ڤی بابەتی دكەت. دهێتە زانین كو ئێكەتی و تەبایی دهێتە هژمارتن ئێك ژ دیارترین بنـەمایێت پێك ئینانا نەتـەوەیی، نەتـەوەیی ژی هەستەكا دەروونییە د ناڤ جڤاكێدا ب درێژییا مێژوویێ پەیدا دبیت.

((نەتـەوەیی د راستیدا هەستەكە بـەرەڤ ئێكگرتنا ملـەتی دچیت د یەكە یـەكا رامیاریا سەرانسەردا))[٣١]. ب ڤــی شێوەی نەتـەوەیی ل دەڤ هۆزانڤانی كێشا ژیـان و بوونا مرۆڤییە. ئەڤە ژ لایەكی ڤە، ژ لایەكێ دیڤە مفا وەرگرتنە ژ دەمێ (دەم)، كو وەكو فاكتەرەكێ گرنگ رۆلێ خۆ د خەباتا بەرگریكرنێدا دبینیت و نابێت بێهودە بهێتـە ژ نـاڤ برن و بوراندن، بەلكو دڤێت پترین مفـا ژێ بهێتـە وەرگرتـن. هۆزانڤانێ هـەر دوو لایـەنا؛ واتە: (ئێكەتی) و (دەم) وەكو دوو جەمسەرێت پێكڤـە گرێـدای و كـار تێكرنـێ ل ئێك و دوو دكەن بكار دئینیت، لەوما ڤێ چەندێ د دانیتـە بـەرچاڤێت ملـەتیدا تـاكو پێگیریێ

پێ بکەن و هەرچی زویترە پەیرەو بکەن، دەمێ دبێژیت:

دەستان بدەن هەڤ دوو بەسە ئێدی بین یەك

گۆگ هاتیە بەر کاشۆ دڤێ کو ئەم بین شەك

ب چۆگانێ بەرخودان لێخن مەدنێ تو یەڤشێ

دەم کو هەرە نابێ زوو دەرەنگە چەرخافەلەك

تەڤ ب بیر و باوەری ژ دل وەرن خەباتێ

دژمن بەلاوە ئیرۆ ژ هەڤ نەخە یەکا یەك

دەما مللەت بی یەك بە وەکی لەهیا گرانە

توتشت ل بەر خوە ناگرە تەڤ پێل و گرگرینانەك

ب کەروانێ دەمێ رە بین هەڤال و هۆگر

ل بەر وە کەس خوە ناگرە نەئاغا نەژی بەگ

ل مەیدانێ ب قوورن وەکی شێر و پلنگا

نەڤێت گوهـ دەرز و روستەم ساسان و ئالێ بەرمەك[٣٣]

ناڤ و کەسایەتیا پێشمەرگەی د ناڤەرۆکا هۆزانا نوی یا کوردیدا، تەوەرەکێ هەرێ گرنگ و بەر فرەهـ گرتییە بەر. (تیرێژ)ێ هۆزانڤان ب چاڤەکێ پڕ ئومێد و گەشبین دنێریتە پێشمەرگەی و ژ گەلەك لایەناڤە پەسنا وان دکەت؛ چونکە هۆزانڤان ب باوەرییەکا بێ بەند و سنوور، رزگارییا کوردستانێ د شەڕێ چەکدارییێدا دبینیت. وێ چەندێ ژی د چاڤێت پێشمەرگادا دبینیت، لەوما گازی وان دکەت کو هەر ئەون سەنگەر و چەپەرا بەر نادەن و نارەڤن، وەکی تەحت و چیا بووینە کەلەم و ستری ل بن پێت دوژمنا، خۆ جهـ دمینن و ناهێنە هژاندن و لڤاندن. سویندنا وان ب وی شیرێ وەکی خوینێ، ئەوێ د زاروکێدا دەیکێ دایێ، ئێدی ئەو چ جارا پاشڤە نەمینن و رێکا کاروانێ راستەقینە بگرنە بەر، هەر چەندە دونیا هەمی ژی ل وان ببیتە نەیار:

| | |
|---|---|
| ئەز نارەڤم نارەڤم | پێشمەرگم ئەز نارەڤم |
| وەك هیم و تەحتێ چیێ | تو جار ژ جهـ نالڤم |

ب زاروتـــــی دیـا مــن          شیر دایــه من ب خوینیَ

دونیا ل من ب یــەك بی          ژ یــا خوە دا نــاکــەڤم[٢٣]

هەروەسا د هۆزانا (پێشمەرگێ مـە) دا، ویّ چــەندیّ دیـار دکـەت کـو د شـەڕیّ بەرگریکرنێدا هەمی گەل ب هەمی ئەخ و چینێت جڤاکی ڤە پشکدار دبن، لێ ئەو کەسێ ژ هەمیان پتر د ویّ رێکیدا رۆلی خۆ دگێریت، پشمەرگەیە، لەورا هۆزانڤان ب درێژیا ڤیّ هۆزانێ پەسـنێت سـەروەری و شـکۆمەندییاوی دکـەت و داخـازێ ژێ دکـەت کـو رەختـا پاڤێتە سەر ملێت خۆ و چەکێ شەرەڤیّ راکەت و تـولاّ کوردا ژ دوژمنـا ڤەکـەت، چونکـە ئەو بۆ ویّ مەبەست و نیازێ هاتیە بەرهەڤ و پەروەردەکرن، هەروەکو دبێژیت:

رابـــە تڤەنـــگێ هلی، پێشمەرگێ مـــە

رەختا پاڤێ سەر وی ملی، پێشمەرگێ مە

تو ب شەڕ و جەنگ و گلی، پێشمەرگێ مە

تولا مـە کوردا هلـی، پێشمەرگـــێ مـــە

بێ شـــــەڕ و جەنـــگ و خـــــەبـات

نابی ئازادی ئەڤ وەلات، پێشمەرگێ مـــە[٢٤]

دیسان هۆزانڤان دویّ باوەریدایە کو (پێشـمەرگە) کـو هـەمی شیان و سەخلەتێت باش و چاك ل دەڤ وی کـــۆم دبـن، ب مرۆڤـــەکێ پـــەیت و جـك و چـاڤ نـــەترس و ماندوونـەزان هاتیـــە نیاسـین، ب مێرخاسـی و عـەگیدی و ڤێرسـی و سـوار چـاکی ل هەڤبەری دوژمنا رادوەستیت، د دیروکا بەرگریا مللەتێ کوردا خودان گەلەك هەلویستێت مەرد و ئازا و داستانێت قارەمانانەیە، هەر ئەوە ژی جهێ ئومێد و هیڤیا گەلێ کورد. هەر ئەڤ ئومێدە ژی باشترین پالدەر بوو ژ بۆ مانـا گیـانێ بـەرخۆدانێ ل دەڤ گـەلێ کـورد، دەما دبێژیت:

مێرخـاسی کارێ ئەیە پێشمەرگە مە

دژمن نەیارێ ئەیە پێشمەرگە مـە

ئەڤ دەم و دەوراتەیە پێشمەرگە مە

وەلات ل هێڤا تەیە پێشمەرگە مە

چاڤێ مەل بەندا تەیە پێشمەرگە مە

چار و ئومێدا تەیە پێشمەرگە مە[٣٥]

د ناڤ وان بابەتادا کو ناڤەرۆکا هۆزانا بەرگری پێك دئینن، بابەتێ شەهیدییە کو بابەتەکێ زل و بەرچاڤ و دیارە. هاتنا ڤی بابەتی ب ڤی شێوەی دزڤریتەڤە بۆ مێژوویا خوینەلویا ژیانا مللەتێ کورد، کو ب درێژیا مێژوویێ ب ئەگەرا درندە و هۆڤێتی و زولم و زۆرداریا دوژمنا بوویە ئەگەرا هندێ کو قوربانییێت وی دهەمی سەردەمەکیدا هەر د بەردەوام بن. ئاماژێ ب گیانێ پاقژێ سەرکردە و رێبەرێت شۆرەش و سەرهلدانا دکەت، کو ل پێخەمت نیشتمان و گەلێ خۆ گیانێ خۆ کرییە قوربانی وێ رابردوویا پڕ قارەمانی و بێ بەڤل و بێ وێنە دئینیتە بیرا خەلکی ژ بۆ هندێ کو وان ژی هان بدەت وێ رێکێ بەر نەدەن و ل سەر بچن. چونکە شەهید بوون ل دویڤ دیتنا هۆزانڤانی بلند ترین قوناغە ژ قوناغێت خەباتا شۆرەشگێری و ئەو بها مەزنەیە کو مرۆڤێ خەباتگەر ب دل و ڤیان و خوشتڤی و هشیاری ڤە سەرەدەریێ دگەلدا دکەت و لەورا دبینین دهۆزانا(شینا هەڤالەکی) دا، هۆزانڤان تێدا هزرا بەرگری و بەرخۆدانێ ددەتە هەڤالێ خۆیێ شەهید کو تولا خوینا وی ل نەیارا ڤەکەت، کو ئەڤە ب خۆ درێژە پێدانا رێبازا بەرگری کرنێیە. هەروەکی دبێژیت:

ژ تابووتێ ب دەرکەڤ، ئەی برادەر

خوە راپێچە درەختان دە ژ بو شەڕ

ب دەست بگرە تڤنگا دەستە باشی

بکوژ میرلازما، ڤۆ لۆردی باشی

تو حەیفا شێخ سەعید جارەك هلینی

کو ناڤێ تە ب ڤەنجی، هەر بمینی

وەلات ڤێکا ژ دەست دژمن دنـــالی

هــــەڤالێ من خوە مەد ئێر و تو ئالی[٣٦]

ئینجا دێتە سەر هندێ کو سویندێ بخوت ب ناڤێ یەزدانێ پاك و ب وێ خوینا سور و پاقژا، کو تولا وان ژ دوژمنێ ستەمکار ڤەکەت، ئەوژی ب کار ئینانا ئامرازێ بەرگری کرنێ کو هەمی جۆرێت تڤەنگا هەلیگریت و وەلاتی پاقژ و ڤالاکەت ژ وان دوژمنێت پیسێت مرار:

دخوم سوندێ ب ناڤێ پاکی یەزدان

دوێ خوینا تەیا پاقژ و دل و جان

کو ئەم حەیفا تە ناهێلین تو جــارا

ل دنیایێ د زکێ پیس و نـەیـــارا

ئەگەر نە ب دەڤێ بەرنۆ و کـەمالی

وەلاتێ مە ژ وان ڤەت نا بە خــالی

حەسابێ مە دگەل وانا، چ کــوورە

داخوازا مــە وەلات، رێیامە دوورە[٣٧]

هۆزانا بەرگری ل سەر ئاستێ جیهانێ دوو رێرەوا دگریتە بەر، ئێك: هـاندان و ئاژراندنا هەستا خەلکیـیە کو پـتر و خورتـتر گیانێ بەرگری و بەرخۆدانێ ل جەم وان قایم و موکوم بکەت. یا دووێ: دەستنیشـان کرنا وان کـاودان و کارەساتێت دلتەزینە ئەڤێت دکەڤنە د رێکـا وانـدا. ئـیرێژێ هۆزانڤان سـەرەرای هنـدێ کـو ب ئـێر و ئەسـەلی لایەنێ ئێکێ پێش چاڤ دکەت، بەلێ ژ لایەنێ دووێ خافل نەبوویە و پشت گوهڤە نەهاڤێتییە، چونکە د راستیدا هەردوو رێرەو وەك دوو جەمسەرێت پێکڤە گرێ داینە کو نابیت چ ژ وان بهێنە فرامۆش کرن. بەلکی ریسواکرنا کریارێت نامرۆڤانـە یێت شـەرخواز و دوژمنکارا، ئێکە ژ ئارمانجێت سەرەکی ل دەڤ هۆزانڤانێ بەرگری.

ژ بەر هندێ دبینـین ئـیرێژ یـێ دوودلی د هۆزانـا ب نـاڤێ (غـازا خـەردەلا) دا دەستنیشـانا وان موعانـات و نەخۆشـی و ئێش و ئازارا دکەت، ئـەڤێت دوژمنکـار پـێ

رادبن ژ پێخەمەت قرکرن و ژ ناڤبرنا ملله‌تێ کورد.

نەخاسمە دەمێ رژێما بەغدا ل سالا ١٩٨٨ رابووی ب بوردومانکرنا باژێرێ حەلەبچە و هندەك دەڤەرێت دی یێت کوردستانا عیراقی ب کیمیابارانکرنێ تێدا ئەوێ دسەلمینیت کو ئێدی ملله‌تێ کورد ژ کیمیابارانکرن و هاڤێتنا غازا خەردەلێ و تانك و تۆپ و هەمی جۆرێت چەکێ قەدەغەکری ناترسیت و خۆنا دەتە پاش و هەر چ بهێتە درێکا واندا، ئەو دەستا ژ دۆزا رەوایا ملله‌تێ خۆ بەر نادەن و هەر دێ د بەردەوام بن سەر بەرگری و بەرخۆدانێ، هەتاکو مافێت خۆییێت سروشتی و رەوا وەکی هەمی ملله‌تێت جیهانێ بدەستڤە دئینیت:

کورد ژ مەیدانێ تو جاری پشتێ نەدی نارەڤە

نە دترسە ئەو ژ کێما وو غازا خەردەلا

دژمن قەت وی ناشکینی، ئەو ب قووت قووتێ تو جارا

نە ب تانگ و تۆپ و بالافرِ و تۆزا قومبەلا

بوویە عادەت ژێرە هەردەم کوشتن و تالان و جەنگ

دەشت و زۆزان تێنە خەملاندن ب خوینا شێرگەلا

کوردستان قەت نابە بێ وە، ئەی ستەمکارێن ئیراق

مەخەلێ شێر و پلنگا، نابە وارێ چەقەلا

جەنگ و شەرِ هەردەم ل دونیایێ هەنە وێ تم هەبن

لێ کەسی وەك وە نەکر، د تو رژێم و کۆمەلا [٣٨]

سەیدایێ تیرێژ بوردومانکرنا حەلەبچە یا برینداز هەڤبەری کارەساتا هیرۆشیما دکەت و ب دەنگێ بلند گازی زارۆك و کەچ و کورێت کوردستانێ دکەت و دبێژیتێ، هەر چەندە قوربانی د زۆر بوون، بەلێ خەم ناکەت تەنگاڤی ژی د دویف کورتن و هەر دێ رۆژا مە هەلێت:

ئەی حەلەبچە بریندار

هۆرۆشیما کوردستان

ژ بو کەچ و کورێن خوە

تو ئێرۆ بووی گۆرستان [٣٩]

ب ڤێ چەندێ مە هندەك لایەن ژ ناڤەرۆکێت هۆزانا بەرگری ل جەم (تیرێژ) ی شرۆڤە و شلۆڤەکرن و ئەو هزر و بیرێت بەرگری ئەڤێت تێدا هاتین، مە بەرچاڤ و پێشکێش کرن. ئەڤە ژی مشتەکە ژ خەروارەکی، چونکە هەروەکو مە ل دەستپێکێ گۆتی کو پرانیا هۆزانێت وی ژ بو بابەتێ بەرگریێ هاتینە ڤەهەندان. ژ بەر هندێ گەلەکا دی پێدڤێت کو پەردە ژ سەر هەمی لایەنێت دی بهێتە لادان و راکرن؛ چونکە ب راستی د هەر سێ دیوانێت وی (خەلات - ژۆژان - جـوودی) دا ب دەهان هۆزانێت دی یێت بەرگرییێ تێدا هەنە.

## ئەنجام

پشتی ئەڤ ڤەکولینە ب دوماهی هاتی، ئەز گەهشتمە ڤان ئەنجامێت ل خارێ هاتینە دیارکرن.

١- ئەدەبێ بەرگری، ئەمازە (هۆزان) ێ رۆلەکێ سەرەکی د بزاڤ و خەباتا بەرگری و بەرخۆدانێدا دیتیە، د ناڤ ئەدەبیاتێت جیهانێدا هەر د کەڤندا و هەتا نهۆ.

٢- دەربارەی ئەدەبیاتێت کوردی، دیسان ئەڤ جۆرە هۆزانە هەر دگەل دەستپێکا پەیدابوونا ئەدەبێ نڤیسیدا سەرهلدایە و گەلەك هۆزانڤانێت کورد ئاماژە پێ کرییە.

٣- (تیرێژ) ی وەکی هۆزانڤانەکێ نوی، بەرهەمێت خۆ بڤێ جۆرە هۆزانێ نەخشدار کرینە و ئەو رێرەو گرتییە بەر، ب ئارمانجا خزمەتکرنا دۆزا گەلێ خۆ.

٤- وەسا بۆ مە دیار بوو، کو ناڤەرۆکا بابەتێ هۆزانێت بەرگری ل جەم (تیرێژ) ی ب شێوەیەکێ دواندەری (خطابي) هاتینە ئاراستەکرن ژ پێخەمەت:

أ - هشیارکرنا هزرا نەتەوەیی د ناڤ جڤاکێ کوردیدا.

ب - ئازراندن و شاراندنا هەستاوان.

ج - ئێکگرتن و تەبایی د ناڤ رێزێت ملەتیدا.

د - دیارکرن و دەستنیشانکرنا رۆلی هەر کەسەکی د قادا خەباتێدا.

هـ - نرخاندنا بهایێ دلێری و مێرخاسیێ و قارەمانی و خۆگۆری کرنێ.

و - خەباتکرن ژ بۆ ب دەستڤە ئینانا ماڤێ چارەنڤیس.

ز - دیارکرنا نەخوشی و موعاناتێت ملەتی ل دەمێ بەرەڤانی و بەرگری کرنێدا، چونکە ئەو هۆزان ب شێوێ مارش و سروودێت لەشکەری هاتینە ئەنجامدان.

**پەراوێزوژێدەر**

1-Dîwana Cûdî , Tîrêj , Çapa Yekemîn – Çapxana Emîral , Beyrût – Libnan – Avdar . 1998 – L7 .

٢- عبد الرحمن مزوري، الشّاعر (تيريّژ) أحد قمم الشّعر الكلاسيكيّ الكرديّ، گوڤارا سەرهلدان، ژ(١)، ١٩٩٢، ل١ .

٣- ژێدەرێ بەرێ، ل٢٧ .

٤- ئەڤ پێزانینە د نامەکێدا کو (تیرێژ) ی هنارت بوو کەفتە بەردەستێ مە .

٥- ژێدەرێ بەرێ، هەژی گوتنێیە کو سەر هندێ را کو سەیدایێ (تیرێژ) ئەندام بوو دناڤ کۆمەلا (خویبوون)، دهێتە هژمارتن ئێك ژ ئەندام و دامەزرانەرێت (یانا کوردستان یا وەرزشی) لەبازێرێ شاموو دێ.

٦- عبد الرحمن مزوری، الشاعر (تیرێژ)، گوڤارا سەرهلدان، ل٢٦ .

٧- ئەڤ پێزانینە د نامەکا تایبەتدا هاتبوون، کەفتە بەردەستێ مە .

٨- ژێدەرێ بەرێ .

9- Dîwana ZOZAN – 2 – Helbest – TîRÊj – Sala – 1990 LE .

د ڤێرەدا جهێ سەرنجدانێیە کو تیرێژ پشتی ژ زیندانێ هاتییە بەردان و ئازادکرن، خۆ ژ بەر چاڤان بەرزە دکەت و خۆ دپارێزیت، ئەو ژی قەستا ناڤ هۆزا عەرەبێت (جبوور) دکەت و ئاگنجی دبیت هەتا سالا (١٩٧٣) دا ل دەڤ وان دمینیت، پاشی بەرەڤ بازێرێ (حەسکە) دچیت ل وێرێ ئاکنجی دبیت .

١٠- د نامەکا تایبەتدا گەهشتە دەستێ مە .

١١- ژێدەرێ بەرێ .

١٢- اسماعیل بادی، چارەکادی هۆزانڤانێ مللەت پەروەر تیرێژ، گوڤارا (مەتین) ژ (٢٠)، ١٩٢٣، ل٤١ .

١٣- احمد قرنی، خەمێن بلبلێ دلشاد، گوڤارا مەتین، ژمارە (١٥) ١٩٩٢، ل، ٤٦ و ٤٧ .

١٤- اسماعیل بادی، گوڤارا مەتین، ژ (٢٠)، ل٤٣ .

١٥- ئەڤ پێزانینە د نامەکا تایبەتدا گەهشتنە دەستێ مە .

16- XELAT, Dîwana Yekem, TîRÊJ, Swed, Stockholim, 1991, L8 .

١٧- ژێدەرێ بەرێ، ل٩٥ .

١٨- ژێدەرێ بەرێ .

١٩- ژێدەرێ بەرێ .

٢٠- ژێدەرێ بەرێ، ل٦٥ .

٢١- ژێدەرێ بەرێ .

22- ZOZAN, Dîwana Duwem, TiRÊJ, Sala – 1990, L72 .
23- XELAT, TiRÊJ, L81.

٢٤- ژێدەرێ بەرێ .

٢٥- ژێدەرێ بەرێ، ل٦٦ .

٢٦- ژێدەرێ بەرێ .

٢٧- ژێدەرێ بەرێ، ل٨٤ .

٢٨- ژێدەرێ بەرێ .

29- ZOZAN, Dîwana Duwem, L70 .

٣٠- ژێدەرێ بەرێ .

٣١- احمد ماجد السامرائي، التيار القومي في الشعر العراقي الحديث، منذ الحرب العالمية الثانية ١٩٣٩، حتى نكسة حزيران، ص ٣٦٩ .

32- Cûdî, dîwana siyemîn – Tîrêj, Çapxana Emîral – Beyrût – Libnan – Avdar – 1998 . L65 .
33- Zozan – Tîrêj – LB .
34- XELAT – Tîrêj – L61 .

٣٥- ژێدەرێ بەرێ، ل٦٢ .

٣٦- ژێدەرێ بەرێ، ل١٢٧ .

٣٧- ژێدەرێ بەرێ، ل١٧٨ .

38- Dîwana – Zozan – L116 .

٣٩- ژێدەرێ بەرێ، ل٢ .

**پوختە:**

ئەڤ ڤەکولینە یا هاتیەکرن، دەربارەی (تیرێژ) ێ هۆزانڤان، کو دهێتە نیاسین ئێك ژ ڕێبەرێت (رواد) هۆزانا بەرگریێا نوی، ڤەکولین ڤان بابەتا ب خۆ ڤە دگریت، ژیانناما هۆزانڤانی، بەرهەمێت وی، ئالڤەروکا هزرا بەرگری د هۆزانێت ویدا.

د ڤێ ڤەکولینێدا، بو مە دیار دبیت کو بەرهەمێ هۆزانا وی پتر ل سەر هۆزانا بەرگرییە، ئەڤە ژی ژ بەر ئەگەرا نێزیك بوونا وی بوو ژ مللەتێ خۆ، چ دهاتە سەرێ مللەتی ئەو ژی پێ زامدار دبوو. لەوما هەر دوژمنکارییەك هاتبا کرن دژی مللەتێ وی، ئەو دا ب خامە و هزر و بیرێت خۆ بەرسینگی لێ گریت و بەرەڤانیێ ژێ کەت، ژ بەر ڤێ چەندێ بۆ مە دیار دبیت کو گیانێ بەرگریکرنێ د بەرهەمێت ویدا، ب شێوەیەکێ بەرفرەه هاتیە پێشکێش کرن.

ل دوماهیکا ڤێ ڤەکولینێدا ژی چەند ئەنجامەك هاتینە دیارکرن.

## ملخص البحث

د. عبدالله ياسين آميدي

### تيريژ الكوردي حياته وشعره

أعدّ هذا البحث عن أحد روّاد شعر المقاومة الحديث، وهو الشّاعر (تيريژ) الكرديّ. تناول البحث حياة الشّاعر وإنتاجه الشّعريّ ومضمون فكرة المقاومة في شعره.

يتّضح لنا في هذا البحث أنّ أكثر إنتاج هذا الشّاعر يتضمّن فكرة المقاومة، وسبب ذلك يعود إلى أنّ الشّاعر كان قريباً من شعبه، وكان يعاني ما تعانيه أمّته؛ لذلك فإنّ كلّ عدوان على شعبه كان يقاوم من قبل الشّاعر، فقد كان يدافع عن نضال شعبه ووطنه بقلمه وفكره؛ ومن هنا نتلمّس بوضوح أنّ روح المقاومة أشبعت بها أشعار الشّاعر، وعليه فإنّه قدّم إنتاجاً كبيراً في هذا المضمار.

ختم البحث بنتائج عدّة تمّ ذكرها في نهاية البحث.



## *Abstract*

### *The Kurdish poet Tiresh, his biography and poetry*

*Dr. Abdulla Yasin Amedi*

The study is about one of the pioneers of recent resistant poetry, The Kurdish poet "Tirêsh" It deals with his life and the significance of resistance in his poetry.

It seems that most of his poetry is about resistance for he was so close to his people that he experienced their suffering and the agression they were exposed to. The study conclude with excerpts from the poet's work.

# ژەهری کیمیایی و کاریگەرەکانی

پ. دکتۆر عەزیز ئەحمەد ئەمین

لەم باسە کورتەدا مەبەستمان لە ژەهر ئەو جۆرە ماددە (ئاوێتە) سروشتی و دەستکردە دەگرێتەوە کە لە کاتی بەکارهێنانیدا و لەسەر بنەما و دۆخێکی تایبەتی دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی کۆمەڵێك نەخۆشی و کارەساتی دڵتەزێن و قەلاچۆکردنی گیانلەبەر، نموونەش بۆ ئەمە گەلێك زۆرە. بە شێوەیەکی گشتی دتوانین ئەم باسە بخەینە چوارچێوەی کیمیای ژەهر chemistry of poisen ەوە. پێش هەموو شتێك دەبێت بزانین ئایا پێناسینێکی زانستانەی تایبەت بۆ کیمیای ژەهر هەیە؟ ئەگەر بۆ ئەو هەموو کتێبانەی کە لە بواری زانستی کیمیا و پزیشکی و یاسادا دەرچوون، دەردەکەوێت کە ناتوانین پێناسینێکی یەکگرتوو بۆ ژەهر دابنێین، بەلام بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین کە ژەهر بریتییە لەو ئاوێتە کیمیاییەی کە لە ژێر بارێکی تایبەتیدا دەبێتە هۆی تێکدانی گۆرجیی کیمیای خانە زیندووەکانی گیانلەبەر. هەر لەگەڵ ئەم پێناسینە کورتەدا پرسیارێکی دیکە دێتە کایەوە: ئایە ئەو بارە تایبەتییە چۆنە، کە دەبێتە هۆی قەلاچۆکردنی هەموو زیندەوەرێك لە رووەك و زیندەوەر؟ بۆ وەرامدانەوەی ئەم پرسیارە، چەند رێبازێکی تایبەتی هەیە، وەك رووی تەکنۆلۆجی زانستەکی و رووی ماق مرۆڤ. بۆ نموونە ئەو بۆمبا ئەتۆمەی کە لە شەری دووهەمی جیهاندا بەسەر شاری هیرۆشیما و ناگازاکیدا درا، لایەنێکی چەپەڵی دڵتەزێنی بەکارهێنانی وزەی ئەتۆم دەردەخات، بەلام لە هەمان کاتدا دەتوانرێت ئەو هەموو وزەیە بۆ خزمەتی ئاشتی بەکار بهێنرێت. ئەمرۆ وزەی ئەتۆم بە فراوانی لە بواری پیشەسازی و ئابووری و تەندروستیدا سوودی گەلێك زۆرە. هەروەها ئەو ئاوێتە کیمیاییانەی کە ئەمرۆ لە زۆر وڵاتدا بۆ قەلاچۆکردنی زیندەوەر بەکار دەهێنرێن، لە هەمان کاتدا لە بواری پیشەسازیشدا سوودیان گەلێك فراوانە. بۆ نموونە: کلۆر غازێکی

کوشندەیە، بەڵام لە هەمان کاتدا بۆ پاککردنەوەی ئاو بەکار دەهێنرێت. کەواتە زۆر لە ئاوێتە ژەهرینەکان لایەنی خراپە و چاکەیان هەیە.

ئینجا بۆ ئەوەی هەندێك بە فراوانی بچینە ناو ئەو هەموو ژەهرەوە، کە لە زۆر بواردا بەکار دەهێنرێت، دەبێت شوێن ئەو رێبازانە بکەوین کە بۆ لێکۆڵینەوەی زانیاری ژەهر هەیە، لەوانە چۆنیەتیی پۆلێنی ئاوێتەکانی ژەهرە: بە گشتی ژەهرە کیمیاییەکان بە گوێرەی پێکهاتن و کردارەیانەوە لەسەر چەند بنەمایەك جیا دەکرێنەوە.

**١- پۆلێنی فیزیایی:**

ئەم جیاکردنەوەی ژەهرە کیمیاییانە دەکەوێتە سەر بنەمای باری سروشتیی ئەو ئاوێتانە و پێوەندییان بە چەند فاکتەرێکی دەرەکیی وەك وشار و پلەی گەرمایی و چەند بارێکی سروشتیی ترەوە هەیە. ئەم ئاوێتانە بریتین لە:

أ- ئاوێتە غازییەکان: وەك کلۆر و فۆسجین.

ب - ئاوێتە شلەکان: وەك دوانە (جووت) ئەسیلی سولفید، کلۆرۆپیکرین، برۆتەسیتۆن، چوارەم ئەسیلی قورقوشم، تایۆن، سارین و سومان.

ج - ئاوێتە رەقەکان: وەك دوانە (جووت) فنیلی ئەرسین کلوراید، دوانە (جووت) فنیلی ئەرسین سیاناید.

**٢ - پۆلێنی کیمیایی:**

زانایان چوگایێف و زیتۆفیك، هەوڵیان داوە کە لەسەر بنەمای رەوشتی کیمیایی ئاوێتەکانی ژەهر لە یەکتری جیا بکەنەوە. ئەم دابەشبوونە پێوەندیی بە ژمارەی ئەتۆمی گەرد و رەوشتیەوە، یان پێوەندیی بە دابەشبوونێکی ئۆرگانییەوە هەیە، وەك پۆلی ئاوێتەی هایدرۆکاربۆن و کوحوول و ئەلدیهادوکیتۆن.

**٣- پۆلێنی نەخۆشی:**

جیاکردنەوەی ئاوێتەکانی ژەهر لەم لایەنەوە بنچینەیەکی گەلێك فراوانی هەیە کە بە زانیاریی نەخۆشییەوە بەستراوە pathalogy. لێرەدا پلەی ژەهرین و تێن و کرداری

ژەهر بۆ سەر ژیانی مرۆڤ و ڕووەك و زیندەوەر دەخرێتــە بــەر چــاو. بــە کورتــی دەتوانین جۆری ژەهـرە سروشتییەکان و دەستکردەکان بەم شێوانەی خوارەوە لـە یەکتری جیا بکەینەوە.

أ- ژەهری کیمیایی چووزانەوە و کزانــەوە و فرمێسك ڕشتنی چاو (چاو ئاو کردن) وەك: برۆمۆ ئەسیتۆن...

ب - ژەهری کیمیایی داوەشاندنی بۆریی هەناسە و سـییەکان، وەك: فۆسـجین و کلۆروپیکرین..

ج - ژەهری چووزانـەوە و سووربوونەوەی دەمولــووت و گــەروو: وەك خوێیــەکانی زەرنیخ.

د- ژەهری کیمیاییی داوەشانی پێست، وەك: خوێیە ئۆرگانییـەکانی زەرنیخ، بـۆ نموونە داروو.

هـ - ژەهری کاریگەر لەسەر خوێن و دەمار؛ وەك ترشی سیانیك .

هەر لەم بوارەدا زانـا - سوشیست فیلسکی - ژەهـرە کیمیاییـەکان دەکات بـە سێ گرووە: گرۆی یەکەم: تایبەتە بەو ئاوێتانەی کە دەبنە هۆی تەنگە نەفەسی Asphyxia ئەمەش دەگەڕێتــەوە بۆ کەمیی ئۆکسجین و سستبوونی کرداری ئەکسەدەی (ژەنگ هـەڵێنانی) خوێن anoxamia ، وەك غازی کلۆر، فۆسجین، بــەم جۆرانــە دەوترێـت ژەهری خنکاندن ، هۆی خنکاندنیش دەگەڕێتەوە بۆ کەمیی بڕی ئۆکسجینی هەناسـە و سستیی چــالاکیی خوێــن لــە گۆڕینــەوەی غازەکــانی نێوانــی وەك ئۆکســجین و دووانـە(جووتـە) ئۆکسیدی کاربۆن؛ هـەروەها دەگەڕێتـەوە بـۆ ئیفلیجیی دەمارەکـانی ئەندامی هەناسە و ئەتەمەکانی.

گرۆی دووەم: بریتییە لەو ژەهرانەی کە دەبنـە هەوکردنـەوە و کوشتنی ئەتەمـە زیندووەکانی لەش و ژەهری سوتێنەریان پـێ دەوترێ و دەبنـە هـۆی سووتانەوەیەکی کێمداری قووڵی ئەتەمـەکان و دایـان دەڕزێنێت و دایـان دەوەشێنێت، وەك ئاوێتـەکانی زەرنیخ و غازی لویست.

کۆمەڵەی سێیەم: ئەو ئاوێتانـە دەگرێتـەوە کـە نەخۆشییان لێ دەکەوێتـەوە ، وەک: نەخۆشـیی بینـین (چاو کزبوون) و چـاو و ئەندامـەکانی بۆریـی هەناسـە و سـییەکان و هەرس و (ئازیمە) و نەخۆشیی کۆکە و ڕشانەوە.

لێرەدا بە کورتـی دەتوانـین بڵێین کـە هـەموو ژەهـرە کیمیاییـەکان لـە کرداریانـدا هاوبەشـن، بـەڵام جیاوازییـان دەگەڕێتـەوە بـۆ بـڕی ژەهرەکـە و خەسـتی و مـاوەی مانەوەی . بە گشتی بۆ دۆزینـەوەی بڕی ئـەو ژەهـرە کوشـندەیە ستاندەرێك دانـراوە، کە مژی کوشندە lathel Dose ی پێـی دەوترێـت. ئـەم یەکەیـە توانـاییی بەرهەڵسـتیی لەش دژی ئەو ژەهرە نیشان دەدات، واتە بە چـەند مژێك مرۆڤێك یـان زیندەوەرێك لـە پێ دەکـەوێت؟. هـەندێ جار نیـوەی ئـەو مـژە دەگرێـت بـە یەکەیـەکی پێوانـدە، واتـە ( L.Dso).

پێش ئـەوەی بـە تـەواوی بکەوێتـە سـەر باسـی کارەساتەکانی ئـەو ژەهرانـەی بـۆ قەلاچۆی مرۆڤ بە کار دەهێنرێت، پێویستە کورتەیەکیش لـە ڕەوشـتی سروشـتیی ئـەم ئاوێتانە دەرخەین .

أ- **ڕەوشتی فیزیـاییی ژەهـر:** بۆ لێکۆلینەوەیـەکی گشـتی ڕەوشـتی فیزیـاییی ژەهـر پێویستە ئەم خاڵانـە ڕەچـاوبکرێت: وەك پلـەی توانـەوە وکوڵانـدن ، وشـاری هـەڵمی ، پلـەی هـەڵچوون volatility و پلـەی تیژڕۆیـی و پێدادەرچـوون و توانسـتی تواندنـەوە و بەهای خستیی ئایۆنی هایدرۆجین و گەلێکی تر.

ب - **ڕەوشتی کیمیایی:** بریتییە لە کۆمەڵێك ڕەوشت، وەك جێگـیریی ژەهـر بەرامبـەر ئاو و فـاکتۆری ئەکسـەدە دامـاڵین و گۆڕیـنی کـەش و ئەتموسـفێری گواسـتنەوە و هەلگرتن و جێگێریی بەرامبەر تەقینەوە و هتد..

ج - **ڕەوشـتی فسیۆلۆجی:** بـە گشـتی ڕەوشـتی فسـیۆلوجیی ژەهـر بـە تـەواوی پێوەندیی بە ڕەوشتی فیزیایی و کیمیاییی ئاوێتـەی ژەهرەکـەوە هەیـە، بـەڵام لـە ڕووی بەکارهێنانـەوە کاریگـەریی ژەهـر پێوەندیـی بـە چـالاکی و بـڕ و جـۆری ژەهرەکـەوە هەیە و چۆن دەبێتە هۆی کزانەوە و چووزانەوە و سووربوونەوەی ئەندامـەکانی بینـین و

داوەشاندنی خانەکانی بۆریی هەناسە و سییەکان و پێست و شوێنی دیکە.

لێرەدا پێویستە ئەم خاڵانە ئامۆژگاری بکرێت:

أ- ماوەی مانەوەی نەخۆشەکە لە ژێر کاری ژەهرەکەدا، ئەمەش بڕی مژینی ژەهرەکە دەردەخات.

ب - ماوەی بەرهەڵستی کاریگەری ژەهرەکە، واتە بەرهەڵستی نەخۆشەکە بۆ ماوەی یەك دەقیقە بێ ئەوەی نیشانە سەرەتاییەکانی ژەهرەکە دەرکەوێت. لێرەدا پێویستە ئەو فاکتۆرانە دەستنیشان بکرێت که یاریدەی مرۆڤ دەدەن لە کاریگەریی ژەهری جۆراوجۆردا. ئەم کۆسپە بریتییە لە بەرزترین بری خستی غازەکان و هەڵمەکان [ Maximum allowable concentration (MHC)] ، یان بریتی بە لە بەرزترین بری ژەهر و هەڵمەکەی لە شوێنی کارلێکردندا [( Maximum Workable Concentration (M.W.C ] ، بەلام بۆ ماوەی هەشت سەعات لە ڕۆژێکدا و بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك بێ ئەوەی نیشانەی نەخۆشییەکە دەکەوێت. ئەم کارە بە تایبەتی لە کارگەکاندا بە جێ دێت.

ج - بڕی کوشندەی ژەهر (Lethal Dose ): بڕی ئەو ژەهرە دەگەڕێتەوە کە لە ماوەیەکی دیاریکراودا دەبێتە هۆی کوشتنی گیان لەبەر.

**پێکهێنانی ژەهری کیمیایی و کارلێکردنی فسیۆلۆجی و نەخۆشی:** وەك دەزانین لێکۆڵینەوە زانیارییەکان دەریان خستووە کە پێوەندییەکی تەواو لە نێوان ئاوێتە ژەهرینەکان و نەخۆشییەکانیان لە ژیانی زیندەوەردا هەیە. بەگشتی ئاوێتە ژەهرینەکان لە یەکگرتنی چەند توخمێك پێك دێن، وەك توخمی کاربۆن و هایدرۆجین و ئۆکسجین و گۆگرد و کلۆر و فلۆر و برۆم و یۆد و نایترۆجین و فوسفۆر ... هتد. لێرەدا بە کورتی چەند کۆمەڵە ئاوێتەیەکی ژەهرین دەخەینە بەر چاو، هەروەها ئەو کارەساتە دڵتەزێنەی لێیان دەوەشێتەوە و لەگەڵ بەشێك لە چارەسەرکردنیان، بۆ نموونە:

١- ژەهری فرمێسکدان: بەکارهێنانی جۆری ئەم ژەهرە کە دەبێتە هۆی فرمێسکی

چاو زۆر کۆنە، بە تایبەتی بەکارهێنانی دووکەڵی دار و درەختی سووتاو، هەروەها لە شەڕەکانی ناپلیۆن و شەڕەکانی ناوچەی قرم و شەڕی یەکەمی جیهاندا، بەڵکو تا وەکوو ئەمڕۆش، بۆ نموونە:

أ. کۆمەڵەی هالۆجینە ئەلیفاتیکەکان، بە تایبەتی سیانیدی هالۆجینەکان و میرکەپتانەکان.

ب ـ کۆمەڵەی هالۆجینە ئەرۆماتیکەکان، لەگەڵ هەندێك لەم ئاوێتانەدا توخمی نایترۆجین بەشداری دەکات، وەك سیانیدی هالۆجینەکان.

بۆ نموونە: نیشانەکانی ژەهری فرمێسکدەر بەم جۆرە دەبێت: لە پێشدا چاو دەست دەکات بە سووربوونەوە و کزانەوە و فرمێسك ڕشتن و داوەشان و تێکدانی شانە ژەهرلێدراوەکان، ڕەنگە کاریگەرییان بگاتە ڕادەی کوێربوون، هەروەها بۆی هەیە کاریان بگاتە سەر ئەندامەکانی هەناسەش، بۆ نموونە: ئەگەر مرۆڤێك بۆ ماوەی بیست دەقیقە کەوتە ژێر کاری غازی ـ کلۆرۆئەسیتۆفینۆن ـ لەم ماوەیەدا جگە لە فرمێسك ڕشتن، کار دەکاتە ئەندامەکانی هەناسەدان و خوڵ خوێن و بۆی هەیە لە هەشت دەقیقەدا زیاتر نەمێنێتەوە. بەم جۆرە ئەگەر ئاوێتەی (دوانە (جووتە) کلۆر) و (دوانە (جووتە) مەسیلی ئەمین) بەکار هات، بەڵام ئەگەر ئاوێتەی (پیرکلۆرۆمەسیل میرکیتان) بەکارهێنرا، جگە لەم نیشانانە، بۆی هەیە نەخۆشەکە تووشی ڕشانەوە و بزرکاندن و لە هۆشچوون و هەناسە تەنگی و سکچوون بێت. لە لایەکی دیکەوە بۆی هەیە ئەم جۆرە ژەهرە کار بکاتە سەر چالاکیی ئەنزیمەکان، بە تایبەتی Pyeoacid 0xydase, Ureaset Papain Hexocinase.

سەرەتای پەیڕەوکردنی ئامۆژگارییەکانی فریاگوزاری دەگەڕێتەوە بۆ خەستیی ئاوێتەی ژەهرەکە. لە تووشبوونێکی سووکدا دەتوانرێت چاو بەگیراوەی بۆریون (٣٪) یان گیراوەی سۆدیوم (٣٪) یان بە ئاوی بەیبوون (Camellia– ٣٪) بشوردرێت و دەتوانێت هەندێ هەتوانی نەفت (تێژ) بەکاربهێنرێت. دەتوانرێ لێرەدا پێویستە ڕێگا نەدرێت بە نەخۆشەکە چاوی بخورێنێت و نابێت هەتوانی زبر

بەکاربهێنرێت وەدەتوانرێت چاویلکەی تاریك بەکاربهێنرێت، ئەگەر نەخۆشەکە هەستی بە کزبوون، یان کوێریی چاوی‌کرد، ئەوا دەبێت هەوڵ بدرێت کە ترسی لێ نەنیشێت و هێمن بکرێتەوە، چونکە ئەگەر ژەمی ژەهرەکە زۆر نەبوو؛ بۆی هەیە لە ماوەی چەند رۆژێکدا چاوی بکەوێتەوە ببێن، بەلام بە هەموو جۆرێك دەبێت نەخۆشەکە بخرێتە ژێر ئامۆژگاریی پزیشکی پسپۆرەوە؛ چونکە رەنگە نەخۆشەکە پێویستی بە فریاگوزاریی ئەندامەکانی دیکەی لەشی هەبێت.

٢ـ ژەهری کاریگەری سەرسییەکان.

لێرەدا بە کورتی باسی هەندێك لەو ئاوێتانە دەکەین کە بە تایبەتی کار دەکەنە سەر ئەندامی هەناسە، وەك دەم ولووت و گەروو و سییەکان؛ بۆ نموونە:

أ ـ غازی فۆسجین: ئەم غازە لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا بەکارهێنراوە. ئەم ئاوێتە یە لەسەر ئاستی پیشەسازی، بواری بەکارهێنانی فراوانە. بۆ نموونە پیشەسازی بۆیە و پلاستیك و هەندێ دەرمانی پزیشکی تایبەت .

ب ـ غازی دایفۆسجین و ترایفۆسجین و کلۆرۆپیکرین.

نیشانە زۆرە کە ئەم جۆری ژەهرە لەپێشا هێرش دەباتە سەر ئەندامەکانی هەناسە. بۆ نموونە: مژی کوژینی بۆ مێشك دەگاتە 0.2 ملغم/ لیتر، بۆ پشیلە 0.5ملغم/ لیتر. مژی تەواوی ئەم ژەهرانە دەبنە هۆی داوەشاندنی سییەکان، بەڵکو نیشانەکانی دەگاتە ئەندامەکانی دەمار و ئێسقانی بڕبڕەی پشت. لێکۆڵینەوە دەری خستووە کە ئەگەر نیشانەی ئەم ژەهرانە گەیشتە مێشك ، ئەوا نەخۆشەکە تووشی نەخۆشیی ئەرخەوانی (cerebria Purpura)، واتە پێستی لەشی نەخۆشەکە شین ومۆر دەبێتەوە و کارەکەی دەگاتە خولی خوێن و لە دەمارەکانیەوە دەردەچێت و دەگاتە نێوان ریشاڵەکانی لەش. هەروەها لێکوڵینەوەکانی زانا ـ بوسینکو ـ دەری دەخات کە کاریگەریی ژەهری فۆسجین دەتوانێت بگاتە سەر ئاستی ناوەوەی بۆریی خوێن و ئەندامەکانی دەمار و نەخۆشەکە تووشی نەخۆشیی دەروونی دەکات و مێشك هەودەکات و سییەکان دەئاوسێن و ئاوێکی تایبەتی تێدا پەیدا دەبێت، هەروەها

ڕادەی ئاو لـە خوێن و ڕیشاڵەکانی لەشدا تێك دەچێت و ڕادەی پرۆتینی خوێن نزم دەبێتەوە و ڕادەی خوێ‌کانزادەکان .

فریاگوزاریی کاریگـەی ئاوێتـەکانی فۆسجین بریتییە لـە چارەسەرکردنی ئاسایی ئەو نیشانانەی کە لەسەر پێست و ڕیشاڵەکانی بۆری هەناسە دەردەکـەون. پێش هەموو شتێك دەبێت نەخۆشـەکە لـەو شـوێنە دوور بخرێتـەوە و نابێت هیلاك بکرێت و لەکاتی گۆڕینی جلوبـەرگدا دەبێت سـەرمای نـەبێت بەشێوەیەکی ڕێکوپێك و هێمنانـە غازی ئۆکسـجینی بدرێتێ . بۆ ئـەوەی گـەرووی وشك هـەڵ دەگـەڕێت ، پێویستی بـە هالاوی هەڵم هەیە، نابێت ئامرازی هەناسەدانی وەك ulmoter بـۆ دابنرێت و ئەگـەر زۆر پێویست نەبێت. بە کورتـی دەبێت ئامۆژگاریـەکانی هـەردوو زانا ـ سیس و گۆڵدمان ـ پـەیڕەو بکرێت، وەك: حەسانەوەیەکی تـەواو، دوورخسـتنەوە لـە سـەرما، هیـچ خواردنەوەیـەك بەکارنـەهێنرێت ، ئۆکسجین لـە کـاتی زۆر پێویستدا بـەکار بـهێنرێت. ئەگەر پێویست بوو خوێنی بدرێتێ، لە کاتی کۆکەیەکی زۆردا حـەبی تایبـەتی بدرێتێ، وەك: Condein یان Dicodid و جۆری دیکەش، ئەگەر پێویست بوو شـاف (پشك) ی بۆ هەڵبگیرێ، یان شەکری فرکتۆزی بدرێتێ.

٣ـ ژەهری ئەندامانی هەناسە:

بریتییە لە کۆمەڵێك ئاوێتەی ئۆرگـانیکی هاوبەشـی لەگـەڵ زەرنیخ یـان قورقوشم. ئەمانـە بـە تایبـەت کاردەکەنـە سـەر ئەندامـەکانی بۆریی هەناسە، لـە دەم و لووتـەوە تاوەکو سـیـیەکان. ئاوێتـە ژەهرینـەکانی زەرنیـخ دەمێکـە زانـراوە، لـە زەمـانی ـ دیوسـکۆریدس ـ لـە سـاڵی ٤٠ـ ٩٠ پ. ز. وە، لـە سـاڵی ٩٠٠ ز. دا چینیـەکانی ئاوێتـەی گۆگردێکـی زەرنیخیـان بـۆ قـەلاچۆی مێش و مەگـەز بـەکارهێناوە؛ بـە تایبـەتی سیانە ئۆکسیدی زەرنیخ لەگەڵ هەنگویندا بۆ قەلاچۆی مێروولـە. ئیمڕۆش چـەند نموونەیـەکی تایبـەت هەیـە کـە بـۆ قـەلاچۆی مـرۆڤ بـەکار دەهێـنرێ؛ وەك: (Clark-1) Diphenylarsinchloride pemmarsin و Diphenylarsincyanide (Clark-2). chloride. هـەروەها کـاتێك ئاوێتـە ژەهرینـەکانی زەرنیـخ بـەکار دەهێـنرێت، گـورج

دەچنە سەر باری دووکەڵ یان تەمێك، ئینجا کاردەکاتە سەر ئەندامەکانی هەناسە و بە شێوەیەکی ناوەندی کاریش لە پێست و چاو دەکات. ئەم کارانە هەمووی بە تێکڕایی بە خەستیی ژەهرەکەوە بەستراوە. بۆ نموونە: خەستییەکی (0,5 ملغم /م$^{3}$) نیشانەکانی لە چەند چرکەیەکدا دەردەکەوێت، وەك: کزانەوە و خوراندنی دەم و لووت، بەڵام ئەگەر پلەی خەستیی ژەهرەکە بەرزتر بوو، یان نەخۆشەکە زۆرتر لە ژێرکاری ژەهرەکەدا مایەوە، ئەوا نیشانەی ستەمەکانی دیکەشی دەردەکەوێت. بە گشتی بە کۆکەیەکی توند دەست پێ دەکات، ئازار لە ناوچەوانیدا بڵاو دەبێتەوە، ڕەنگە توانای بینین کز ببێت و ئازار بگاتە سەر سنگ و نەخۆشەکە ترسی لێ دەنیشێ و هەستی لاواز دەبێت. ڕەنگە تینی ژەهرەکان بگاتە تێکدانی چالاکی ئەنزیمەکانی لەش و کاری بگاتە جگەر و بۆریی میز و ڕیخۆڵەکان و نەمانی توانایی بینین. ڕەنگە ئەم جۆرە نیشانە قورسانە ئیتر چارەی نەکرێت، هەرچەندە پزیشکی پسپۆڕ دەتوانێت لە یارمەتیی وەڕس نەبێت. ئەگەر بڕی ژەهرەکە کەم بوو، ئەوا ڕێگا بە نەخۆشەکە دەدرێت و بە هەڵمژینی هەڵمێکی ڕوون لە کوحولی ئەسیلی، ڕێگای جگەرەکێشانی پێ نادرێت. دەتوانرێت شیری گەرمی بدرێتێ یان بڕێکی کەم لە کوحولی ئەسیلی. لە کاتی سووتانەوەی پێستدا، ئەو شوێنە بە گیراوەیەکی ئامۆنیای کوحوول، پاك دەکرێتەوە، ئینجا لە ماوەی نیو سەعاتدا دوو جار بە ڕۆنی کەتان چەور دەکرێت و لە دواییدا، هەتوان (مەرهەم) ی توتیای لێ دەدرێت و بە تێماڵ (سارغی) تێکی لۆکە دەپێچرێتەوە. ئەگەر کارەسات گەیشتبووە چاو، ئەوا ئامۆژگارییەکانی ـ فیشر ـ ڕەچاو دەکرێت. لە پێشا چاو بە گیراوەی کاربۆناتی سۆدیۆم (2 ـ 3%) دەشۆردرێت، ئینجا هەتوانێکی کەمکردنەوەی ئازاری لێ دەدرێت، وەك: Percaims, Panthegim, Larocian ...
ئەگەر لەم گیراوە تفتانە دەست نەکەوت، بۆی هەیە دڵۆپی زنگ (10٪) یان پریڤین بەکاربهێندرێت، یان Atropen و Scoplamin یان ئەوەی پزیشك بۆی دادەنێت، بۆ ئەوەی نەخۆشییەکە بڵاو نەبێتەوە، بۆی هەیە دەرمانی پاکژکردنەوە بەکاربهێنرێت، وەك: Targesink, Syrgol, Collargol، بە پێی ئامۆژگارییەکانی پزیشکی پسپۆڕ.

هەروەها بۆ خاوێنی چاو، دەتوانرێت دەرمانی Antispetic بەکاربهێنرێت یـان هـەتوانی Cibazol،Marfon. لەگەڵ ئەمانەشدا دەبێت پزیشك چاوی بە نەخۆشەکە بکەوێت.

هەر لەم بوارەدا کۆمەڵێکی فراوانی دیکە لە ئاوێتەی ژەهـری کیمیایی پێکهێنراوە، بە ناوی ئاوێتە ئۆرگانیکە ئەلیفاتیکەکان هەیە، لـێرەدا هـەندێ توخمـی وەك: زەرنیخ و قورقوشم و هالۆجینەکان و گۆگرد و نایترۆجینی جۆراوجۆر هاوبەشیی تێدا دەکەن، بۆ نموونە:

أ ـ ئاوێتە ئەلیفاتیکـەکانی قورقوشـم: کۆمەڵـە ئاوێتەیـەکی فـراوان دەگرێتـەوە، لـە هەمان کاتدا لە لابوردا لێکۆڵینەوە بەردەوامە بـۆ پێکهێنانی ئاوێتـەی تـازەی ترسـناکتر کە هەندێ توخمی وەك توتیا و بزموس و جیـوە هاوبەشـیی دەکـەن، بـۆ ئـەوەی پلـەی ژەهرینیان بەرزتر بێت .

ب ـ ئاوێتـەی ئەلیفاتیکـەکانی زەرنیـخ: وەك ( مەسـیت ئەرسـین دوانـە کلۆریـد ـ ئەلفا نویست). ئەم جۆرە ژەهرانە بۆنێکی ناخۆشیان هەیە. نیشـانەکانیان بـە ڕشانەوە دەسـت پێدەکـات و کـار لـە ئەندامـەکانی دەمـار و بـۆری هەناسـە دەکـات و دایـان دەوەشێنێ و ددان و پووك دەکەونـە ئـازار و سەرێشـە دەسـت پـێ دەکـات و پەسـتانی سەر مێشك و گوێ بەرز دەبێتەوە. ئەگەر نیشانەی ئـەم ژەهرانـە لـە پێسـتەوە دەسـتی پێکرد، ئەوا دەبێت ئەو شوێنە بە گیراوەیەکی نفت باش بشۆرێت. ئەگەر نینی ژەهرەکە گەیشتە سەر چاو، ئەوا پێویستە باش بە ئاو بشۆرێت ئینجا بەگیراوەیەکی ڕۆنـی بـوروون یان بەگیراوەیەکی نفتی ڕۆن و دەبێت لە ڕووناکی دوور بخرێتەوە.

ج ـ ئاوێتـە ئەلیفاتیکەکانی گۆگرد: لـێرەدا بـە تایبـەتی نـاوی غـازی خـەردەل (Mustard Gas) دێتە پێشەوە. ئەم جۆرە ژەهرانـە بەتایبـەت کار لـە پێستی لـەش دەکـەن. نیشـانەکانیان بـەخواردن دەسـت پێدەکـات. لەگـەڵ سـووربوونەوە و سووتانەوەی پێست. ئەگـەر ژەهرەکـە کـاری لـە چـاو کـرد، ئـەوا دەسـت دەکـات بـە ئاوکردن و کزبوونی بینین و پـەیدابوونی دووەـڵ. بۆی هەیـە ئـەم کـارە چـەند مـانگێك بەردەوام بێت و کاردەکاتـە مێشـك و ئـازار لـەناو چـەواندا دەسـت پێدەکـات و دەسـت

لـەرزۆكیی تـووش دەبێـت و سیسـتـەمی ئـەندامی دەمـار تێـك دەچێـت و گـوێ دەزرنگێتەوە و گەلێكی تریش. بۆ چارەسەركردنێكی ئاسایی بەتایبەتی خوێی كلۆریـدی كالسیۆمی وشك بەكاردەهێنرێت.

د. ئاوێتە ئەلیفاتیەكانی ئەمین؛ وەك غازی خەردەلی نایـترۆجینی (Nitrogen) Mustard Gas

هـ. ئاوێتەكانی ئۆكسایمی هالۆجین: وەك ئاوێتەكانی نەسل Nessel.

1. ژەهری دەمار(الاعصاب).

بریتییە لە كۆمەڵێكی فراوانی ئاوێتەی ئۆرگانیك و نائۆرگـانیك، بۆ نموونـە سیانیدی هـایدرۆجین، زەرنیخیدی هـایدرۆجین، فۆسفین، پێنجـەم كـاربۆنیكی ئاسـن، چـوارەم ئەسیلی قورقوشم و ئاوێتە ئۆرگانیكەكانی جیوە.

لێرەدا تەنها ئاوێتەی هایدرۆجین ئەكەینە نموونـە، ئـەم ئاوێتەیـە یەكێكـە لـە ئاوێتـە ژەهرینـە بـەهێزەكان، بۆ یەكـەم جـار فەرەنسـییەكان لـە شـەڕی یەكـەمی جیـهاندا بـەكارهێنراوە و لـە ژێـر نـاوی (ڤینسینات) كـە بریتییـە لـە هەڕەمەیـەكی ئـەم ترشـە و كلۆریدی زەرنیخ و چوارەم كلۆریدی توتیا و كلۆروفـۆرم. بـە ئاسـانی نـاتوانرێت بـڕی ی مژی سیانیدی هایدرۆجین و خوێیەكانی دەستنیشـان بكرێت، هـۆش هەیـە، وەك لەشـی مرۆڤ كـە دەتوانێت بەشێكی ئـەو ژەهـرە بگۆڕێت بۆ ئاوێتـەی دیكـەی بـێ ژەهـرین، هەروەها بەرهەڵستی لەشی مـرۆڤ جیـاوازیی هەیـە، بـە گشتی ئەگـەر بـڕی ژەهرەكـە بەرز بوو ئاوا هیچ چارێك نییە، بەڵكو ئەو مرۆڤە ژیـانی لـە دەسـت دەچێت. بـەڵام بـڕی ژەهرەكـە لـە ڕادەی كوشتن خوارتـر بـوو، ئـەوا ئـەم نیشـانانە دەردەكـەوێت: پێسـت دەست دەكات بە سووربوونەوە؛ گەروو دەكەوێتە خوران؛ چـاو سووردەبێتەوە، هـەموو لەش دەست بە ئازار دەكات لەگـەڵ ڕشـانەوە و گرانـی قووتـدان و دەنـگ گـڕ دەبێـت و دەگیرێت و دەموچـاو سوورهەڵ دەگـەڕێت و هەناسـە سـوار دەبێت و لـەش تووشـی لەرزۆكی دەبێت و توانایی قسەكردنی نامێنێت و پلەی گـەرمیی لـەش نـزم دەبێتـەوە و هەست بە سـەرما دەكرێت و ڕەنگـە ئەمانـە بگاتـە بوورانـەوە و كۆتـایی ژیـان. لـە فریاگوزاریدا دەبێـت پێش هـەموو شتێك نەخۆشـەكە لـەو شوێنە دووربخرێنـەوە و بـێ

ئەوەی سەرمای ببێت، دەبێت گەرم دابپۆشرێت، دەتوانرێت بە دەست یارمەتیی هەناسە دانی بدرێت. پزیشکی تایبەت دەتوانێت حوقنەی بۆ بکات، بە مەسیلینی شین Methylenblue یان نەترینی سۆدیۆم. ئەگەر ژەهرەکە لە ڕێگای دەمەوە بێت، ئەوا گیراوەیەکی ڕوونی لەکبریتاتی فیرۆز و ئۆکسیدی مەگنیسیۆمی دەدرێتێ، ئەم گیراوەیە یارمەتیی ڕشانەوەی دەدات، بەڵام لەکاتی بوورانەوەدا نابێت هیچی بدرێتێ، بەڵکو دەرزیی ـ لۆبیلین lobelin ی لە ژێر پێستەوە لێ دەدرێت. ئەگەر نیشانەی ژەهرەکە لەسەر پێست دەرکەوت، ئەو شوێنە دەبێت باش بە ئاو بشۆردرێت، ئنجا بە گیراوەیەکی ڕوون لە بیکاربۆناتی سۆدیۆم. نیشانەی ئەنجامی جۆرە ژەهرەکانی ئەم بەشە ئاوێتانە هەموویان بە شێوەی گشتی یەك كارەساتە.

٥ـ ئاوێتە ژەهرینە ئۆرگانیەکانی فۆسفۆر: توخمی فۆسفۆر یەكێكە لەو توخمانەی هاوبەشیی پێکهێنانی ژەهرە ئۆرگانیکەکان دەکات. لە هەمان کاتدا ئەم جۆرە ئاوێتانەش ڕۆڵی تایبەتی لە بواری پیشەسازیدا هەیە، بە تایبەتی بەرهەمە پۆلیمەرەکان لە پلاستیك و دەرزووی‌دەستکرد و نموونە لەم ژەهرانە: تابون، سارین، ئیستەراتی تامیل. ژەهرەکانی فۆسفۆر لە هەمولایەکەوە هێرشی دەباتە سەر لەشی مرۆڤ. نیشانەکانی هەموو پێکەوە دەست پێ دەکات. بۆریی هەناسە دەست بە کزانەوە دەکات و دەموچاو زەرد هەڵ دەگەڕێت و ڕشانەوە دەست پێ دەکات، دەم لیکێکی زۆر فڕێ دەدات، میزکردن زۆر دەبێت، بەڵکو نەخۆشەکە خۆی پێ ناگیرێت، توانستی قسەکردنی نامێنێت، بەڵکو دەگاتە حاڵی بوورانەوە و ڕەنگە کۆتایی بە ژیان بهێنێت. بەگشتی ئەمە کورتەیەکە لە ئەنجامی ئەو کارەساتە ترسناکەی کە لەم جۆرە ئاوێتانە دەکەونەوە. ئەگەر لەم ڕووە تاریکەوە بۆ قەلاچۆکردنی مرۆڤ بەکاربهێنرێت، ئێمەش بەشێکمان لەو کارە چەپەڵە بەرکەوتووە. بەڵام ئەگەر هاتو ئەم ئاوێتانە بۆ کاروانی ئاشتی بەکارهات، ئەوە بوارێکی گەلێك فراوانی لەسەر ئاستی پیشەسازی هەیە. بۆ شارەزاییی باشتریش لەم بوارەدا ئەوە دەتوانرێت کەڵك لەم کتێبە وەربگرێت: (مبادیء کیمیاء السموم الصناعیة ـ الدكتور عزیز احمد امین).

## ملخص البحث

**السموم الكيمياوية الفعالة**

**د. عزيز أحمد**

يتناول البحث تأثير المواد الكيمياوية السامة المركبة المصنعة التي يتسبب استخدامها، وفق أسس وظروف خاصة في انتشار العديد من الأمراض والكوارث المؤسفة و دمار الحيوان والنبات والأنسان.

## *Abstract*
## *Effective chemical Ingredients*

*Dr. Aziz Ahmed*

The study deals with the effect of chemical ingredients, as used in special circumastances, on the spread of various kinds of diseases and causing many regretable disasters such as destruction of humanbeings, animals and plant.

# تێکستێك بە زمانی ماد

د. کوردستان موکریانی

## پێشەکییەکی مێژوویی:

لە سەدەی نۆیەمی پ.ز.دا لە نێو شوێنەواری نووسراوی ئاشوورییاندا بۆ یەکەمین جار هێما بۆ نێوی ماد کراوە و بە تایبەتی لە سەردەمی شەلمانسەری سێیەم (٨٥٨ ـ ٨٢٤ پ. ز.)دا. لە نێو نووسراوانی ئاشووریدا لە شێوەی (ئامادای) هاتووە، لە نێو نووسراوانی مێخیدا وشەی (مادا) واتای زەوی و زارە خاك، وڵاتی گەیاندووە. بۆیە نێونانی ئاشوورییان بۆ ئەم هۆزانە لە ڕووی ئەتەوەیی نەبووە، بەڵکو نێوێکی جوگراف بووە، هەروەکو نێوی هەرێمی (پارسوا) کە کەوتبووە باشووری ڕۆژاوای گۆمی ورمێ بوو بە نێوی ئەو هۆزانەی، کە هاتن تێیدا نیشتەجێ بوون و هەر لەم نێوەوە نێوی پارس // فارس داڕێژرا.

نێوی مادا// مادای لە نیوەی یەکەمی هەزارەی یەکی پ. ز. دا ئەو هۆزانەی دەگرتەوە، کە بە چەند دیالێکتێکی ئێرانی زۆر لێکەوە نێزیك دواون و لە نێوان سەدەی ٩ ـ ٧ پ.ز. دا لە دەورووبەری ڕووباری (قزل ـ ئوزون) و دەشتی کافردا دەسووڕانەوە و بەرەبەرە شوێنی نیشتەجێ بوونیان فراوانتر بوو، تا ئەو بەرزاییانەشی گرتەوە، کە دەگاتە کەنداو لەبەری باشوور و تا گۆمی وانیش لە بەری باکوورەوە، کە هاوتەریبی کێوەکانی زاگرۆس بوو و لە دواییدا کوردستانیشی گرتەوە.

لە نیوەی دووەمی سەدەی هەشتەمی پ. ز. (٧٥٠ پ. ز.) دا بە سەرۆکایەتی دەهیاکۆ پاشایەتی ماد دامەزرا ، ئەم پاشایەتییە وا بەهێز بوو لەساڵی ٦١٢ پ. ز.دا توانی بەسەر مەزنترین دەوڵەتی سەردەمی کۆن ـ ئیمپراتۆریەتی ئاشوورێکان دابدات، کە ئەمەش بە سەرکردایەتی کەیخەسرەوی پاشایاندا بوو، لە دوای ڕێککەوتنیدا لەگەڵ ئەبوبلاسەری بابلیدا، لە ئەنجامدا پاشایەتێکەیان بوو بە ئیمپراتۆریەتێکی گەورە، کە وڵاتی ماد، فارس، ئاشوور و ئاسیای بچووکیشی گرتەوە، بەڵام ئەم ئیمپراتۆرییەتە

لەدوای کەیخەسرەودا زۆری نەخایاند، ئـەوە بـوو لـەکاتی فەرمانڕەوایـەتی ئیسـتیاگیزدا دەسـەڵاتداریتی مادەکـان کۆتـایی پێهات، ئەویش بـە زەوتکردنـی ئـەم دەسـەڵاتدارییە لەلایەن کۆرشی یەکەمەوە، کە دەڵێن نەوەی وەیا خوشکەزای ئیستیاگیز بـووە و نێوی دەوڵەتەکەی بە هەخامەنشی گۆڕیوە ( ДБяконов 1956).

پێتەختی ماد ئەکباتان بوو، کە ئەمڕۆ بە هەمەدان ناودەبرێت و ئەم نێوە لە زمـانی فارسیی کۆندا (هەگماتانا) بووە، کە واتـا گشتێکەی شوێنی کۆبوونـەوە دەگەیەنێت.

لە نێو نووسینەکانی هـیرۆدۆتدا نێوی شـەش خێڵـی مـاد هـاتووە ، کـە ئەمانــەن (ئاریزانت، پاریتا، کینۆی، بۆوسای، ستروکاتیس، بۆودیۆی و ماگۆ) (د. جمال رشـید و د. فوزی رشید ۱۹۹۰) .

**نووسین بە زمانی ماد:**

لەو نێوچانەی ، کە مانێکان تێیدا نیشتەجێ بوون و لەدواییدا بوو بە بەشێك لە مـاد جۆرە نووسینێك بەکارهاتووە، زۆر لە نووسینی ئورارتوو چووە، کـە دوور نییـە لـەوەوە وەرگـیرابێت، هـەروا لەدەوروبـەری گۆمـی ورمێـدا هێندێـك نووســراوی هــیرۆگلۆفی دۆزراوەتـەوە، کـە هـەروەکو هـیرۆگلۆفی ئورارتـوو بـووە، کەواتـە مادەکـان لـە خـاکێکدا نیشتەجێ بوون، کە پێشتر نووسینی تێـدا هـەبووە. هـیرۆدۆت لـە نووسینەکانی خۆیـدا هێما بۆ ئەوە دەکات، کەوا لە سەردەمی دەهیاکۆ هـەموو کـار و ڕووداو و کێشـەی وڵات بە نووسین خراونەتـە بەردەسـت دەهیـاکۆ ئـەویش بڕیارەکـانی خـۆی هـەر بـە نووسـین بڵاوکردوونەتەوە، بەڵگەیەکی دی ئەوەی، کـە مادەکـان نووسـراویان هـەبووە، ئەوەیـە: هەخامەنشێکان، کـە شـوێنکەوتەی ئـەوان بـوون و زەوتکـەری دەسـەڵاتدارێتییان بـوون نووسـراویان هـەبووە، کەواتـە دەبێـت مادەکــانیش نووسـراویان هــەبووبێت ( 1956 ДБяконов، د. جەمال رشید و د. فوزی رشید ۱۹۹۰، دکتر حسینقلی کاتبی ۱۳٦۹).

لە نێو زمانی ماددا چەند ووشەیەك ماونەتـەوە، کـە زۆر لـە زمـانی ئاوێستا نێزیکـە وەك (( ئەسپە ـ مادی، ئەسپە ـ ئاوێستایی (ئەسپ)؛ سپەك ـ مادی، سپەك ـ ئاوێسـتایی (سـەگ)؛ تیگری ـ مـادی، تـیرری ـ ئاوێستایی (تیژ)؛ خشەثریتە ـ مـادی، خشــەثرە ـ

ئاویستایی (پاشایەتی، دەسەلاتداریتی)؛ ئارییە ـ مادی، ئارییە ـ ئاوێستایی (ئاری).

لە نێو تێکستەکانی زمانی فارسی کۆن وشەیەکی زۆری بیانی هەیـە، کـە زمانـەوانان وای بۆ دەچن، کە لە زمانی ماد وەرگیرابن وەك (( هەورنە ـ خـۆر. میترە ـ میهرەوانی، خشە ثرە ـ توانایی ، خشیثیە ـ پاشایەتی ، ویسپە ـ گشتی، هەموو ، وەزرك ـ گـەورە ، مەزن ، ئەسنە ـ سینگ ، ئەسپەرا ـ ئەسپە سوار ، زانتا ـ هۆز و خەلك ـ تیگریس ـ تیژ و ... (Дбяконов 1956، Cameron 1947 ، د. جمـال رشـید و د. فـوزی رشـید ١٩٩٠).

تاکە تێکستێکی درابێتە پال زمانی ماد و تا ئێستە دۆزرابێتەوە، ئەو تێکستەی کلێسەیە ، کە لەگەل شەش زمانی دی (گریکی، ئاسووری، گورجی، عـەرەبی، فارسـی و تورکی) لە نێو دەستنووسێکدا دۆزراوەتەوە، کە بە ئەلف و بێی ئەلبانی نووسـراوەتەوە و ترانسکریپچی هەر هەوت تێکستەکەش بە زمـانی ئەرمـەنی دراوە، لـەم دەستنووسـەدا نێوی کورد لەپال ئەم تێکستەدا نـەهاتووە، بـەلکو نێوی (مـار) هـاتووە ، کە ئـەویش شێوەی گۆکـردنی ئەرمـەنە بۆ وشـەی (مـاد) ئـەوەی شایەنـی باسـە لـەنێو فەرهەنگـێکی ئەرمـەنی ـ تورکیـدا، کـە لـە نیـوەی یەکـەمی سـەدەی نۆزدەمـدا نووسراوەتەوە، بەرامبەر بـە (مـار // مـاد) بـە کـورد، شـیروانی ماناکـەی لێکدراوەتـەوە Австикяна . Сюрмеляна и Авгеряна 1837 Առձեռն բառարան

ئەمـەو ئـەمڕۆ ئـەم تێکسـتە بـەر زمـانی کـوردی " دیـالێکتی کرمـانجی بـاکوور" دەکـەوێت، هـەروا لێکۆلـەرەوەی ئـەم دەستنووسـە باسـی ئـەوەی کـردووە، کـەوا لـە شوێنانی دی ئەم دەستنووسەدا تێکستی دی بە زمانی (ماد) هەیە و هێماشی بۆ ئەوەی کردووە، کەوا (ماد)ەکانیش ئەلف و بێی تایبەتی خۆیان هەبووە*.

لێکۆلەرەوەکە وای بۆ دەچێت، کەوا ئـەم دەستنووسـە لـە سالی ١٤٤١دا لـە لایەن زێتر لـە نووسـەرێك تـەواوبووبێت و دەستنووسـەکە ٣٤٦ پـەڕە و بابـەتی جۆراوجـۆری سەردەمانی کۆن و سەردەمی خۆیدا تێدا کۆکراوەتەوە.

ئەگـەرچی تـەواوبوونی ئـەم دەستنووسـە بۆ نیـوەی یەکـەمی سـەدەی پـازدەم

دەگەڕێتەوە، بەڵام من لەبەر ئەم هۆیانەی ژێروو وای بۆ دەچم، کەوا تێکستە کوردێکە و ئەوانی دیش بۆ سەدەی هەشتەم و سەرەتای سەدەی نۆیەمی زایینی بگەڕێنەوە:

١) نووسین بە زمانی ئەلبانی لە نێوان سەدەی ٥ ـ ٧ زایینیدا لە ناوچەی کەفکازدا لەپاڵ زمانی گورجی و ئەرمەنیدا بووژابووە و لە سەدەی هەشتەمدا بەر باروودۆخی موسڵمانێتی بووندا کەوتن و لە سەدەی دەیەمیشدا لەبەر هێرشی مەغولدا دەسەڵاتدارێتییان لەدەست دا، بۆیە لە سەدەی پازدەمدا ئەلف و بێکەی ئەو کاریگەرییەی نەماوە، بۆ ئەوەی بە چەندین زمان تێکستی کلێسەیی پێ بنووسنەوە.

٢) دەبێت تێکستی کلێسەیی لە سەردەمێکدا نووسرابێت، کە هێژ خەڵکێکی زۆر لە گەلانی وەك کورد و فارس و گورجی و... لە سەر دینی ئیسایی مابنەوە. موسڵمانێتی لە دەوروبەری ٦٣٩ ز. دا کوردستانی گرتەوە و لە ساڵی ٧٥١ دا هەڵمەتی موسڵمانکردنی گەلان وەستا.

٣) لەم دەستنووسەدا هەر باسی بابەتانی سەردەمی نووسینەوەی ئەم دەستنووسە ناکات، بەڵکو نێوەڕۆکەکەی دەیان بەرهەمی بیری سەدانی پێش سەردەمی خۆی دەخاتە ڕوو هەروەکو باسکردنی نووسینەکانی واردان (١٢٢ ز.) کە لە بەرهەمی بیری خۆیدا ناوی ئەو گەلانە دەبات، کە ئەلف و بێی تایبەتی خۆیان هەبووە و یەك لەوانەی ناوی دەبات (ماد)ە.

٤) لە سەدەی تەواوبوونی نووسینەوەی ئەم دەستنووسەدا، کە نیوەی یەکەمی سەدەی پازدەمە نێوی (ماد) باونەبووە، بەڵکو هەر لەنێو گێڕانەوەی ڕووداواتی ڕابوردوودا نێوی هاتووە، هەروەکو لەنێو دەستنووسی (واردان) و دەیان دەستنووسی دیدا.

٥) شێوەی داڕشتنی فرێزی دیارخەری تێیدا، کە ئاوەڵناو (دیارخەر) بەپێش ناو (ناوی دیارخراو) کەوتووە، هەر وەك xode Pakež، کە pakež ئاوەڵناوە و لە ڕستەدا (دیارخەر)ە و بەپێش (xode) ناو (ناوی دیارخراو) کەوتووە، کە ئەم بارە ڕێزمانییە تەنێ بە زۆری لە نێو تێکستەکانی کۆنی ئێرانیدا بەرچاو دەکەوێت و بەرە بەرە لە

سەردەمی نێوەڕاستدا کەمتر بەکارهاتووە و لە سەردەمی نوێدا لە فرێزی دیارخەریدا بەزۆری نێوی دیارخراو بەپێش دیارخەر کەوتووە و بەگشتیش بە یارمەتی ئامرازی خستنەسەر دارێژراوە وەك (خودێیَ // خودای پاکژ // پاك) ، لە کاتی بەکارهێنانی دیارخەر لەپێش ناوی دیارخراودا یاسای رێزمانی تایبەتی خۆی هەیە بۆ وێنە دەوترێت (پاکترین خودا) // (خودێیَ هەرە پاك // پاکژ // پاکژ // پاقژ) ، هەروا هەبوونی دیارخەر لە دەرەوەی کەوانەی فرێزی دیارخەریدا هەر وەك pakež zahm, pakež vemark ئەنێ لەنێو زمانانی کۆنی ئێرانیدا بەرچاو دەکەوێت بەلگەیەکی دی زمانەوانی، کەوا ئەم تێکستە بۆ سەردەمی نێوەڕاستی کۆمەڵە زمانانی ئێرانی دەگەرێتەوە شێوەی دارشتنی وشەی vemark (بێمەرگ)ە، کە هێژ (v)یَ بە (b)یَ نەگۆڕاوە، هەروەکو لەم وشانەی سەردەمی نێوەڕاستی کۆمەڵە زمانانی ئێرانیدا بەرچاو دەکەوێت (vang) بانگ، (vark) بەرگ، (vemar) بیمار، (vastan) بەستن، (vavar) باوەڕ، (varan) باران و... (فەرهەنگی پەهلەوی ١٣٤٦).

**تێکستێك بە زمانی ماد**

Pakež xodė pakež zahm, pakež vemark, koj hat i xače
eŞker ma . rahmat e ma.(A. ШАНИДЗЕ 1938 )

لێکدانەوەی وشەکان

Pakež: پاك، پاکژ، پاقژ، لێرەدا ئاوەڵناوە و رۆڵی دیارخەری گێڕاوە و بە پێش ناو کەوتووە و لەگەڵیدا فرێزی دیارخەری دارشتووە و هیچ ئامرازێکی سینتاکسی بەشداری ئەو دارشتنەی نەکردووە.

: خودێ، خودا، خولا، ئیزد، یەزد. نێوی دیارخراوە و کەوتۆتە دوای دیارخەرەوە.

Zahm: (بە) توانا، بەهێز. نێوی دیارخراوە.

Koj: ئەوەی کە. ئامرازی گەیەنەرە.

Xač: خاج ـ وشەیەکی ئەرمەنییە.

e ker: سوپاس، پێزانین. لە (شکر)ەوە هاتووە.

Ma: ما، مە، ئێمە.

Rahmat: بەزەیی، میهرەوانی. لە (رحمە)ەوە هاتووە.

**تێبینی و ژێدەر**

* بەڵگەی ئەوەی، کە مادەکان ئەلفوبێی تایبەتی خۆیان هەبووە، ئەو ئەلفوبێیەیـە، کە بینوشاد و ماسی سوراتی لە سەدەی نۆیەمدا بۆ زمانی کوردییان داناوە و بـە دەیـان بەرهەمی بیری خۆیان پیّ چاپ کردووە (أحمد النبطی ٢٤١ کۆچی // ٨٢١ زایینی).

**ئەلفوبێی کوردی لە سەدەی نۆیەمی زایینیدا**

**سەرچاوەکان**

- احمد بن ابو بکر بن وحشیه النبطي الکلدانی ۲٤١ کۆچی / ٨٢١ زایینی. شوق المستهام فی معرفه رموز الأقلام.

- گۆڤاری زاری کرمانجی ۲۷/۳/۱۹۲۹، ژمارە ۱۸، لاپەڕە ۲و۳.

- سعید خانی کوردستانی. ۱۳۰۹/ ۱۹۳۵ تزانی. تهران.

- А.ШАНИДЗЕ :
NОВООТКРЫТЫЙ АЛФАВИТ КАВКАЗСКИХ
АЛБАНЦЕВ И ЕГО ЗНАZЕНИЕ ДЛЯ НАYКИ
И. АБУЛАДЗЕ
К ОТКРЫТИЮ АЛФАВИТА КАВКАЗСКИХ
АЛБАНЦЕВ ТБИЛИСИ 1938
ИЗДАТЕЛЬСТВО ГРYЗИНСКОГО ФИЛИАЛА
АКАДЕМИИ НАYК СССР

Cameron G.G. 1947 The Perspolis Treastury Tablet. Chicago
Дъяконов И. М. 1959 История Миди.МоскоВо - Ленингра

- دکتور بهرام فروەشی . ۱۳٤٦ فرهنگی پهلوی.

- د. حسینقلی کاتبی ۱۳٦۹ زبانهای باستانی آذربایجان . تهران.

- د. جمال رشید احمد و د. فوزی رشید ۱۹۹۰. تاریخ الکرد القدیم. أربیل.

- د. کوردستان موکریانی. سەردەمانی زمانی کوردی و کۆمەڵە زمانانی ئێرانی. ئامادەی (چاپە) دەستنووسە.

## ملخص البحث

## نص كنسي باللغة الميدية

د. كوردستان موكرياني

أولى الإشارات الخاصة بالميديين وردت في القرن التاسع عشر قبل الميلاد و بالأخص في كتابات الملك الآشوري شلمنصر الثالث ٨٥٨ ـ ٨٢٤ ق. م. حيث جاء ذكر القبائل الميدية بصيغة (آمادای) إن هذه التسمية لا تمثل الاسم القومي للميديين بل هي نسبة إلى المنطقة التي تمركزت فيها هذه القبائل على غرار منطقة (بارسوا) التي اشتق منها اسم (پارس = فارس).

إن ما يتعلق بالمدونات الميدية نادرة جداً ففي المناطق المانئية التي أصبحت جزءً من ميديا كان يستعمل أسلوب كتابي بخط مشتق من الخط الاورارتي ويشير هيرودوت إلى أن (ديوكيس وطّد مركزه على العرش واستمر في فصل القضايا بالعدل وكانت القضايا ترسل اليه كتابةً) لذا يعتقد أن الكتابة المسمارية للملوك الأخمينيين الذين خلفوا ملوك ميديا مباشرةً ترجع في الأصل إلى صنف من الكتابة الميدية.

لقد تم العثور في أوائل القرن الماضي على مخطوطة مدونة باللغة الألبانية تعود إلى عام ١٤٤١ للميلاد حيث دونت من قبل مجموعة من الكتاب في مراحل عدة، و تحتوي المخطوطة على مواضيع لعصور قديمة و معاصرة لها.

من الموضوعات التي ذكرت في هذه المخطوطة أكثر من مرة وجود ألفباء خاصة باللغة الميدية مع نص كنسي بهذه اللغة التي يرجع إلى نهاية القرن الثامن وأوائل القرن التاسع الميلادي.

## *Abstract*

### *Text in Median Language*

*Dr. Kurdistan Mukeryani*

In the 9 th century (A.D.), Medians were referred to, for the first time, specifically among the Assyrian King Shalmansar inscription (858 824 A.D), where the Median tribes were mentioned in the form of (Amady). This name does not represent the nationality of the Medians, however it belongs to the reigon where they concentrated similar to the name (Pars, Fars) which was derived from (Parswa) the reigon where they lived.

Median writings are very rare. In Manian areas, which became a part of Media, people used in their writings, letters (characters) derived from Orarti. Herodotus says, [ Diocsus, reinforced his influence by his just and impartial rule. The legal cases were sent to him in writing ]. So it is supposed that the cuneiform writing, used by the Achmenian King, who succeeded the Median kings, is derived from a kind of Median writings.

At the beginning of the last century, a manuscript was found going back to 1441 A.D. ,and written in Albanian by a group of writers through different stages. This manuscript contains old and contemporary subjects. The manuscript mentions, more than once, the existence of a specific Median Alphabet and the text in Median Language which goes back to the end of the eighth century or the begininng of the ninth century (A. D.).

# گیرەکێن زمانێ کوردی
## "زاری کرمانجی"

فادل نومەر

**ـ ا ـ**

**پێشگۆتن:**

پرت و بەلاڤی و ژێك دوورییا زارێن زمانێ کوردی، دابەشبوونا کوردان ل سەر پتر ژ پێنج دەولەتان، زمان و کولتوورێ وان ژی دابەش و ژێکجودا کرییە، و سینۆر بووینە دیوارەك دی ل بەر پەیدابوون و وەرارکرنا زمان و ڕەوشەنبیرییەك ئێککرتی.

یا ژ ڤێ ژی خرابتر ئەوە هەر زارەك کوردی بەر ب خوە و سەمتەك جودا ژ زارێن ل وەلاتێن دی وەرارێ دکەت و ئالاڤێن تێککەهشتنێ ڕۆژ بۆ ڕۆژێ کەمتر لێ دهێن .. ل ڤر دەورێ ڕەوشەنبیرێ کورد، زمانزانێ کورد.. چییە؟ و گونەها وی چییە؟ ب من وەرە ئێك ژ مەزنترین ئاریشێن زمانێ کوردی، نەبوونا سیستەمێ زاراڤ دارێشتنییە، کو ڕێ ل بەر هەرکەسەکی ڤەدکەت ببتە زمانزان؟!.. هۆسا ب دەهان، هەگەر نەبێژم ب سەدان پەیڤ و زاراڤ کەڤتینە ناڤ زمانێ کوردی بێی چو تێکەلی د گەل زمان و دەستوورێن زمانێ کوردی هەبن. بۆ نموونە: کەتوار، دۆرهێل، بەروار بۆ دیرۆك، هۆزانڤان، پەروەردە، شۆرشڤان، چارەنڤیس، خاست یان خواست ل شوونا داخوازی، توخمپەرست ل شوونا توخمپەرێس یان توخمپەرس، ڕێباز،.. هتد.

ل ڤر پرۆژەیەك دەسپێکی بۆ دیارکرن و ناسینا گیرەکێن زمانێ کوردی (د چارچۆڤێ زاران ژی دا بت)، ئەز وەکو ئەرکەك نەتەوەیی دزانم، لەو ئەڤ هزرە من دارشتە سەرپەڕان و من ژ زارێ کرمانجی دەستپێکر کو ئەز تا ڕاددەیەکێ ژێ ب ئاگەهم داکو ببتە دەستپێك بۆ سینۆردان و چارچۆڤەکرنا گیرەکێن زمانێ مە، بەر ب زانستی کرنا ب کار ئانین و دارێشتنا پەیڤ و زاراڤان بۆ زمانێ پاشەڕۆژێ، کو بارێ مە هەمیانە.

و ئەڤە باشترین دەلیڤەیە کو باسێ تەرمینۆلۆجیا (زانستێ زاراڤ دارێشتنێ - زاراڤەسازی) بێ بکەم کو ل چەرخێ بیستێ بوویە زانستەك سەربخوە د نێڤ زمانناسیێدا.

ل دێر زەمان دەما وەرارا جڤاکان هێدی و ل سەرخوە پەیڤەک ژ ڤر دچۆ ور یان پەرەڤاژ، لێ دگەل ریێسانسێ یان تێکەلیا گەلێن ل پێش دگەل گەلێن ل پاش، یان دەستپێکی و هەبوونا کۆمەکا مەزن ژ تێگەهـ و ئامێرێن تازە و بێناف رێ ل بەر تێریشەکا دژوار یا زاراڤان ڤەکر، چ ژ ناڤدە (ئەوروپا) چ ژ دەرڤە (ل وەلاتێن دی). هەلبەت ئەڤ دیاردەیە هەوجەی رێکخستن و سیستەمکرن و راستەرێکرنێ بوویە، لەو ل چەرخێ بیستێ (ب تایبەتی) بنستڕا ڤی زانستی هاتە دارشتن و ئێککرتنەکا تەرمینۆلۆجی دەست پێ کر، رێکخستن و دەزگەهێن ئێڤنەتەوەیی بۆ ڤێ ئێکێ پەیدابوون وەک: ISAوISO و Infoterm .. هتد، و رۆژ بۆ رۆژێ ئەڤ زانستە د وەراریدایە.

**گیرەك** Affix:

دەنگەکە یان مۆرفیمەکە یان پتر، نەدوورە د کۆکا خوەدا پەیڤەک سەربخوە بت لێ د گەل وەختی ئەڤ سەربخوەیی ژ دەست دایە و د گەل پەیڤەک دی، یان ڕەگەکی نەبت ب دەورێ خوە رابت، یان ژی پەیڤەکە نە ل جهێ خوەیێ زمانکی ب وی دەوری رادبت؛ ئەڤنە هەکەر کەڤتنە پێشیا پەیڤان دبێژنێ پێشگر Prefix و د ناڤ کەلواشێ ڕەگێ پەیڤێدا، دبێژنێ نێڤگر Infix، و هەکەر پاشیا پەیڤێ گرت دبێژنێ پاشگر Suffix و هەکەر سەروبن گرتن دبێژنێ Circumfix هەکەر ب گهۆرینێن د دەنگیدا ئەڤ ئەرکە هاتە ئەنجامدان (ب تۆنێ یان سترێسێ) دبێژنێ Suprafix or Superfix. و هەکەر دوو پەیڤان یان پەیڤەکێ و گیرەکەکی یان پتر پێکڤە گرێ بدەت دبێژنێ ناڤبەند Interfix کو ب دەورێ پێکڤە گرێدان یان خوەشخوانییێ رادبت.

و دا کو گرنگیا گیرەکان د زمانێ کوردیدا ڕۆهن ببت دێ نموونەیەکی بەرچاڤ کەم کو - نەدوورە - مەمستەرە بت بۆ یێن دی. ژ ڕەگێ - گر - ب پاشگر و پێشگران ئەم دکارین ڤان پەیڤان دارێژین:

ـ گر ـ

گرت: گر ـ ت

گرتن: گر ـ ت ـ ن

ڤەگرت: ڤە ـ گر ـ ت

ڤەگرتەڤە: ڤە ـ گر ـ ت ـ ە ـ ڤە

داگرت: دا ـ گر ـ ت

هلگرت: هل ـ گر ـ ت

راگرت: را ـ گر ـ ت

سەرنەگرتن: سەر ـ نە ـ گر ـ ت ـ ن

بەرگرت: بەر ـ گر ـ ت

وەرگرت: وەر ـ گر ـ ت

باشگرت: باش ـ گر ـ ت

خوەهرگرتن: خوەهر ـ گر ـ ت ـ ن

تێڕاگرتن: د ـ ێ ـ ڕا ـ گر ـ ت ـ ن

پێشگرتن: پێش ـ گر ـ ت ـ ن

گرتەك: گر ـ ت ـ ەك

کەوگیر: (کەو) ـ گیر

ڤەگر: ڤە ـ گر

دەزگر: دەز(دەست) ـ گر.. هتد.

**پێشگر** :Prefix

گیرەکەکە یان پتر، پێشییا پەیڤەکێ یان ڕەگەکی دگرت و مانایەك دی یان ڕەوشەك دی ددەتە ئاڤاهیێ نوو دارشتی، وەك:

چۆن ـ داچۆن

فڕین ـ هلفڕین

کڕ(کڕین) ـ بکڕ

پێچان ـ وەرپێچان

پێچان ـ تێوەرپێچان .. هتد

**نێڤگر** Infix:

د کوردیدا دەنگەکە دچتە د نێڤ کەلواشێ ڕەگیدا، وەك:

کشا ـ کێشا

ڕشت ـ ڕێشت (ڕێهت/ ڕێت)

کەلشی ـ کەلاشت

برشت ـ براشت.. هتد.

**پاشگر** Suffix:

دەنگەکە یان مۆرفێمەکە پاشییا پەیڤێ یان ڕەگێ یان ژی فرێزەکێ پێشـگر دگـرت. مانایەك نوو یان ڕەوشەکا دی ددەتە پەیڤا دروست بووی، وەك:

دەست ـ دەستوور

دەست ـ دەستك

دەست ـ دەستەك

دەست ـ دەزگەھ

دەست ـ دەزگر.. هتد.

**دۆرمانگر** Circumfix:

د هندەك زمانان‌دا گیرەکێن ئاوێتە هەنە کو هەردو ڕەخێـن پـەیڤێ د گـرن، د زمـانێ مەدا، نەدوورە، ب کەمی بۆ شرۆڤەکرن و ناڤکرن و بەرخواندنکرنا دیاردەیـا پێربەسـت و پاشبەندێن وان، ئەم وەجێ ژ ڤی تەرزی وەرگرین:

پێربەست: د، ب/ ڤ، ژ، ل.

پاشبەند: دا، ڕا، ڤە

ـ گۆپال ب ملێ من ڤە بوو، دەما ئەز د ناڤ مالانڕا چۆیمە د ناڤ چەمیدا.

د ڤێ هەڤۆكێ دا پێڤە و تـێرا و تێدا هاتینـە ب كـار ئینـان، و ئـەم دكـارین دروَڤ و ناڤان.. دانینە شوونا ڤان نژیاركێن زمانی، وەك:

- گۆپال خوەهر بوو، دەما ئەز پێخواس چوّیمە كۆلانێ.

**د سەر ڕاگر** Suprafix or Superfix:

د ڤی تەرزیدا، تۆن Tone یان سترێس Stress ب دەورێ گیرەكـان ڕادبیت. و ئـەڤ گیرەكیا ب تۆنێ و سترێسێ دهێنەكرن، نەدووره د كوردیدا بهێنە دیتن، لێ هنێ لێگەڕان و ل دووڤچوّن پـێ دڤێت، وەكـی دروستكرنا دەربـازبوونێ (تێپـەڕاندن) ب قەلـەوكرنا دەنگێ (و) د ڤەرێژێن پەیڤا سۆتندا، وەك:

- ئەز ب خوە دێ گلێشی سۆژم. (دەربار)

- گلێش ب خوە دێ سوژت. (نەدەربار)

- ڤرا كەوی (ڤڕ).

- گاڤێن خوە ڤڕ هاڤێژتن (ڤڕ).

**نێڤەند** Interfix:

دەنگەكە، یان مۆرفێمەكە، یان پتر دوو پەیڤان، یان پەیڤەكێ و گیرەكەكی، یان پتر پێكڤە گرێ ددەت، و نەدووره ئەڤ دەنگە، یان مۆرفێمە سفر بت، وەك:

دەر - دەربدەر سەر - سەرانسەر

زنگ - زنگەزنگ شێر و ژن - شێرەژن

سۆر و گول - سۆرگول.. هتد.

گەریانەك د ژێدەران دا:

خودانێ پرتووكا Modern Linguistic's Morphology فرانسـس كاتامبـا دنڤیست، گیرەك: ئەو مۆرفێمە یێ هەبوونا (ماناداریا) وی ب گرێدانا وی ب مۆرفێمەك دی یان مۆرفێمێن دیڤە (رەگ Root، قورمە - پەیڤ Stem، بنەما Base) پەیدا دبیت. لەو گیرەك - ب دیتنا كاتامبای - مۆرفێمەك بەندە، و ئەڤە وا لێ دكـەت كو چـو پـەیڤ ژ گیرەكەكی ب تنێ پێك نەهێن.

خودانێ پرتووکا A Dictionary of Grammatical Terms in Linguistics، ر. ل. تراسك ب ڤی رەنگی گیرەگی ددەتە ناسین: مۆرفیمەك بەندە، یێ هەبوونا وی ب خوەگرێدانێ ب پەیڤەکێ یان ڤورمەکیڤە چێ دبت. و دبت گیرەك دارشتنکی بن یان ڕێزمانکی. گیرەك داپەش دبنە ڤان جۆران؛ پێشگر Prefix، پاشگر Suffix، دۆرمانگر Circumfix، نێڤگر Infix، و د سەرواگر؟ Suprafix or Superfix.

ڤەرهەنگا Merriam – Webster's Collegiate Dictionary مۆسا گیرەکی ددەتە ناساندن: دەنگەکە، یان تیپەکە، یان پتر پێشـەهی یا پەیڤەکێ، رەگەکی؛ یان ڤرێزەکی دگرت، یان ژی نێڤا پەیڤێ، یان رەگـی دگرت و ب دەورێ دارێشتنا پەیڤەکێ یان رەوشەکا تازە رادبت.

خودانێ پرتووکا وشەرۆنان لە زمانێ کوردیـدا د. ئـەوڕەحمان حـاجی مـارف، دنڤیست: ئافیکس ئەو مۆرفیمەیە کە واتای ڕێزمانیی هەیە. گـیرەك لـە زماندا بـە تـەنیا پایەخی نییە، بەلکو کە دەچێتە سەر وشە دەتوانێ دەوری دروست کردنی وشە ببینێ و واتا ببەخشێ. لێ ڤێ پێناسێ کەماسییێن خوە هەنە، بۆ نموونە، دۆزا مانـادارییێ هـەژی ل سەر ڕاوەستانێیە.. و دا کو مەرەما من باشتر رۆهن ببت دێ ڤێ نمۆنێ بەرچاڤ کەم:

بەراڤ (بەر ـ اڤ)

پەڕاڤ (پەڕ ـ اڤ)

ل وەختێ بەهرا پتر ژ زمانزانێن کورد دبێژن: بەر گیرەکە، کەسێ نەگۆتییـە پـەڕ (د ڤێ پەیڤێدا) گیرەکە، هەکەر چی لێك سواربوونا هەبوون و نەبوونا بەهایێ زمانکی د ڤان پەیڤاندا هەیە، ئانکو، بەر د پەیڤا بەراڤدا مانا رۆهنترە ژ پەڕ د پەیڤا پەڕاڤدا، لێ هەکـەر مە گۆت: پـەڕێ گوندی، پـەیڤا سـەربخوە و مانـادار (پـەڕ= دەورووبەر) خـوە ئاشـکرا دکەت. لەو سەربخوەیی هند گرنگ نامینت.

نیشانێن ڕێزمـانکی، هنـدەك ژ گیرەکـان دوور دکـەن، ئەڤـە ژی ئارێشـەیەك دبیـە، چونکی دەمێ (د ـ) وەکو نیشانا بەردەوامیێ د پەیڤا (دچۆ) دا پێشگر نـەبت، بێگومـان (ـ ت) ژی د پەیڤا گرتدا، وەکو نیشانەك ئاڤاکرنا کـارێ دەمـێ بۆری د زمـانێ کوردیـدا،

نابتە پاشگر. هۆسا کریارێن ئاڤاکرنا کاری و پەیدا کرنا دەمی د زمانیدا ژ گیرەکێن زێبەهر دبن.. و ل سەر هەمان دەستووریێ ناڤگر د کوردیدا ئامینت، چونکی ناڤگرێن کوردی، بەهرا پتر، ناڤگرێن کارینە، و رۆلێ دەربارکرنێ (تنبپەراندنێ) دگێرن.

لەو هەر زێدەهییەکا ل رەگی بقەومت، پێدڤییە گیرەك بت.

هۆسا ئەم د کارین بێژین گیرەك مۆرفێمەکە یان پتر، پێش ـ نێڤ ـ پاش ـ ی یا پەیڤەکێ، رەگەکی.. دگرت و دەوریێ وێ مانایێ ددەتێ. هۆسا ڤەکرنا دەرگەهێ گیرەکان دبتە دەرگەهێ رۆهنکرنا هندەك نهێنیێن پەیڤان ژی، و لێکۆل پەیڤەکا وەکی کەرخەسپالە دادنتە بەر دەستێ خوە و پارچەیێن وێ هەکەر نە گەهینتە سەر رەهێ دگەهینتە سەر مانا وێ، و ئەڤە ژ بلی کو دۆزەکا زانستییە دبتە سامانێ زمانی و دەرگەهەکە بۆ بەرهەمێ نووتر.

زمانێ کوردی ئێکە ژ وان زمانێن پەیڤێن خوە ب پێکڤە نووساندنێ دادرێژن، ژ بلی هندەك تایبەتمەندیان؛ ئانکو دارێشتنا پەیڤەکا نوو ب گهورینێن ناڤخوەیی نابت، بەلکو ب ل سەر زێدەکرنێ ـ ل پێش و پاش و دەگمەن ل ناڤ ـ دهێتە ئەنجام دان. و ئەڤ زێدەهییە گیرەکن، کو نەدوورە مۆرفێمەك بت یان پتر، مانا خوە رۆلێ خوە د پەیڤێدا دیار بکەت یان نیڤ ـ نیڤە بت یان ژی هێشتا دەوریێ پەیڤاتیێ بگێرت.. د کوردیدا گیرەك د ڤی رێنجێ بەرفرەهدا (ژ بێمانابیێ تاکو مانادارییێ) رۆلێ خوە دلەییزن بۆ نمۆنە (وەر ـ) چوییێ بۆ تێگەهشتنێ نادەتە دەست مە، لێ هەکەر مە گۆت: ئێ رەنگە مانایەك شێلی ددەت، و هەکەر مە گۆت بێڤ کەس نزانت مە چ گۆت، لێ دەما دبێژین بیڤك یان بیڤەلەرز ئێکسەر ئەم دزانین ئەرد پێ مەرەمە. و یا بەرهۆز ژی ئەوە، هەمی گیرەك ل دەمەکی مانادار بووینە لێ وەراریێ و گهۆرینێ گەهاندینە دەستوداریێ گیرەکییێ، لەو نابت ئەم خوەسەری و مانادارییێ ب تنێ بکەینە پیڤانا گیرەکییێ ئەخاسمە مە پەیڤ (مۆرفێم) هەنە مانا خوە ژ دەست دانە لێ ئەم نکارین بێژینێ گیرەك، وەك پەیڤا چەل د چل و چیادا، د چەلەنگدا، د بەرچەلیدا، هەروەسا پەیڤا/ مۆرفێما چێل د پەیڤا بەرچێلکدا، د گەل پەیڤا چلەك و کەسێ چل هەڤبەر بکە، یان ڤان پەیڤا:

بابەلیسك، بارڤیرك، باكوزیرك،

بادەڤ، بارۆڤە، باخۆرە،

باگەر، باهۆز،.. ... .. هتد.

ژ بلی پەیڤا با و تا راددەیەكێ زڤیرك (زڤرین) و كوزیرەك (كوزراندن) و گەر (گەران؟) رۆهن، وەكی دی ـ بەلیسك و دەڤ و ـ رۆڤە و ـ خۆرە و ـ هۆز.. هەوجەی لێگەرانەك ئەتیمۆلۆجینە داكو رەهـ و رۆلێ وان بهێنە زانین.

دیسا ئەدووره گیرەك ژ مۆرفێمەكی، یان پتر پێك بهێت، وەك:

أ. هلپەسارتن (هل ـ پەسار ـ ت ـ ن)

ـ كرپار (كر ژ كرین ـ یار)

ب ـ تێكله (د ـ ئێك ـ هل ـ ە)

ـ پێكدادان (ب ـ ئێك ـ دا ـ دا ـ ن)

ـ تەڤلهەڤ (د ـ هەڤ ـ ل ـ هەڤ)

ـ دەستروودان (دەست ـ د ـ روو ـ ڤە ـ دە ـ ا ـ ن)

تشتێ دبیێ هەژی باس كرنێ ئەوە، وەرارا مێژوویی هندەك فۆرمێن تازە ددەتە پەیڤان یان ژی وەرارەك چەند ـ ئالی ددەتە گیرەكەكی و رەنگە شێلیاتییەكێ دئێختە پێشبەری لێگەر و لێكۆلان كو نەچار بین هندەك پیڤانان ـ ژ بلی ئەوێن مە گۆتین ـ بۆ گیرەكێ دانن، وەكی: پێدڤییەگیرەكی دەستوورەك هەبت، ئانكو ل گەلەك بیاڤان هەمان دەوری بگێرت. بۆ نموونە: هەگەر مە گۆت (دا ـ) پێشگرەك كارییە، مانا بەر ب خوارێ ددەتە كارێ (چۆ) دەما ئەم كارێ (داچۆ) ژێ دادرێژین، فەرە هەمان مانایێ ل كارێن دی ژی زێدە بكەت (فری، كەڤت، شكەست..)، دەما ئەم هەمان پێشگری لێ زێدە دكەین.

د ڤی واریدا لێگەر تووشی گەلەك گیرەكان دبت یان رۆلێ وان هند رۆهن نینە یان ژی د پەیڤەكێ ب تنێدا دهێتە دیتن، وەك: پەیڤا خوەندەڤا كو ژ رەگێ خوان ـ و پاشگرەكی ئاڤا بوویە (دەڤا) و ئەڤ دەڤایە هند رۆهن نینە كانێ ئێك پاشگرە یان

پاشگرەك لێكداییيە؟! و مرۆڤ نزانت كانێ ئەڤی پاشگری تێكەلی دگەل (دەب/ دەپ) ا كەڤن كو د دەفتەر و دەبیر و دبستاندا دیار دبت هەیە یان نە. هەكەر نە چ تێكەلی دگەل پاشگر (-ەوا) هەیە وەكی د پەیڤا پێشەوادا دیار دبت؟ و هەكەر هەڤبەندی هەبت ئەو چ (د) ە كەڤتییە د نێڤبەرا رەگی و پاشگریدا؟.. ژ بلی ڤێ هەمییێ، نەدوورە ئەساز د زمانیدا پەیدا ببت، یان ژ (خوان - دە) و (ڤان) ەك خوەجە پەیدا ببت. هەروەسا هندەك پەیڤێن لێكدای هەنە هندەك ژ پەیڤێ رۆهنە و هندەك نە، ئەڤ (هندەكا نە) چییە؟ گیرەكە یان بەرماییكا پەیڤەكا دییە؟.. وەك: باتمان، ژ بات!؟ و مان// من (كێشەكا كەڤنە)، پێك هاتیە. یان پەیڤا دەستپێك كو ژ دەست - پێ - ك (ژ كرن) پێك دهێت، و -ك - ل ڤر ب دەورەك تایبەت رادبت كو ب سانەهی ناكەڤتە چو قالبان، ژ ئالیێ دیڤە بەرماییكا پەیڤێ وەكی پاشگر لێ هاتییە و پێشگر پتر مانایێ ددەتە گوهداری. هەروەسا پەیڤا هلباسكی؟! د ڤێ رستێدا: چەتێ هلباسكی چیای یان دارێ بو. ئانكو پێڤە چۆ، ل ڤر هەكەر پێشگر هل - و باسك (ژ باز - بازوو) رۆهن و بەرهۆزبن، رۆلێ (-ی) چییە؟ و هەكەر تێكەلی د گەل باسكێ چیای هەبت، چاوا پێشگر وەرگرتییە و ئەو (ی) یە چییە؟ هۆسا هەركەس دكارت ب دەهان پەیڤان رێز بكەت،

ئەڤجا پرسیار ئەوە ژ دەست دانا مانایا فەرهەنگی ب تنێ بەسە كو درۆڤێ گیرەكێ پەیدا ببت؟ بۆ نموونە گۆن د پەیڤا گەنمگۆن دا پاشگرە لێ رەنگ د پەیڤا گەنمرەنگدا نە پاشگرە چونكی هەمی دزانن رەنگ چیە لێ گۆن مانا خوەیا فەرهەنگی ژ دەست دایە. بەرە ڤاژی ڤێ ئێكێ ژی هەیە، ئانكو مانا گیرەكی كەمترە ژ یا پەیڤێ، وەك: سەرمەیان (سەمیان)، بەرهۆز (بەر ئاقل) .. ل ڤر سەر و بەر ژ مەیان (كەرستە: سامان..) و هۆز(هۆش..) رۆهنتر و بەرهۆشترن!! لەو ئەم كورد هەوجەی پیڤانەك تایبەتین بۆ دەستوداریێ گیرەكێ، كو تایبەتمەندییا زمانێ مە ل بەر چاڤ بگرت.

ژ ئالیێ دیڤە بۆ زمانێ مە و وەرارا وی مە هندەك پیڤانێن تایبەت و جودا هەبن بۆ گیرەكان و هەر پەیڤەكا ل جهێ خوەیێ رێزمانی نەبت یان ئالاڤ وی جهی وەرنەگرت فەرە ئەم سەرەدەرییا گیرەكینیێ د گەل بكەین، وەك:

پەیڤا گیا، دار، گول.. کو ناڤێن جۆرینە رۆلەك گرنگ هەنە د نـاڤکرن و جوداکرنێـدا، وەك:

- داربەڕوو، دارمازی، دار باهیڤ، دارسێڤ..

هنبەری:

- دارا بەڕوویێ، دارا مازییێ، دارا باهیڤێ، و دارا سێڤێ بکە.

ئەڤجا مە بڤێـت نـەڤێت داربـەڕوو رەوشـەك زمانکییـە (مۆرفۆلۆجـی) و دارا بـەڕوویێ رەوشەك رێزمانکییە (سینتاکسی)، و هەردو بۆ گەهاندنا مەرەمێ هەڤسەنگن.

ئەز ل بن سیبەرا دار بەڕوویێمە.

- ئەز ل بن سیبەرا دارا بەڕوویێمە.

چاوا بـت گونجاندنـا یاسـا و دەسـتوورێن جیـهانی د گـەل زمـانێ کـوردی و بەرلێکۆلینکرنا زمانێ مە ئەرگەك نەتەوەییە بەری ئەرگەك زانستی بت.

## گولبژارەیەك ژ لێکۆلینێن پێشتر

پرۆفیسۆر ق. ق. کوردۆییێف ژ بلی کو بەرهەمێ گەلەك زمانزانێن دی (نەخاسمە یێن بیـانی) دانایـنە بـەرچاڤ و رەخنەکرینـە ب درێـژی ل سـەر گـیرەکێن زمـانێ کـوردی راوەستایە و ئەرکێن وان دیار کرینە و پێکۆلا پۆلاندنا زانستی بۆ پێشگران کرییە.

باسێ پێشگرێن پێڤە (لکاو) کرییە:

ن - نخامت، آ - ئالاست، ب - بشکفت، تە - تەمراند، و هن (هەن) - ئەن.

و یێن جودا و سادە، وەك:

هل، وەر، را، دا، ڤە، ڤێ، روو.

و یێن سادە و نوو، وەك:

بەر، سەر، دەر، پێش، پاش، پەی، دوو، ناڤ، بن، ژێر.

و یێن لێکدای کرینە پێنج گرۆپ:

١- لێ، پێ، تێ، ژێ.

٢ـ لەڤ، پەڤ، تەڤ، ژەڤ.

٣ـ سەررا، بەررا، ناڤرا، بنرا، رەخدا، شووندا، پێشدا، پاشدا، بندا.

٤ـ پێڤا، پێدا، تێرا.

٥ـ لێك، پێك، تێك.

هەروەسا باسێ پێشگر و پاشگرێ (ڤە) کرییە و پاشگرێن ـ ەك، ـ ۆك، ـ ی، ـ تی، ـ انا، ـ انە، ـ انی، ـ کی، ـ کا، ـ اهی، ـ ایی،، هتد.

د. ئەورەحمان حاجی مارف د پرتووکا (وشەرۆنان لە زمانی کوردیدا) دا، کو ئەدوورە ئێکەمین پرتووکا زانستی بت د ڤی واریدا، ب درێژی باسێ ئینتەرفیکس، کۆنفیکس، ناوگر، پێشگر و پاشگرێن زمانێ کوردی کرییە و ب دەهان نموونە ئانینە، لێ هەمی ڤەنەگرتینە.

ئینتەرفیکس: مۆرفیمەکی بێ مانایە پشکدارییا لێکدانا پەیڤان دکەن، وەك:

ە، و، ەو، او، ان، بە.

کۆنفیکس: ئەوە پتر ژ گیرەکەکی بکار بهێن، وەك:

نە ـ خۆش ـ ی

وەر ـ گەڕ ـ اند ـ ن

ناوگر: دکەڤنە ناڤا رەگێ پەیڤێ، وەك:

بواردن ژ بووړین.

برێشکە ژ برژانەوە.

پاشی باسێ ناڤێ دارێژراو، ئاوەڵناوی دارێژراو، کرداری دارێژراو، ئاوەڵکرداری دارێژراو کرییە و ل دوابیێ باسێ پەیڤێن لێکدای کرییە.

هەروەسا د. ئەورەحمان حاجی مارف د (رێزمانی کوردی ـ مۆرفۆلۆجی ـ ناو) دا، ل بەندا (ناوی دارێژراو) باسێ ڤان پێشگر و پاشگرێن ناڤی دکەت:

گەر، دار، ساز، بەند، وان/ ەوان، چی، باز، کەر، مەند، ی، هتی، یتی، ایەتی، ێنی، گا، گە، ستان، خانە، دان، لان/ ەلان، ەن، جاڕ، زار، ەوار، لە، ڵە، وولە، ۆلە، ۆڵە، ۆل،

ۆلێ، ەلێ، یله، ۆکه، ۆك، چه، وو، ۆ، وولکه، ۆلکه، یلکـه، چکـه، ۆچکـه، ێـن، ێنـه، ینـه، وانه، ك، که، گار، وەر/ ەوەر، ە، ین، وور، انه، ەوا، ەمەنی، اك، ندە، ەك، ایی، ان، ار، یار، ەر، مان، وە، دە/ یدە، پێ، را، بەر، هاو، بە، و.. هتد.

جگەرخوین د ئاوا و دەستوورا زمانێ کوردیدا و دگەل زنجیرا نڤیسینێ باسـێ چـەند گیرەکان کرییە، کو ناڤێ ئالاڤ لێ کرییە، ژوان:

ئالاڤێ جیگە: ستان، گە، لان، خانە، دان ـ ل ٢١و ١٢٣

ئەك، انگ، مال ـ ل ٢٣.

ئالاڤێن بچووکی: ك، کە، کێ، کا، کۆ، ۆ، .. ل ٢٤ و ١٢١

هەروەسا: دار، یار، کار، خوەر، بەر، ئەر، کەر، بەند، مەند، ڤان، دۆز، چی ـ ل ٤٧

ڤ، را، هل، دا ـ ل ١٢٧ و ١٢٨

ل ١٢٨ و ١٢٩ کۆمەکا دیبا تێکەل باسکرینە، لێ گەلەك ژێ گیرەك نینن.

سادق بەهائـەددین ئـامێدی د رێزمانـا کوردیـدا نـاڤێ هەرسـێ تـەرزێن گیرەکـان ب تەرزێ: پێشپرت، پاشپرت و ناڤگر، ئینایـنە و ل سەر هندەکان راوەستایە، ژوان:

گر، کوت(قوت)، ڤان، (وان)، دار، بەند، ساز، باز، مەند، چی، ئینی(ئێنی)، ئی(ی)، کەر، ئێتی، گا(گەه)، دان، خانە، ستان، زار، لان، جار، ئەن، وار، ئەوار، ئۆك، چە، ئـۆ، ئانێ، گین، ین، ئانك، ڤانك، ئل، ئیلە، تل، ئیسك، لـۆك، ئـەلۆك، ئـار، دۆز، ئـێر، ئـەخ، ئیخە، ئوختە، ئەختە، خیتە.

ل گەلەك جیێن دی د پرتووکا ناڤبریدا باسێ هندەك پاشگر و پێشگرێن دی دکـەت، وەك: ی، اتی، یەتی، هەل، دا، را، تێ، بێ، لێ، ژێ، وەر، ڤە، ڤـێ، پـەڤ، تێـك، ڤێـك.. هتد.

لیژنەی زمان و زانستەکان

کۆڕی زانیاری کورد

رێزمانی ئاخاوتنی زمانی کوردی

ئەڤانە کۆمەکا لێکۆلینێن زانستی بووینـە ل وەخـتێ خـوە لژنێـن زانسـتییێن کـۆڕی

زانیاری کورد ل بەغدا بەرهەڤ دکرن و د کۆڤارا خوەدا بەلاڤە دکرن و پاشی وەکو پرتووک ژی هاتینە وەشاندن. ئێك ژ وان بابەتێن هاتینە بەر هلکشافتن و لێکۆلینێن گیرەکێن زمانێ کوردی بووینە، لێ کەرستە، بەهرا پتر پێش هینگێ بوویە

**زمانێ فارسی**

زمانێ فارسی وەکو زمانەك ژ هەمان بنەمالا کوردی هەژی ل هنداڤ راوەستانەکێیە نە بەس ژ بەر وەکهەڤیا قانوون و دەستووران، بەلکو ژ بەر وەکهەڤیا پێشگر و پاشگر و ناڤبەندان ژی کو کەرستەیەك خامە بۆ هەڤبەکرنێ. هەروەسا رەهێن ناڤگرێ کوردی، نەخاسمە، ـا ـ یێ ئەرگ د فارسیدا دهێتە دیتن. بۆ ڤێ مەرەمێ من سوود ژ پرتووکا (دستور زبان فارسی) یا د. حسن احمدی گیوی و د. حسن انوری وەرگرت.

ئەڤ ژێدەرە، پێشگر و پاشگر و ناڤبەندان هۆسا ددەتە ناساندن: دەنگێن پێشی یان پاشی یان ناڤا مۆرفێمان یان پەیڤان یان فرێزان دگرن و تێگەهەك نوو ددەتە وان، و دهندەك دەستوودارێن دیدا رەوشێ دگهۆرن، وەکی ناڤی بکەنە دروڤ یان دروڤی بکەنە ناڤ.. و هندەك ژوان بۆ پتر ژ ئەرگەکێ ب کار دهێن.

پیشوندها (پێشگر): ب، با، باز، بر، بی، در، فرا، فرو، لا، ن، نا، وا، ور، هم.

پسوندها (پاشگر): ا، ار، اسا، آك، آگین، ان، انە، چە، چی، دان، سار، سان، ستان، ش، کدە، ك، کە، گار، گان، گانە، گر، گین، لاخ، م، مان، مند، ناك، ندە، وار، ە، ی، یت، ین، ینە.

میانوندها (ناڤبەند): ـ اشواق صابر گهر ـ د پەیڤێن وەکی (سراسر، لبالب، بناگوش..) دا.

پشتی ڤێ نێرینا سەرپێ ل هندەك بەرهەمێن کوردی و زمانەك هەڤرەگ د ڤی واریدا رەنگە پانۆرامایەکێ ل نك مرۆڤی چێ دکەت کو هزر تێدا بکەت و هزرا خوە یا تایبەت ژی پەیدا کەت و نەدووره هندەك پێشنیاز ژی سەر هل بدەن.. ئەها ئەڤا داویێ د خزمەتا زمانێ مە دایە، ئانکو هەرکەسێ تشتەك نوو یان ژیرکری هاتە بیرێ باشە بەلاڤ بکەت داکو هەمی ئەخشێ گیرەکێن زمانێ کوردی بهێتە زانین و دارێشتنا پەیڤان ژی کوردیتر و ب سانەهیتر لێ بهێت.

## نافەرۆك

**- ئ -**

**ئن ـ :**

ئەڤە بەرماییکا پێشگرەك هندوئەوروپییە کو ب چەند تەرزێن جودا د کوردیدا مایە، وەك:

ئن ـ / هن ـ / هەن ـ .. هتد.

ئنبار ژ ئن ـ بار

بنێرە: هن ـ

**ئی ـ :**

ئەڤ پێشگرە بەرماییکا پارچەیەکێیە ژ مێژووا گەلێ کورد و هەکەر دگەل هەڤگورێن وێ بهێتە هلشکافتن ئەدوورە پالپشتییا نڤیسینا مێژووا مە بکەن. د زارێن دییە زمانێ کوردیدا ب تەرزێ (ئیم) خوە دیار دکەت و ئەڤە دبتە بەرانبەری (این) ا فارسی. چاوا بت (ئی ـ) ب مانا ئەڤ/ ئەڤە ب تنێ دگەل هندەك دەمناڤان ل کارە، وەك:

ئیرۆ/ ئەڤرۆ/ ئڤرۆ= ئیمرۆ

ئیسال/ ئەڤ سالە

ئیشەڤ/ ئەڤ شەڤە

ئیجار/ ئەڤ جارە

د پەیڤا ئێرە (ڤێرە/ ڤێرێ) دا ـ ی ـ ل بن دەنگێ ـ ێ ـ هاتییە بهوژین، هەروەسا چۆیە سەر ناڤێ جهی ـ رە (ئارا).

**ئێك ـ :**

ئەدوورە گیرەکی و ئەگیرەکییا هەژماران ئێك ژ ئارێشەیێن پراکتیك و تیۆری بن د وارێ زمانیدا، لێ بەهانا هەری گرنگ ئەوە، گەلەك جاران، هەژمار ژ کەڤلۆژانکێ خوە دەردکەڤت و بیاڤەك دی یا مانایێ ل دۆر خوە چێ دکەت. بۆ نمۆنە (ئێك دل، ئێك دەست.. پێکڤە بهێنە نڤیسین یان جودا پتر دۆزا پێکهاتنێیە ژ راستییەکا زانستی)

هنبەری ئێـك مـرۆڤ، ئێك چیا یـان دلـەك و دەستەك.. بکە دێ بینـین ئێکدل دۆزەك زمانکییە و ئێـك مـرۆڤ یـان دلـەك دۆزەك رێزمـانکی، ئـانکو فۆرمـێ ئێـك ـ دل زاراڤـاتی ستاندییە، لێ دلـەکی هـەمان تشـت نینـە. و ئەڤـە دەرگەهـەك باشـە پـێ بچینـە د نـاڤ گیرەکییا هەژمار و پەیڤاندا.

ژ ئالییەك دیڤە خراب نینە هەڤبەندی و جوداهیێن ئێك و هـەڤ دەستنیشـان بکـەین کو هەردو د کۆکا خوەدا ئێکبوون. دگەل پێرپەستان جهێ ئێکدی دگرن، وەك:

تەڤ// تێك

لەڤ// لێك

ژەڤ// ژێك

پەڤ// پێك و ڤێك

دگەل ناڤان (هەڤ) بەر ب هەڤپشکییێ چۆیە و (ئێك) بەر ب ئێکگرتنێ.. ئانکو ئێك کۆمێ دیار دکەت و یا دی پارچەی، وەك:

ئێکدل، ئێکدەست..

هەڤدل، هەڤکەری، هەڤپشك..

دگەل ناڤێ کاری (ژێدەر) ئێك و هەڤ هەردو ب مانا یان ل شوونا ئێك و دو(هـەڤدو: ئێکدی) ب کار دهێن و هەڤسەنگییا کریارا دەرباز (تێپەڕ) ل هەردو ئالیـان دیـار دکـەت، وەك:

هەڤگرتن/ ئێکگرتن/ یەکگرتن

هەڤکوشتن/ ئێککوشتن (ئێکدو کوشتن ـ ئێکودو کوشتن..)

و جاران پشکداری ناڤاکرنا زاراڤێن تایبەت دبـت وەك: ئێکسـەر، کـو دکۆکـا خـوەدا مانا چۆنێ ژ جهەکی بۆ جهەك دی ـ ب ئێك سەمتی ـ ددەت.

ژ ئالیەك دیڤە خواندەك هوور ل سەر هەژماران ـ نەدوورە ـ گەلەم هاری مە بکـەت ژ بۆ رۆهن کرنا هندەك پاشگرێن دبێرین، وەك:

ـ یازدە/ دوازدە/ سێزدە/ پازدە/ شازدە/ نۆزدە

- چاردە/ هەڤدە/ هەژدە

- سیٚ - سیە/ سە/ سی

- چار - چوار - چل

- پیٚنج - پیٚنجی/ پیٚنجەه

- شەش - شیٚست

- هەفت - هەفتیٚ/ (هەفتاد)

- هەشت - هەشتیٚ/ (هەشتاد)

- نەه/ نۆ - نۆت

- آ -

- ا:

پاشگرەك گەلەك چەلەنگە د زمانیٚ کوردیدا و ب گەلەك ئەرگیٚن زمانکی و ریٚزمـانکی رادبت، بۆ نمۆنە، دچتە سەر رەگی و ناڤیٚ بکەری ئاڤا دکەت، وەك:

زان (رەگیٚ زانین) + ا = زانا

بەز (رەگیٚ بەزین) + ا = بەزا

هەروەسا - برِا - د فریٚزیٚ (شیریٚ برِا = السیف القاطع) دە

و چۆیە سەر پەیڤیٚن بیانی ژی وەك:

فەهم - فەهما

و پەیڤا - کوتا - هەکەر چی وەکو کاریٚ سـادەییٚ بـۆری ل کـارە لیٚ د پـەیڤا لیٚکدایـدا (کوتا کر) وەکو ناڤیٚ بکـەری دیـارە، ئەڤـە - نـەدوورە - گریٚدایـی وەرارا پاشـگر (- اه/ - اهی) بت.

کاریٚ دەم - بۆری دروست دکەت (جاران وەك - یا، - ها ژی ل کارە)، وەك:

گەرا: گەریا: گەرها

وەرا: وەریا: وەرها

چەرا: چەریا.. هتد.

دیران (تملك) و بالڤەدان بۆ مێ:

ئەو مال، ئا (یا) منە.

دۆتا سمۆی زیرەکە.

پەنجەرا مالێ شکاند.

جوانییا دلی ب دۆمترە ژ یا ڕووی.

**ـ ا ـ یا ناڤگر:**

دچتە دناڤ گەودەیێ رەگێ کارێ نەدەرباز (تێنەپەر) دا و دکەتە کارێ دەرباز، وەك:

کەلشتن ـ کەلاشتن

برشتن ـ براشتن

ئاخفتن ـ ئاخاڤتن

هەروەسا هەمان ناڤگر ناڤێ مینەڤی ژی ئاڤا دکەت، وەك:

خەبتین ـ خەبات

لەپتین ـ لەپات

هەدرین ـ هەدار

**ـ ا ـ یا ناڤبەند:**

بارا پتر دووبارەکرنا پەیڤەکێ پێکڤە گرێ ددەت و پەیڤەك تازە ئاڤا دکەت (لێ پتر ب فۆرمێ ان/ ام ل کارە)، وەك:

بەرابەر

سەراسەر

گژاڤژ/ ڤژاڤژ(ژ گژ/ ڤژ)

فشافش

پتاپت

و جاران وەکی ئەللۆفۆنێ (ە)، (و) خوە دیار دکەت، وەك:

نێرامیٚ: هەڤبەری شەنگەژن (شەنگ ـ ە ـ ژن) و کەسکوسۆر (کەسک ـ و ـ سۆر) بکە.

سەراینۆکرن: هەڤبەری بەرەڤاژ (بەر ـ ە ـ ڤاژ) بکە.

(١) یا ئاڤێستایی ل پێشیا پەیڤان:

د زمانی ئاڤستاییدا ئایەک/ ئەیەک هەبوو بۆ دوو مەرەمێن هەڤدژ هاتییە بکارئانین: ئێک ل شوونا (نە) یا ئێرۆ، یا دی بۆ پەژراندنیٚ وەکی (ئا، بەلیٚ، وەیە...) بێن ئێرۆ. د زمانیٚ کوردیدا ئەڤ گیرەکە/ ئالاڤە هند چەلەنگ بەرچاڤ نینە لیٚ ئەدوورە مرۆڤ بکارت هندەک بەرمایکێن وی ببینت، وەک:

ئارام ژ پەیڤا ئاڤێستایی رەم ب مانا ڤەهەسای هاتییە.

ئاواز ژ پەیڤا ئاڤێستایی ڤەچ ب مانا ئاخڤتن هاتییە، هەڤبەری (بێژ ـ) بکە.

ئاوارە (ئەدوورە ژ ئا ب مانا نە و وار پێک هاتبت)

ئاسان/ سانەهی ل ڤر ژ جوداهیا زاران رۆلیٚ خوە ژ دەست دایە.

هەروەسا ئەڤ پەیڤێن ل خواریٚ ژی هەژی رامانەکێنە:

ئاپۆرە/ پۆرە

ئاخوور/ خوارن

ئاخوین/ خواندن

ـ ات:

بۆ دیارکرنا کۆما تەرزەکی ل بیاڤەک بەرتەنگ ل کارە، و ئەدوورە گەلەک رەسەن نەبت د کوردیدا، وەک:

کۆچەر ـ کۆچەرات

ئاغا ـ ئاغەوات

ـ ات/ اد/ یات:

ئەڤ پاشگرە هند ئاشکرا نینە و ئەدوورە ئاڤێستایی بت کو دەوریٚ ئێیا بالڤەدانیٚ دگێرا و نهۆ، دبت، ب تەرزێن دی بهێتە شلۆڤە کرن و دبینێن جودا دەرهەق بنەکۆکا ویٚ

بهێنه بەرچاڤ کرن، وەك:

بنیات ژ بن

کەلات ژ کەل/ کەلهە/ قەلا/ قەلات (قلعه)، هەڤبەری ئی ـ کالۆ یا سۆمەری بکە کـو د ئەرەبیدا بوویە (هیکل). و کال ل ڤر ب مانا مەزن هاتییە.

هەلات دبت ژ (هەل وهات) هات بت. لی د پەیڤا رۆژهەلاتدا وەکو ناڤ ل کارە.

ـ اتی:

ئێکە ژ چەلەنگترین پاشگرێن زمانێ کوردی، رۆلێ سەرەکە ئاڤا کرنا ناڤێ مینەڤییـە ژ ناڤ و درۆڤان. ژ ئالییێ دیڤە ئەڤی پاشگری چەند فۆرم و دەنگێن جودا هەنە، وەك: ـ ەتی، ـ یەتی، ـ تی، ایەتی.. و جاران ـ ك ـ دکەڤە پێش وەك شـینکاتی، و نـەدوورە ـ ی یا ناڤێ مینەڤی ئاڤا دکەت ژی هەڤتوخم بت، وەك:

برا ـ برایەتی شێخ ـ شێخاتی

سڤك ـ سڤکاتی بچووك ـ بچووکاتی

نزم ـ نزماتی

ژ نمۆنەیێن دی:

کورد ـ کوردیتی

برا ـ برایەتی

زەر ـ زەرك ـ زەرکاتی

ـ اتینك:

پاشگرەك مژەوییە د پەیڤا پەلاتینك و جودا فۆرمێن وێ (پەلپەلاتینك؛ بەلبەلاتینك؛ پەلیتانك..) دا دهێتە دیتن، و پێدڤی هێژ ل دووڤچۆنێیە.

ـ اچ:

بنێرە پاشگر ـ انج.

ار/ اره/ یار:

ئەڤ پاشگره ب چەند دەوران رادبت وەك ئاڤاکرنا ناڤێ کاری، ناڤێ بکەری.. هتد.

ناڤێ بکەری یان بەرکاری:

کەڤنار/ کەڤناره (دبت ئەڤ پەیڤه ژ کەڤن دەگەل - ار ب مانا سال پەیدا ببت کو یار/ ار د کۆکا خوەدا فۆرمێ ئاڤێستاییه بۆ سال و هێشتا د هندەك پەیڤێن کوردیدا مایه، وەك: بەهار، پار، پێرار).

خەوار ژ خەو ب مانا ئەوێ/ ئەوا گەلەك حەز ژ خەوێ دکەت.

مرار ژ مر (کارێ دەمێ بۆری و رەگێ مرن).

تەمار ژ تەم.

ژەنگار ژ ژەنگ.

وا دیاره دەورێ وی د ڤان هەردوو پەیڤاندا هند چەلەنگ نینه.

ب مانا وەرز، یان سال کو وەکی هاتییه رۆهن کرن د کۆکا خوەدا ژ پەیڤا ئاڤێستایی یار (هەڤبەری Year د زمانێ ئینگلیزیدا بکه)، وەك:

پار ژ (پ؟) و (- ار)

پێرار ژ پێر و (- ار)

بەهار ژ بەه (باش) و (- ار)

ناڤێ کاری ژ کارێ دەمێ بۆری، وەك:

بڕیار کڕیار

پرسیار کریار (هەڤبەری کردار و پاشگر - یار بکه).

ناڤێ تشتی ژ ناڤەك دی:

گوهار/ گوهارك ژ گوه.

تێبینی:

د زارێن دیدا وەکی (- واره) د خوییێ کو نەدووره تێگەهێ نوو ب هزرا (تشتێن وەکی گوهی) ڤە گرێ بدەت، و پاشگر (- وار) بنەکۆك بت..

- ارا:

پتر پاشگرەك نڤیسارکیه، ئانکو د نڤیسارێن کلاسیکدا هاتییه، و بۆ جهی ل کاره. هەڤبەری Area بکه.

فۆرمێن تازه وەکی - ره، - ەره، - ێره، - رێ .. پتر ل کارن. بنێره پەیڤێن ل خوارێ:

ئێره = ئەڤ دره (ئی - ارا).

ڤێرێ/ ڤر = ئەڤێ دەرێ.

هەره - هەڤبەری Here بکه ب زمانێ ئینگلیزی.

وێرێ - ئەوێ دەرێ.

وێ را هه؟ (ئارا؛ درا).

- ازینك:

د پەیڤا دەرازینکدا دیار دبت کو هنبەری (- وازه) یه د دەروازەدا. لێ د زارێ کرمانجیدا ژ بلی ڤی فۆرمی، فۆرمێ دەریزانك ژی تێ گۆتن. د ڤان هەردوو پەیڤاندا دەر - دەری دیاره لێ پاشبەندێ وی هند ئاشکرا نینه. لەو هەکەر چو پەیڤێن بەرش نەهاتنه دیتن باشتره ئەم ڤی پاشبەندی ب تەرزەك دی هلشکێڤین، ئانکو ئەم ب بازڤه گرێ دەین و بێژین ژ فۆرمێ هزرکری (دەرڤازینەك) هاتییه سڤککرن.

دەر - ڤاز - ین - ەك

و دەریزانك دەنگ گهۆرینا وێیه.

- اسا/ سا:

ئەڤ ژی پتر فۆرمەك نڤیسارکییه، بۆ وەکاتیێ ل کاره، هەڤبەری As بکه د ئینگلیزیدا.

سەمەنسا (سەمەن + سا)　　وەسا (وە + سا).

دیسا (دی + سا)　　هۆسا (هۆ + سا).

- اسی/ اس:

ئێکە ژ پاشگرێن برا - مری د زمانێ کوردیدا و چەلەنگ کرنا وی دێ پشکدارییەك باش د ئاڤاکرنا ناڤێ مینەڤی و ناڤێ بکەریدا کەت. ئو ب کێماتی د دو پەیڤاندا (اسی) چۆیە سەر دروڤی و ناڤێ مینەڤی ژێ دروست بوویە، وەك:

کێم - کێماسی - (کێماس)؟

تەنگ - تەنگاسی - (تەنگاس)؟

تێبینی:

ب دیتنا من ئەڤ پاشگرە گرێ دایی پاشگر - اسا/ - سا یە کو مانا وەك دگەهینت و دەما (ی) یا ناڤێ مینەڤێ دروستکەر چۆیە سەر ئەڤ فۆرمە ژێ پەیدا بوویە. ئانکو ئەڤانە د کۆکا خوەدا کێم و تەنگ - ئاسا بووینە دگەل - ی. ژ بەر ڤێ ئێکێ مرۆڤ دکارت باسێ فۆرمێ خۆمالیێ ڤی پاشگری بکەت. ژ ئالیەك دیڤە پەیڤا کوردی (واسی) ب مانا وەك هەر گرێ دایی ڤی پاشگریە.

- اڤ:

ب مانا ئاڤ ل کارە و جاران ناڤێ بکەری دروست دکەت، لێ ل هەردوو کاودانان هەمان مانا و دەنگ ناهێنە پاراستن. هەروەسا وەکو پارچەیەك ژ پەیڤا لێکدای تێ پێش و دبت وەکو پێشگر ژی ل کار بت.

بۆ نمۆنە: ئەز چۆمە بەر ئاڤێ/ ئەز چۆمە بەراڤێ. هەکەر چی ژ هەمان ئەلەمێنتان پێك دهێن لێ ژێك جودانە ژی، ل یا ئێکێ ئاڤەك هەیە ئەز پێ چۆیمە بەر (رەخ، تەنشت، ل نك..)، ل یا دووێ ئەزێ چۆیمە جهەکی ناڤێ وی بەراڤە چونکی ئەو جهەیێ ل رەخ ئاڤەکێ.

ژ ئالیێ دیڤە پەیڤەك وەکی تەنگاڤ کو ژ تەنگ و ئاڤ پێك دهێت ژ بیاڤا خوە دەرکەڤتیە و ناڤێ بکەری دروست کرییە. و دۆلاڤ ناڤێ ئامیرەکی دروست کرییە و سەرداڤ ناڤێ جهییە.

چراڤ ئاڤەماست.

شێلاڤ ئاڤدەو.

بەراڤ ئاڤشلۆق.

شلقاڤ

خوێراڤ (خویَ - ر - اڤ)

تەنگاڤ وەکی تەنگاس بۆ کەسیَ د تەنگاڤیێدا ل کارە.

دۆلاڤ

(بنداڤ) ب مانا بنبیڤ ل کارە. د بت ژ (بەند - اڤ) بت یان ژ کار تێکرنا فارسی پەیدا ببت چونکی گۆرەی کوردییا ئیرۆ پێدڤییە ب تەرزیَ ئاڤسار بایە (بنبیڤ جهەکیَ ئاڤسارە).

تێبینی:

د کوردیدا قەنداخ/ قەنداغ ل شوونا قەنداڤ ل کارە، هەلبەت ئەڤ پتر ئەللۆفۆنەکی چیَ دکەت ژ پاشگرەکی.

- اڤا/ - اوا:

ئێکە ژ پاشگرێن جهی د زمانیَ کوردیدا، وەکی پێشگریَ دێرین بیَ -/ با - ل کارە و پتر مانا گوند د گەهینت. تاکو نهۆ ئاڤا وەکو پەیڤ ب مانا (معمور، مبنی) ل کارە: مال ئاڤا هەڤبەری رەشاڤا بکە. هەروەسا د هندەك زارێن دییە کوردی و زمانیَ فارسیدا ب تەرزیَ ئاباد (- اباد) ل کارە وەکی مهاباد. چاوا بت، پتر د ناڤیَ گوندان‌دا ل کارە. وەك:

سماییلاڤا ژ سماییل.

هەسەناڤا ژ هەسەن.

شەکراڤا ژ شەکر.

- اك:

ئەڤ پاشگرە ژی د کرمانجییا ژۆریدا کێم ل کارە، لیّ د کرمانجییا ژێری و فارسیدا پتر چەلەنگە، وەك:

پیزپیزاك: ئەڤ پەیڤە د(الهدیة الحمیدیة في اللغة الكردیة) دا هاتییە، و دیارە ژ دووبارەكرنا پیز و پاشگر - اك هاتییە.

جڤاك؛ - اك چۆیە سەر رەگێ (جڤ) و ناڤێ كۆمێ ئاڤاكرییە.

تۆتاك هەر تۆتییە، بێ ئەرگ مایە.

- اكە:

ئەڤ پاشگرە كێم ل كارە، و د پەیڤا فڕاكەدا بۆ جهێ بلندێ بیاڤێ فڕینێ لێ هەبت، وەكی كەڤری، ل كارە.

و ئەڤە نێزیكی پاشگر - كەدە دكەت.

فراكە ژ فڕ (فڕین).

- ال/ ەل:

ئەڤ پاشگرە د زمانێن ئەوروپیدا گەلەك چەلەنگە، لێ د زمانێ كوردیدا پتر وەكو بەرماییك مایە، و دەما دچتە سەر ناڤەكی ب ئێك ژ ڤان دەوران رادبت: دروست كرنا ناڤەك دی ل سەر بنەمایێ وەكهەڤیێ و ئەڤە پڕ نێزیكی بال ڤە دانێیە كو رۆلێ دێرینێ ڤی پاشگرییە، یان ژی بێ رۆل: ئانكو گهۆڕینەك بەرچاڤ ناكەت، رەنگە مەزنیێ دگەل ناڤێ نوو پەیدا دكەت، وەك:

چەنگال ژ چەنگ (دەست) + ال.

كەندال ژ كەند + ال.

كۆدەل ژ كۆد/ كۆدە + ەل (ال).

شەمالك ژ شەما + ال (+ ك).

**- ام یا ناڤبەند:**

وەكو: بەرامبەر.

ئەڤ ژی بەهرا پتر ئەلۆفۆنەك (- ان) ە، كو جاران تەرزێ هەم/ هن ژی وەردگرت، وەك: بەرهمبەر، بەرهنبەر.

- ان:

و ـ یان ل پاش ڤاولان

وەکو پاشگرەك ڕێزمانکی ئالاڤێ کۆمێیـە و بـۆ بالڤـەدانێ ژی ل کـارە، دچتـە سـەر ناڤان و جیناڤان.. و نەدوورە ئەڤ دەورە بەر ب نەمانێیە لێ هێشتا مایە (بەهرا پتر بـێ ـ ن ـ ل کارە)، وەك:

ئەڤان ژ ئەڤ.

ئەوان ژ ئەو.

ئەلی جانگیران هاجییان.

نۆمەران.

جەنگان لاوان.

کەردیکلان.

ـ ان یا لێکدای:

ژ (ا) یا کاردروستکەر و (ن) ا کۆمێ پێك هاتییـە، و نـاڤێ کـاری دروسـت دکـەت، وەك:

هێلان گەڕان.

شێلان.

ـ ان یا ناڤان ژ ڕەگی، ژ ناڤێن دی دروست دکەت، وەك:

دێمان ژ دێم: کو ڕەنگە زێدەگاڤیێ ددەتە پەیڤی.

جانان د هەلبەستێن کلاسیکدا هاتییە بۆ هەمان مەرەمێ.

گولان ناڤێ مەهەکا کوردییە ژ گول هاتییە دارشتن.

باران ژ بار کو ڕەگێ بارینە هاتییە دارشتن.

ـ ان یا ناڤێ جهی ژ ناڤان دروست دکەت، وەك:

بەهدینان ژ بەهدین.

شێخان ژ شێخ.

شەمدینان ژ شەمدین.

جیهان/ جهان ژ جه.

harwonan (ناڤێ گوندەکیە) ژ هاروون.

**تێبینی:**

نەدوورە ئەڤ رۆلە د کۆکا خوەدا ژ نیشانا کۆمێ هاتبتە وەرگرتن.

**ـ ان یا ناڤبەند:**

ئەڤە وەکی ـ ام ژی ل کارە، بەهرا پتر ناڤبەرا دووبارەکرنا پەیڤێ دگرت، وەك:

بەرانبەر ژ بەر

سەرانسەر ژ سەر

دەراندەر ژ دەر

**ـ انە:**

ب مانا (وەك)، یان ب هەمان ئاوا و تەرزێ ناڤێ چۆیە سەر، کو بەهرا پتر درۆڤی دروست دکەت. ژ ئالیێ ئەتیمۆلۆجیڤە نەدوورە هەڤبەندی دگەل ئانن/ ئینان هەبت. وەك:

مەردانە ژ مەرد ب مانا دەستڤەکری.

شێرانە ژ شێر.

سۆفیانە ژ سۆفی.

سەرانە ژ سەر ئانکو باجا هەر بوونەوەرێ سەر پێڤە (ساخ). (نەدوورە ژ سەر + ئانە کو تەرزەك پارەیێ هندستانییە هات بت).

جەنگەنە: کەسێ شووم و جەنگخوازە، وا دیارە ـ ەنە ئەللۆفۆنەك ـ انە یە.

**ـ انچ (ـ اچ):**

هەردو د پەیڤا قولاچ؛ قولانجدا دهێنە دیتن کو ژ قول ب مانایا کون هاتینە دارشتن.

قول (کون) ـ قولاچ ـ قولانچ.

**ـ اند:**

ئەڤە پاشگرەك رێزمانكییە، دچتە سەر رەگێ كارێ نەدەرباز (تێنەپەڕ) و دكەتە كارێ دەرباز (تێپەڕ)، هەروەسا دچتە سەر رەگێ دەرباز و دەربازی بكەرێ دو دكەت، لێ دگەل پەیڤێن دەنگی كارێ نەدەرباز ئاڤا دكەت، وەك:

كەلاند ژ كەل - كەلین.

فڕاند ژ فڕ - فڕین.

لووراند ژ لوورلوور.

زڕاند ژ زڕزڕ.

مێهتن (مێژتن) - مێژاندن.

- انش:

وا دیارە پاشگرەك دێرینێ جهی بوویە، چونكی د ناڤێ هندەك گوندان‌دا مایە، وەك:

تروانش. ئالانش.

شەرانش. پنیانش.

كنیانش.

- انی:

پتر دچتە سەر ناڤان و مانایێن تازە ددەتێ، وەك:

مێرانی ژ مێر: ناڤێ مانایی ئاڤاكرییە.

شێر - شێرانی.

باب - بابانی.

خال - خالانی: د كۆكا خوەدا ئەڤ ژی باڤەدانە لێ ل ڤر ناڤەك دی (ناڤێ تشتی) ئاڤاكرییە.

دەشتانی وەكی دەشتاهی ل كارە.

دهۆكیانی ژ دهۆكی: بۆ باڤە دانێ هاتییە، لێ ئاوایێ رەفتار و ژیانێ خویا دكە، ئانكو پتر مانا (وەك) ددەت. كۆلیانی ژ كۆلێ هاتیە دارشتن، تەرزەك دیلانێیە خەلكێ

گوندێ کۆلی پێ ناڤدارن.

جاران وەکو - کانی ژی ل کارە، وەکی ئامێدیکانی.

- انیٚ:

پتر وەکو پاشگرێ یاریێ ل کارە، وەك:

هۆل - هۆلانیٚ. بڕ - بڕکانیٚ.

چووك (چوونگ) - چووکانیٚ. دام - دامانیٚ.

**- اهی/ ەهی/ ایی:**

هەکەر چی سیمایێ ڤی پاشگری سادەتیێ نیشان ددەت، لیٚ هزرا من پتر بۆ هندێ دچت کو ئەڤ پاشگرە لێکدای بت، ئانکو ژ (اه/ ا) یا بکەر دروستکەر و (ی) یا ناڤێ مینەڤی دروستکەر پێك هات بت، لیٚ مخابن کوردی چو دەور بۆ (اه/ ا) نەهێلایە.

ئەڤ پاشگرە دچتە سەر رەگان، نیران، دروڤان.. وەك:

بین - بیناهی. شین - شیناهی.

رۆن - رۆناهی. (دوم) - دوماهی.

بەر - بەراهی. بلند - بلنداهی.

پێش - پێشەهی. کۆر - کۆرەهی.

بەر - بەرەهی.

- اوەر:

بەهرا پتر ئەڤی پاشگری تێکەلی دگەل هەبوونا دروڤ و شیانان یان وەکاتیێ هەیە، و چونکی هندەك نیشانێن ئینان و وەرگرتنیٚ تێدا هەنە، لەو مروڤ هزر دکەت کو ژ ئاوردن - ئینان پەیدا بوویە. ژ ئالیەك دیڤە ئەڤی پاشگری تێکەلی دگەل کۆمەکا دیپا پاشگران (هەڤدەنگ و هەڤمانا) هەیە، وەك - وەر، - ەوار، - وار، - وەرە.. ژ نمۆنەیێن ئەڤ پاشگرە تێدا:

جەنگاوەر ژ جەنگ.

مزاوەر (مزاور) ژ مز ب مانا کریٚ، باج..

جناوەر ژ (جان ـ ئەجن).

* گناوەر ژی هەیە کو جودا دەنگێ جناوەرە، کو دوور نینە دێرینتر و پتر نێزیکی ژێدەرێ توخم بت، ئەو ژی پەیڤا ئاگنییە (ئاگر)، کو د هەمی چیڤانۆکێن جهانیدا ئەجن و جان ژ تەرزەك ئاگرینە.

**- ە -**

ـ ە:

ئەڤ پاشگرە ئێکە ژ پاشگرێن فرەکار د زمانێ کوردیدا، و نەدوورە هند ب سانەهی نەبت، ب دروستی، هەمی رۆلێن وی بهێنە دەستنیشانکرن.. لێ گۆرەی شیپانێ دێ هندەکان دەستنیشان کەم.

ژ رەگی، نەخاسمە یێ دەرباز، دروڤێ بکەری ئاڤا دکەت، وەك:

بژارتن ـ بژارە.

خوارن ـ خوەرە (خوەرا).

کرن ـ کەرە.

دوور نینە ئەڤ (ە) یە ژ (ا) یا پاشگر سڤك ببت، ئەڤە ژ ئالییەکیڤە، ژ ئالییێ دیڤە هەردوو پەیڤین داوییێ (خوەرە و کەرە) هەو د ئاخڤتنێدا ب کار دهێن و د گۆتنەك مەزناندا (کەرەوۆ خوەرەوۆ، نەکەرۆ دلکەسەرۆ) دهێنە دیتن، و جار ـ جار خوەرە و خوەرا دهێنە بهیستن.

ناڤێ کاری و ناڤێ تشتی ژ رەگان، وەك:

گێران ـ گێرە.

پێچان ـ پێچە.

ناڤ ژ کاری، وەك:

کەلشت ـ کەلشتە.

ناڤان ژ ناڤان، کو وەکاتی تێدا بت، وەك:

شیر ـ شیرە.

چل - چله.

پاشبەندێ پـەیڤ ئاڤاکەر، ئـانکو پاشـبەندێ ب رۆلێ پەیڤپێکڤـەئانێ رادبـت.. دوو پەیڤان پێکڤە گرێ ددەت و ئێکا نوو ژێ ئاڤادکەت، یان دوبارەکرنێ، نەخاسمە پـەیڤێن دەنگی، دکەتە ناڤێ رەوشەکێ یان ناڤێ دەنگی، وەك:

ئاخ و لێڤ - ئاخلێڤە.

گەل(گەلا؛ بەلگ) - گەلگەلە.

حەپ - حەپحەپە.

تڕ - تڕتڕە.

- ە -

د رۆلێ ناڤبەندییێدا چەند کارێن جودا نیشان ددەت، وەك:

ناڤەك تازە ژ دوو ناڤان ئاڤا دکەت، پتر جهێ (ا؛ ی) یێن بالڤەدانێ دگرت، وەك:

ژەهرا ماری - ژەهرەمار

شوونا واری - شوونەوار

ناڤێ لێکدای ژ دروڤی و ناڤی ئاڤا دکەت، وەك:

شەنگەژن. جوانەگا.

زرچەدین. پیرەمێر.

پەیڤەکا دەنگی ژ دوبارەکرنا دەنگەکی ئاڤا دکەت، وەك:

هورمەهورم دنگەدنگ.

و د رێزمانێدا ب چەند ئەرگێن جودا جودا رادبت، وەك:

پاشبەندێ کارێ فەرمان و داخوازی:

بخوە بکە

بچەرینە هلوەرینە

پاشبەندێ جیناڤێ ئەو (کەسێ سێیێ تـەك) دگـەل دروڤـان و ناڤـان و کـارێ نـهۆ و پاشەرۆژێ د ژێرزارێ بۆتانیدا، وەك:

ئەو زیرەکە ئەو دۆتا حەمێ مووسێیە

ئەو دکە ئەو وێ بکەڤە خوارێ

بۆ پەژراندنا کاری و هەبوونێ:

تە گۆتە(گۆت) وی

بەهارا مە خوەشە.. هتد.

- ەر:

ژ پەیڤا کۆچەر دەرکەڤت کو نەدوورە ژ کۆچکەر سڤك ببت، چو پەیڤێن کوردەواری ب ڤی پاشگری ببەر چاڤ ناکەڤن، لەو ئەز پتر هزرا توخمێ ئنگلیزی بۆ ڤی پاشگری دکەم ژ توخمێ کوردی، لێ ئەڤە ژ بەهایێ وێ وەکو ئاڤاکەرێ دروڤێ بکەری کەم ناکەت. بۆ نمۆنە:

کۆچ - کۆچەر (کۆچ - کەر؟)

نڤیسین (نڤیس) - نڤیسەر

- ەڤا/ - ەوا:

پتر د زارێ ژێریدا پاشگر (- ەوا) ل کارە، و فۆرمەکێ وەکی (- ەڤا) د پەیڤا (خوەندەڤا) دا دهێتە بەرچاڤ، لێ هند مسۆگەر نینە هەمان پاشگر بت. بۆ نمۆنە:

پێش - پێشەوا

نان - نانەوا

خواندن (خوان) - خوەندەڤا؟

- ەڤی:

بنێرە - ڤی

- ەك:

ئەڤ پاشگرە ب رۆلێ ئاڤاکرنا دروڤێ بکەری رادبت، و بەهرا پتر رەنگە پێڤەنانێ و زێدەبێژییێ تێدایە، و جاران ناڤێ ئامیرەتی، وەکو تەرزەك بکەری، ئاڤا دکەت. هەژییە بێژم کو هەمان پاشگر، ب هەمان ئەرگان د زمانێ فارسیژیدا هەیە.

ل وەختێ خوە ـ وا دیارە ـ دچۆ سەر ناڤان ژی، وەکی: مووسەك، بابەك، ..
هەروەسا د پەهلەڤیدا گەلەك ل کار بوویە، نەخاسمە ل داوییا ناڤان.

ژ رەگی بکەری ئاڤا دکەت، وەك:

کوشتن ـ کوژ ـ کوژەك

ژ کاری فۆرمێ زێدەبێژییێ (صیغة المبالغة) ئاڤا دکەت، وەك:

خواستن ـ خواستەك

ناڤێ ئامیرەتی، وەکو بکەر، ژ رەگی، وەك:

کوتان ـ کوت ـ کوتەك

درۆڤێ بکەری ژ ناڤ و درۆڤان .. وەك:

زرت ـ زرتەك پارس (خواستن) ـ پارسەك (خوازۆك).

رەش ـ رەشەك کەل ـ کەلەك.

چل ـ چلەك.

ژ پەیڤێن دەنگی ناڤان و درۆڤێ بکەری ئاڤا دکەت:

تر ـ ترەك (ترۆ)

فس ـ فست ـ فستەك (جانەوەرەکە)

ـ ەل:

ئێکە ژ جودا ـ دەنگێن پاشگرێ دێرین (ـ ال)، وەك:

کۆد ـ کۆدەل

ـ ەلانك:

هەکەر چی ئەڤ مۆرفێمە وەکو پاشگر دهێتە پێش لێ دوورنینە بەرماییکا ئالاندن بت، ئانکو ئەڤ پەیڤە ژ (دووڤ ـ ئالان؟ ـ ك) هاتبتە دروست کرن، وەك:

دووڤ (دویڤ: دوو) ـ دووڤەلانك

ـ ەلە:

بۆ بچووککرنێ هاتییە، وەك:

پووچ - پووچەلە

- ەلۆ:

ئەڤ پاشگرێ دەگمەن دهێتە دیتن، ناڤێ بەرکاری ژ ناڤی ئاڤا دکەت، ب کەمانی د پەیڤا خوینەلۆدا مانا ئەوێ/ ئەوا خوین پێڤە ددەت. دوورنینە ئەڤە ژی ژ ئێکگرتنا دو پاشگران پەیدا ببت، ئانکو ژ پاشگر (- ەل) و (- ۆک) هاتبتە دارشتن، وەک:

خوین - خوینەلۆ

پیس - پیسەلۆ؟

عەیب - عەیبەلۆ

- ەلۆک:

نەدوورە ژ هەمان پاشگرێ ل سەلال و پاشگرێ بچووککرنی (- ۆک) پێکهاتبت، وەک:

چووچك/ چویچك - چووچێ/ چویچێ - چیچەلۆك

- ەن:

د چەند پەیڤاندا دیار دبت، لێ بێی خوە گەلەك ئاشکرا بکەت. بۆ نمۆنە؛

د پەیڤا چیمەندا، هەکەر ژ چیم هاتبت، وەکو پاشگرێ جهی خوە دیار دکەت.

و دیمەن؛ هەکەر ژ دێم هاتبت دێ هەمان رۆلێ ل سەلال گێرت، لێ هەکەر تێکەلی دگەل (دی) یا دیتن؛ دیار .. هەبت، هینگێ پاشگر دێ (- مەن) بت ل شوونا (- ەن).

د پەیڤا رەوشەندا کو ژ (رۆژ > رەوش - ەن) پێکهاتییە، رۆلەك دییێ جودا دبینت، کو مرۆڤ هزرا ژێدەرەکێ دی بۆ بکەت، ئەو ژی، نەدوورە، ژ (- ان یان - ین یان - ن) پەیدا ببت.

- ەنە:

هندەك جاران وەکی تەرزەك پاشگر (- انە) دهێتە بەرچاڤ، و جاران تایبەتمەندییەکێ ددەتە خوە، وەك:

جەنگ - جەنگەنە

شکەستن (شکێ) ـ شکەنەشکەنە

ـ ەنگ:

پاشگرەکە درۆڤێ بکەری و ناڤان ئاڤا دکەت، وەك:

پێش ـ پێشەنگ چەل ـ چەلەنگ

تفك (تفتا فارسی) ـ تفەنگ دوو؛ دووڤ ـ دوونگ

و جاران رۆلەك هند ئاشکرا نەمایە، وەك:

پەل ـ پەرەنگ خوەه ـ خوشك ـ خوەیینگ

مەه ـ مانگ (مەه ـ نگ؛ ما ـ نگ)

ـ ەوار:

ئەڤ پاشگرە وەکو تێگەه و توخم گرێدایی پاشگر (ـ وەر) ە، کو رەنگە وەکاتییەکێ ددەتە ناڤێ نوو هاتییە دارشتن. بەهرا پتر دچتە سەر ناڤان و وەکی هاتییە گۆتن، ناڤەك دی ئاڤا دکەت، وەك:

(بەن) ـ بەنی ـ بەند ـ بەندی ـ بەندەوار

(خوان) ـ خواندن؛ خوندن ـ خوەندەوار

ل سەر هەمان کێشێ پەیڤا کوردەواری د زمانێ مەدا پەیدا بوویە، و وەکو پاشڤە ئاڤاکرن ئەم دکارین کوردەوار ژی وەرگرین بۆ هەر کەسێ وەکی کەسێ کورد بت.

گیانەوەر ژ گیان و بەختەوەر ژ (بەخت ـ ەوەر) پێکهاتییە، فۆرمەك دییێ ڤی پاشگرییە.

* پێدڤییە ئەم پەیڤا شوونەوار کو ژ (شوون ـ ە ـ وار) پێکهاتییە، تێکەلی ڤی پاشگری نەکەین، ئانکو (ەوار) د پەیڤا شوونەواردا ژ ناڤبەند (ە) و پەیڤا (وار) ب مانا جە پێکهاتییە.

ـ ەهی:

تەرزەکە ژ پاشگر (ـ اهی، ـ ایی) و ب هەمان رۆلێ رادبت، وەك:

(بین؛ رەگێ دیتنێ) ـ بینەهی پێش ـ پێشەهی

رۆهن (رۆن) - رۆنەهی بیر (هزروبیر) - بیرەهی

- ب -

- ب:

نەدووره دۆزا ڤی مۆرفێمی د کوردیدا ژ دۆزێن ئالۆز بت، نــەکو ئــەوه ئــەرکێن ڤــی مۆرفێمی نه ئاشکرانه، بەلکو ژ بەر پرپیشەییا وی و وارێن لێ کار دکەت. بۆ نمۆنه وەکـو پێشگر دچته سەر ناڤان و مانـا خـودان یـان ئـەوێ وی تشـتی ددێـرت (دروڤـێ بکـەری) ددەت، وەك:

ب خانی ~ ئەوێ خانی هەبت

ب مێر ~ ئەو ژنکا مێر هەبت

ب ژن ~ ئەو زەلامێ ژن هەبت.

ب ترمبێل ~ ئەوا/ ئەوێ ترمبێل هەبت .. هتد.

و دچته سەر رەگێ کاری و دروڤێ بکەری (الصفة الفاعلیة) دروست دکەت، وەك:

بڤر ژ برین

بکر ژ کرین

برۆت ژ سۆتن

هەروەسا وەکو ناڤبەند ژی رۆلێ خوه دگێرت، وەك:

کار ب دەست

سەر ب خوه

چاڤ ب خال .. هتد

هەلبەت هەمی پێربەست ڤی رۆلی ددێرن، ئانکو نه ب تنێ (ب) ب ڤی رۆلی رادبت.

بۆ نمۆنه: ل، ژ، د.. ژی هەمان دەوری دگێرن، وەك:

چاڤ ل دەر

چاڤ د خەو

پێ ژ دار

ب ـ دگەل ناڤێ مینەڤی دەستوداری و رەوشێ دیار دکەت، بۆ نمۆنە، د ڤێ هەڤۆکێدا:

ب کوردی خواند

ئاشکرایە مۆرفێمێ (ب) رەنگە سەربخوەیی هەیە، و دیار دکەت کو ئالاڤ و ناڤگینێ خواندنێ کوردییە، ئانکو ب پێربەستە، لێ د هەڤۆکەک دیدا وەکی:

ب جوانی خواند.

ل ڤر ب جوانی پێکڤە، دبت، جهێ درۆڤی (صفة) بگرت، چونکی ل شوونا ب جوانی ئەم دکارن باش، جوان، خراب.. دانین.

ب ـ ڤە/ پێڤە:

د زمانێ کوردیدا پێکهاتەیەک ژ پێربەست و پاشبەندێن وان هەنە کو باشە ناڤێ دۆرمانگر لێ بکەین، پێکڤە جهێ ناڤێ بکەری دگرن، و هندی هند ل کارن تایبەتمەندییەکێ ددەنە زمانێ مە، وەک:

ب ـ ناڤ، جیناڤ .. ـ ڤە ~ پێڤە

ب ـ ناڤ، جیناڤ .. ـ دا/ دە ~ پێدا/ پێدە

ب ـ ناڤ، جیناڤ .. ـ را ~ پێرا/ پێرە

و هەمان دەستوور بۆ پێربەستێن دی (ژ، د، ڤ، ل) ژی دروستە، وەک:

د: تێڤە/ تێرا/ تێدا

ل: لێڤە

ژ: ژێڤە/ ژێرا

ڤ (جودا دەنگێ ب): ڤێرا .. هتد.

ب ـ وەکو پێشگرەک رێزمانکی رۆلەک گرنگ د زمانێ کوردیدا هەیە، وەک:

دگەل کارێ فەرمانی و داخوازی:

بفرە بفرینە

بکە غار وەرە

دگەل کاریٚ مەرجی و خوەزی:

هەکەر بکرا/ کربایە/ بکەت

خوەزی بهاتا/ هاتبایە/ بهێت .. هتد.

- با/ بیٚ - :

ژ بلی هاتنا پەیڤا با (هواء) Air د گەلەك پەیڤێن لێکدایدا، وەکی: باروٚڤە، باکوزیرك، بادەڤ، باگەر، باخوٚرە، بازڤیرك، هورەبا، رەشەبا .. ل کارە. لیٚ شاخەك وێ ل پێشییا ناڤێن گوندان گەلەك ل کارە، و پشتی لدوو چوٚنیٚ دیار بوو کو ئەو پەیڤەك دێرین و براجیهانییە، ئانکو د زمانێن سامی و هند - ئوٚرووٚپی هەردوواندا دخوییٚ.

کەڤنترین فوٚرمیٚ نڤیسی د نڤیسارێن بزماریدا ب تەرزیٚ مات ئیٚ دیتن و پاشی د کەڤنە زمانێن ئیٚرانیدا ب تەرزیٚ: ڤات Vath، ڤێت Vith، ڤاه، ڤێه، بیٚ.. هاتییە، و د کوردیدا فوٚرمێن با - و بیٚ - د ناڤێن گونداندا ماینە و دبتە هەڤگوریٚ - اڤا. وەك:

باتێلیٚ باخورنیفیٚ بامەرنیٚ

بێبادیٚ بێداریٚ بێدوهیٚ

- بار:

ئەڤ پاشگرە فرە - توخمە ئانکو کوٚمەکا ژێدەران هەیە و بەهرا پتر دچتە سەر ناڤان و ئێکە دی ژیٚ ئاڤا دکەت. هەڤبەندی بارە یان ژی بەهر، و هندەك جاران ڤەرێژا سڤکبوونا بوارە ژ بوٚرین، وەکی، رێبوار > رێبار یان ژی هەڤبەندی بەرە یان رەگیٚ بارینە. و جارێن دی، بیٚ ئەرگ، خوە دیار دکەت.

روٚبار

جوٚبار ژ روٚ و جوٚ دگەل (بار) ەك ئەرگ شێلی.

سەربار

بنبار ژ بن و سەر دگەل بار ب مانا تشتیٚ دهێتە بارکرن.

شەکەربار ژ بارین.

رێبار ژ بوار ~ بوارتن/ بوٚرین.

رووبار: نەدووره هەڤبەندی دگەل رووبەر هەبت، نەخاسمە هەردو بۆ دێم و پێشیيا تشتی ل کارن و ئەڤە جوان د پەيڤا لێکدای (رەنگ و رووبار) دا خويا دبت، و تشتێ هەژی گۆتنێ ئەوە کو ئەڤی - باری ئەرکەك جودا نەمايە.

- باز:

هەکەر ئەم هندەك زارێن ژێرييا زمانێ کوردی و زمانێ فارسی ل بەر چاڤ بگرين - باز دێ رەگێ کاری هێتە خواندن، لێ ب گشتی دەربازی پاشگریێ بوويە، دچتە سەر ناڤان.. و رۆلەك باش د ئاڤاکرنا ناڤێ بکەريدا دگێرت، وەك:

جانباز فيلباز

چەنەباز دەرباز

باش - :

ئەڤە ب تەرزێ پێشگر و پاشگر د زمانێ کورديدا تێ ديتن. وا دياره ئەڤ پێشگره پتر ژ زمانێ تورکی دەربازی زمانێ مه بوويه و ب مانا سەر يان مەزن دچتە سەر ناڤان. و وەکو پاشگر هند رۆهن نينه کانێ پاشگره يان ژی پەيڤا باشه، وەك:

شاباش

باشبازرگان

- بان :

پتر تەرزەك فارسيێ پاشگرێ کوردی (- ڤان/ وان) ە، لێ جار - جار د زمانێ کوردی ژيدا د خويێ، وەکی:

ميهرەبان

- باهی/ بايی:

خوه وەکی پاشگر ديار دکەت لێ ب ديتنا من ژ (پيرۆز به) دگەل پاشگر - اهی يان - ايی يان - ەهی هاتيه دارشتن و گۆگراندن. و هەکەر ئەڤە راست بت دەرگەهەك جودا ل بەر دارێشتنێ د زمانێ کورديدا ڤەدبت.

پيرۆز - پيرۆزباهی (پيرۆز - به - اهی) پيرۆزبايی

- بە:

دوورنینە ب سانەهی نەبت مرۆڤ بریارا پاشگرییا ڤی مۆرفێمی بدەت نەخاسمە کەم ل کارە و رۆلێ وی هند دیارنینە، ژ بلی هەکەر مانا پێڤەنان و مەزنییێ ل پەیڤان زێدە بکەت.. وەك:

زۆر بە (ظوربة/ د فەرهەنگا الهدیة الحمیدیة في اللغة الكردیة) دا هاتیە و مانا (المجبر المكره) بۆ هاتیە دانان، ئانکو بەرکارێ زۆرە (بەرەڤاژی زۆردار). هەلبەت ئەڤ زۆربەیە ژ یا کرمانجییا ژێری ب مانا پرانی یان بەهرا پتر جودایە.

تۆربە: د کوردیدا تۆربە، توورەك مەزنە. ئەڤجا - بە تێگەهێ مەزن هلگرتیە.

- بەد:

د کرمانجیا ژێری و فارسیدا ئەڤە وەکو پەیڤ ل کارە لێ د کرمانجییا ژۆریدا ئەڤ پەیڤە جودا و سەربخوە - هند - ل کار نەمایە، هەکەرچی خودانێ (الهدیة الحمیدیة في اللغة الكردیة) مانا (القبیح من كل شيء) ددەتێ. لێ د ئەدەبیدا، نەخاسمە، یێ کلاسیك، پتر ل کارە و ب مانا خراب، دچتە سەر ناڤان، چاوا بت ئەڤە دگەل زر- ئالیەکی ژ فەرهەنگا کوردی دێ تەژی کەت، وەك:

بەدناڤ        بەدکار

- بەر- :

بەر وەکو پەیڤ د فەرهەنگا کوردیدا ژ سێ- چار ژێدەرێن جودا وەرار کرییە و ئەڤە رەنگە نەرماتییەکێ ددەتە ئەرکێن وێ. بەهرا پتر دچتە سەر ناڤان و ناڤ یان دروڤ ژێ پەیدا دبن، وەك:

بەرمال (ی)    بەردل

د ڤان هەردو پەیڤاندا مانا ئەوی/ ئەوا ل بەر ل پەیڤێن سەرەکە زێدە دبت.

بەردیوار        بەراڤ

ل ڤر بەر- ب مانا رەخ و تەنشت دهێت.

بەرهۆز        بەرپرس

بەرئاقل        بەرگونەه

د ڤی رۆلیدا (بەر ـ) تا رادەیەکێ جهێ پاشگرێ ئنگلیزی able ـ دگرت. و ئەڤ دەورە دبت ببتە کانییەکا پەیڤان و بێ دوماهی پەیف پێ بهێنە دارشتن.

پێغەمبەر        رێنجبەر

دلبەر

ئەڤ پاشگرە رەگێ کارێ دەرباز (برن) ە و هندەك جاران خوە نێزیکی مانا هاتە بەر/ کرە بەر وەکی جلك کرنە بەر خوە دیار دبت.

بەرکەڤتی: وەکی سەرکەڤتی، بنکەڤتی.. ژ (ب بەر) سڤك بوویە.

بەردان: ب دیتنا من ژ (سەر بەردان) سڤك بوویە چونکی ب ڤی فۆرمێ نهۆ ل کار پێدڤی بو پتر مانا بەرهەم دان یان بەر گرتن بدەت.

بەرپێك

بەردەستك

- بەست:

وا دیارە رەگێ بەستنە ب مانا گرێدان کو ئەو ژی نەدوورە گرێدایی بەن؛ بەند بت. لێ تشتێ وە ل من کری کو نەدانمە دگەل رەگێن کارێ دەرباز ل دوماهییا بابەتی ئەوە پەیڤا بەستن بخوە جهێ خوە دایە گرێدان و گەلەك کەم ل کارە. بۆ ڤێ پەیڤێ دو نمۆنێن بەلاڤ هەنە:

داربەست: ژ دار و بەست.

سەربەست: ژ سەر و بەست کو وا دیارە د جڤاکا کوردییا دێرینـدا دەمێ مرۆڤی ئازادییا خوە ژ دەست ددا سەرکۆل دکرن.. و سەرکۆل ب خوە ژی پەسارەکە بۆ ڤێ بۆچۆنێ کو ژ سەر و کۆلە پێکهاتییە.

- بەن:

ئەڤ ژی فۆرمەکی کەم ل کارێ بەندە، و نەدوورە کەڤنترین فۆرم بت، د ڤان

پەیڤاندا خوە دیار دکەت:

مل ـ ملبەن

سەر ـ سەربەن

ـ بەند:

ئێکە ژ پاشگرێن چەلەنگ د زمانێ کوردیدا و ب چەند فۆرمێن جودا ل کارە، وەك: ـ بێن/ ـ بەن.. هەروەسا ـ وەند/ ـ ڤەند ژی هەڤتوخم و هەڤبەندن. بارا پتر دچتە سەر ناڤان و ناڤێ بکەری یان پیشەکاری، ناڤێ پێکهاتەیا داویێ یان ناڤێ تشتێ ژ لێکدانێ پەیدا بووی.. ئاڤا دکەت، وەك:

سۆلبەند ژ سۆل (نال/ پێلاڤ)

نالبەند ژ نال

سێهرەبەند ژ سێهرە

سیابەند وا دیارە ژ سیاه ~ سیه ~ سی (رەش) و بەند پێك هاتیە، ل ڤر بەند هند رۆهن نینە کانێ ب مانا دەستەك هاتیە یان ژی ب مانا گرێدان.

تەختەبەند ژ تەختە ب مانا دەپ و بەند هاتیە کو پێکڤە دبتە ئەو تشتێ ژ لێك بەستنا ڤان تەختەیان پەیدا دبت.

سەلبەند (رصیف) ژ سەنگ ب مانا کەڤر/ بەر.

چەکبەند (جلکەکێ بەرێ بوو)

برا ـ :

نەدوورە ئەڤ پەیڤە وەکو پێشگر ب مانا وەکی ـ semi یان نێزیکی درۆڤێن پەیڤا دچتە سەر، بکار بهێت، وەکی:

برانەزان

براکەر

ـ بن:

ناڤێ پارچەیا ژێرییە ژ هەر تشتەکی، د مۆرفۆلۆجیا زمانێ کوردیدا خوە ب گەلەك

ئاوایان دده خویاکرن، لیٚ ل هەمی بکارهاتنان ب رۆلەك جودا رادبت، بۆ نمۆنە دگەل ناڤبەندیٚ (ە) و مال بنەمال ئاڤا دکەت کو زاراڤەك جودایە ژ هەردو پەیڤێن پێك ئینای، ئانکو بنەمال نە بنیٚ مالێیە، و بنبیڤ ژی نە بنیٚ ئەردی (بیڤ) یە. و باشترین فۆرمیٚ ژێکجوداکەر (بن ـ دنیا) و (بنیٚ دنیاییٚ) نە.

بنبیڤ: ئۆدەیا ل بن ئەردە ژ خانی.

بنبێدەر: هەر تشتیٚ بمینتە ل شوونا بێدەریٚ.

بنتا: بەرەڤاژی سەرتایە، کو دبتە پارچەیا بنی ژ تاییٚ داری.

بنەمال: زاراڤەك جڤاکییە، بۆ کۆمەکا خێزانان تیٚ گۆتن کو د کۆکا خوەدا ژ مالەکیٚ بن، وەکی بنەمالا بەدرخان بەگیٚ.

بنکەڤتی: ئەڤە ژ بین کەڤتی سڤك بوویە.

بندار: بنەکۆکا ڤیٚ پەیڤی هند رۆهن نینە، لیٚ دوورنینە ژ (بەند ـ ار) هاتبتە دارشتن.

بنڤەرەنك (بن ـ ڤە ـ رەن ـ ك).

بنگەلتە (بن ـ گەلتە).

ـ بوون:

ئەڤ پەیڤە ژ بلی کو کارەکیٚ سادەیە، ل هەمان وەخت کارەك هاریکارە و وەکو پاشگرەك کار ـ دروستکەر، گەلەك د زمانیٚ کوردیدا چەلەنگە. ژ درۆڤان.. کاریٚ نەدەرباز (تێنەپەر) ئاڤا دکەت، وەك:

کولبوون سۆربوون

ئازادبوون هشکبوون

ـ بیڤ ـ :

ئەڤە ژی وەکو پاشگر و پێشگر ب مانا ئەرد ل کارە، بێگومان وەکی هەمی پاشگر و پێشگرێن دی ئەڤە پەیڤەك سەربخوە بوویە، لیٚ دگەل دەمی بیاڤا وی بەرتەنگ بوویە.. و تاکو نهۆ د پەیڤێن وەکو بیڤکدا ل کارە. چاوا بت، ئەڤ پێشو پاشگرە بۆ زانستەك وەکی جیۆلۆجی دیٚ باش ل کار بت.

بیڤەلەرز

بنییڤ

بێ - :

هەلبەت بێ پتر وەکو ئامراز ل کارە، لێ ئەڤێ ئێکێ رێ ل بەر نەگرتییە کو وەکو پێشگر ژی رۆل د زمانێ کوردیدا ب مانا ئاڤاهی/ گوند ژی ل پێشییا ناڤێن گوندان تێ؛ بنێرە (با -). نموونە بۆ بێ:

بێمال بێحال بێقام

بێسەر بێچارە بێدین

بێدل بێوار ....

بێ - دل - ی (بێدلی)، بێ - سەر (بێسەری).. هتد.

- بێن:

تەرزەك وەرارا رەگێ بەندە و نەدوورە هەڤبەندی بەستن و بەنیشت و بێنا.. بت، و هەکەر ئەڤە راست بت، ئەڤ پاشگرە پتر دێ رەگێ کارێ بێنا بت ژ پاشگرەك جودا. ئەم دبێژین: ئەردی بێنایە ئانکو ئەردێ قەرسی، و تشتێ بۆ چۆنا مە ب هێز دئێخت ئەوە بێن د هەمیاندا ب مانا گرێدان هاتیە.

نموونێن ڤی پاشگری:

پێبێن (ئەو پارچە وەریسێ پێ پێ دهێتە گرێدان) ژ پێ و بێن هاتیە دارشتن.

دەربێن (پارچە بەندکێ دەرێ تووركییە) ژ دەر ب مانا دەریك و بێن دارشتیە.

شمبێنی ژ شمك (پێلاڤەکە) و - بێن و - ی پێك هاتیە.

- پ -

- پاش:

ئێکییا پاش و پێشێن دەمی و جهی د زمانێ کوردیدا، گەلەك جاران ئاریشا نەرۆهنییا تێگەهێ رێزمانکی پەیدا دکەت، نەخاسمە د ناڤبەرا (پاش/ پاشی) دا، و ئەڤێ ئێکێ وا لێ کرییە کو پاشییا جهی ب قەلەوکرنی ژ یا دەمی بهێتە جوداکرن. چاوا بت، -

پاش ل هەر دو ئاستان (جه و دەم) وەکی پێشگر دەور هەیە، وەك:

ا ـ ل ئاستێ جهی:

پاشمال پاشکەفتن

پاشڤەمان

ب ـ ل ئاستێ دەمی:

پاشەرۆژ (پاش ـ ە ـ رۆژ) Future (مُستقبَل)

پاشیڤ (پاش ـ شیڤ)

**پەر ـ :**

پەر ب مانا دەوروبەر یان رەخ.. پەیڤەك دێرینە د زمانێ کوردیدا، لێ ژ بلی فرێزێن وەکی:

- پەرێ گوندی.

- پەرێ مالان.

- ئەو پەری ئازادی نواند.. هتد. کار و چەلەنگییا خوە ژ دەست دایە، لەو ئەم د کارین وەکو پێشگر ب مانا تەنشت، رەخ، یان دەوروبەر یان دۆرماندۆر.. بێخینە کار د ئاخفتنێدا پەراڤ ب مانا بەراڤ، رەخێن ئاڤێ ل کارە، و ئەڤە هەڤبەندی پەیڤ ـ پێشگرا لاتینی ـ ئینگلیزی ـ Peri یە، وەکی: Periphery , Periorbit.. هتد.

**پەڤ ـ :** بنێرە پێك ـ، ڤێك ـ .

**ـ پێ:**

پێشگرەك لێکدایە ژ (ب ـ ێ/ جیناڤێ نەبەرنیاس بۆ کەسێ سێ)، ب تێگەهەکێ وەکی: ب ئەوی/ ئەوێ دهێتە بەرچاڤ، دچتە سەر رەگان، کاران، ناڤێ کاری.. وەك:

پێکرن پێدان (د کرمانجییا ژۆریدا بوویە ئیدیۆم)

پێخوارن پێهێلان (بۆ هێلان)

خوەلیپێوەر (خوەلی ـ پێ ـ وەر) ئاخپێوەرکرن (ئاخ ـ پێ ـ وەر ـ کرن)

تێبینی:

فەرە پێ وەکو پێشگرەك لێکدای ژ پێ ب مانا پارچێ دوماهیێ ژ لنگی یان ل پەی، ل دوو، ل دویڤ.. بهێتە جوداکرن، وەك: پێکۆل.

- پێش:

ژ بلی وەکو ناڤێ جهی و دەمی د کوردیدا ل کارە د هەمان دەمدا وەکو پێشگرەك کاری و ناڤی ژی ل کارە. هەروەسا هندەك تەرز و فۆرمێن دی ژی وەردگرت، وەك: ب پێش ـ، ل پێش ـ،.. هتد.

پێشکەڤتن پێشڤەچۆن

پێشداچۆن پێشکێشکرن

پێشکێنك پێشمەرگە

پێشدەست پێشوەخت

- پێك:

پێشگرەك لێکدایە ژ (ب) و (ئێك) و دبتە جودا دەنگێ پەڤ، کو ژ ب - هەڤ هاتیە پێك ئانین. ئەڤ پێشگرە هەڤپشکیێ دو ئالییان یان دو پارچەیان یان پتر د کریارێدا دکەت، لەو کارێ وێ هەردەم فۆرمێ کۆمێ دستینت، وەك:

پێکهاتن پێککرن

پێکدادان

و هندەك جاران پاشگر - ڤە دگەل دهێتە پەچروومەکرن و (پێکڤە) ژێ دروست دبت، وەك:

پێکڤەهاتن پێکڤەچۆن

پێکڤەنڤستن

## - ت -

- ت:

ئەڤ پاشگرێ کاری، کارێ بۆری ژ رەگی ئاڤا دکەت، وەك:

برشت ژ برژ

ئالیست ژ ئالیس

گرت ژ گر (گێر)

کەلاشت ژ کەلێش

هەروەسا دبتە پاشبەندا نیشانێن دەمێ نهۆ و پاشەرۆژێ (د/ دێ) بۆ کەسێ سێ، وەك:

دچت

دێ چت

دکەت

دێ کەت

و دبتە ئەلۆفۆنا دەنگێ (د)، وەك:

دکر/ ت کر

دخوت/ ت خوت

خۆرتێد مە/ خۆرتێت مە

چاڤێد وان/ چاڤێت وان

جاران، د هندەك پەیڤاندا، دەنگێ (ت) وەکو پاشگر دهێتە بەرچاڤ، لێ چونکی دەستوورەکێ، چ بەرتەنگ چ بەرفرەه، دروست ناکەت، لەو ئەم نکارین ب سانەهی ناڤێ پاشگر لێ بنێین. بۆ نمۆنە دەنگێ (ت) و (س) د پەیڤێن (رووت و رووس) دا کو دیارە هەردو هەڤبەندی پەیڤا (روو) نە، و هەکەر دەنگێ (س) هەڤبەندی دگەل (اسا) هەبت، دەنگێ (ت) هند رۆهن نینە. و پەیڤا (جۆت) کانێ چەند هەڤبەندی (دو)، یان پاشگر (ـ تك) ە، ئارێشەیەك دی یا بێ بەرسڤەك ڤەبرە.

هەکەر مە تێگەهێ بەس، یان خوەروو ـ بێ زێدەهی ـ دا پاشگر (ـ ت) د پەیڤا رووتدا.. جۆت، پتر ئێکگرتنا دو د ئێك قالب و چارچۆڤەدا دیار دکەت.

روو ـ رووت/ رووس

دو ـ جۆت// جۆتك

(ت) ئەك هەیە وەکی جودا دەنگێ (د) تێ بەرچاڤ، و دچتە د ناڤا پارچێن پەیڤێ را، وەك:

پێتڤی: پێدڤی. هەڤبەری (چو پێ نەڤێت) بکە.

خۆش ـ خۆشتڤی. هەڤبەری خۆشەڤی / خۆشەوی بکە

و ئەڤە دەرگەهێ تەرزەك خوەسەر و خومالی و زەنگینێ دارشتنێ د زمانێ کوردیدا، ل بەر مرۆڤی ڤەدکەت، کو ئەم دکارین بەروڤاژی ژی وەجێ ژێ وەرگرین، ئانکو کانێ چاوا پێدڤی سەربخوەیە وەسا، پێدڤییە، پێنەڤێ ژی پەیڤەك سەربخوە بت و رۆلێ خوە ببینت.

ـ تە:

ئەڤ مۆرفێمە د چەند پەیڤاندا وەکو پاشگر خویا دبت، لێ تێکگرتنا تێگەهی هند رۆهن نینە. بۆ نمۆنە، پاشگر (تە) مەزنیێ ددەتە پەیڤا (شەل) و زێدەهیێ و یکەریێ ددەتە (خەو).. و لالۆتە هند ئاشکرا نینە کانێ ژ (لال) و (ـ ۆتە) یان ژ (لال ـ ۆ ـ تە) پێکهاتییە. لێ د دەرگەهێ زێدە و پڕ را مرۆڤ دکارت هەڤپشکیەك نەهند زەلال دناڤبەرا پتر ژ ڤان پەیڤاندا ببینت، وەك:

شەلتە خەوتە

گوێتە کەوتە

لالۆتە سوێتە ژ سوی؟

تەڤ ـ: بنێرە تێك ـ.

ـ تك:

د کرمانجییا ناڤیندا (سۆرانی) دبێژن: لە تەك من دانیشە.

وا دیارە ئەڤ پاشگرێ هەژمارێ هەڤتوخمێ ڤێ پەیڤێیە چونکی دگەل هەژماران دهێت و مانا پێکڤەییێ ددەتە پارچەیێن هەژمارێ، وەك:

جۆتك ژ دو

سێتك ژ سێ

- تی:

جودا فۆرمەکێ پاشـگر - یتی، - اتـی.. یـە، و پـتر د پـەیڤێن داو - ڤـاول (منتهیـة بحرف علة) دا وەکی براتی، دخویێ.

براتی// برایەتی// برایینی

تێ - :

پێشـگرەك لێکدایـە ژ (د) ا پێریەسـت و جینـاڤێ نەبـەرنیاس (ێ)، و تێگـەهێ (د ئەو) دیار دکەت. دچتە سەر کاران و نـاڤێ کـاری، و هەڤبـەندی گـیرەکێن دی ژی دبـت، وەك: تێڤە، تێڕا، تێدا..

تێکەفتن تێچۆن

تێڤەدان تێوەردان

تێهلنان (د - ئەو - هل - ن - ا - ن).. هتد.

تێڕابۆرین، تێدامەزنکرن، تێڤـەکرن.. هتـد، زەنگینیـەك بـێ دومـاهی ددەنـە زمـانێ کوردی.

تێڕا -/ تێڕە -:

لێکدایە ژ (د - ێ - ڕا/ ڕە)، و تێگەهێ د گەودێ تشتەکیدا بوون یـان بۆریـن، ئـانکو کارێ دناڤ لەشەکی ڕا ددەتە ئەنجامدان، وەك:

تێڕاچۆن تێڕاکرن

تێڕابرن تێڕاچکلاندن

تێڤە - :

ژ د - ێ (ئەو) - ڤە پێکهاتییـە، و تێگـەهێ دنـاڤدا، ژنـاڤدا.. ل کـاری زێـدە دکـەت، وەك:

تێڤەهێلان

تێڤەکرن

تێبینی:

تیٚ ڤەدان ب مانا (لبخ، مسح بە..) ژ هەمان دەنگ و مۆرفێمان پێکهاتییە، لیٚ ئاوایێ ئێکگرتنا وان جودایە.

تێك ـ :

لێکدایە ژ پێربەست (د) و (ئێك) و ژ بلی جوداهییێن خوەجهی، دبتە جودادەنگا (تەڤ)، کو تێگەهیٚ کاریٚ دو تشتان یان پتر بەر ب ئێکدی دگەهینت، و جاران تێگەهیٚ بەر ب ناڤخوە دگەهینت، وەك:

تێکچۆن تێکوەربوون

تێکدان تێکڤەدان

تێکراکرن

- ج -

ـ ج:

هند ب سانەهی نینە، مرۆڤ بڕیاری بدەت کو دەنگیٚ (ج) پاشگرە، نەخاسمە دەمیٚ د پەیڤەکیٚ ب تەنێدا دهێتە دیتن، هەکەرچی د پەیڤا کونجدا گومان نامینت کو (ج) ل پەیڤا کون زێدە بوویە، لیٚ وەکی رووت/ رووس، شەرت نینە هەمی زێدەهی گیرەك بن، ئانکو بکەڤنە بەر یاسایەکا زمانی.

کون ـ ج= کونج

و دوورنینە پەیڤا گەنج/ گەنجینە ژی هەڤبەندی پەیڤا (کان) بت.

- چ -

ـ چ:

بنێڕە پاشگر ـ چە.

ـ چە:

پاشگریٚ بچووککرنێیە و جاران مانا کرێتکرنیٚ ژی ڤێڕایە (رووچك). د زمانیٚ

کوردیدا ب هەر سێ جودا ـ دەنگێـن ل سـەلال تـێ دیـتن، و نـەدووره فۆرمـێ (ـ چـك) ژ هەمیان پتر د کرمانجیبا ژۆرێدا ل کار بت، وەك:

(پار) ـ پارچە　　کەمان ـ کەمانچە

روو ـ رووچك　　رێ ـ رێچك

رێ ـ رێچ　　روو ـ رووچ

ـ چك:

بنێڕە پاشگر ـ چە.

**ـ چۆڤە:**

بێگومان چووڤ، چیڤ، و چۆگان.. ب مانـا دارەکێ قوتەستوور، وەکـو چەکـەك دەسپێکی.. دهاتە هلگرتن، ل کارە، و پاشگرێ مە د پەیڤا (چارچۆڤە) دا ژ ڤـێ پـەیڤی هاتیە، لی د پەیڤا (کەرچۆڤە) دا وەکی (چون) ا فارسی و (گـۆن) ا کـوردی ـ فارسـیە، و تێگەهێ (وەك) دگەهینت:

چارچۆڤە　　کەرچۆڤە

زرچۆڤە

**ـ چی:**

وا دیارە پاشگرەك تورکیـە و دەربـازی زمـانێ کـوردی بوویـە، دچتـە سـەر نـاڤێن تشتان و ناڤێ بکەری (نەخاسمە بکەرێ پیشەسان) دروست دکەت، وەك:

سۆلچی　　چا (ی) چی

کلاوچی　　پەنچەرچی

**ـ خ ـ**

ـ خانە:

بێگومان خانە ژ ئالییەکیڤە هەڤبەندی خان و خانییە و ژ ئـالیێ دیڤـە هەڤبـەندی (ـ ان) و یانە و (ـ وانە) یە، و ئێکە ژ پاشـگرێن جـهیێن چەلـەنگ د زمـانێ کوردیـدا. دچتـە سەر ناڤ و دروَڤان و ناڤێ جهی هەڤبەندی ناڤی یان دروَڤی.. ئاڤا دکەت، وەك:

خەستەخانە: جهێ کەسێ خەستەیە (نەساخێ بێ چارە)

مەیخانە: جهێ مەی ڤەخوارنێیە.

کارخانە: جهێ کاری، نەخاسمە کارێن پیشەسازییێ.

کتێبخانە، گولخانە، دەرمانخانە.. نووتر هاتینە دارشتن.

هەروەسا خانە د پەیڤا (خانە ـ دان) دا وەکی پەیڤەکا سەربخوە تێ بەرچاڤ، و دان وەکو پاشگرێ دروڤێ بکەری ئاڤاکەر تێ بەرچاڤ، ئانکو پتر ب دەورێ (ـ دار) رابوویە ژ (ـ دان).

دیسا پەیڤا خان وەکو ناسناڤ دگەل ناڤێن ژنك و زەلامان دهێت، هەکەر چی ل وەختێ خوە پلەیەك جیدارییێ بوویە، لێ پاشی بۆ نازاندنێ و جاران پەچروومەی ناڤان هاتیە ب کار ئانین. بنێرە:

خان وەکو ناسناڤ:

خان ئاڤدەل تەمەرخان

پەچرووم دگەل ناڤان بۆ نازاندنێ:

بەگیخان ئسمیخان

هەوەخان سینەمخان

و ئەڤە هەڤبەندی خانم و خاتوون و خاتێ.. نە کو دکۆکا خوە دا ناسناڤێ مەزنێن گەلێن ئاسیا ناڤەراست بوویە و نەدوورە دگەل ئێریشێن مەنگۆل و تەتەران.. ل دەڤەرا مە بەلاڤە ببن.

خە ـ :

ژ مێژە من هزر د ئەتیمۆلۆجیا پەیڤا خەتیرەدا دکر، و دلێ من دگۆت: فەرە تێکەلی دگەل تیر هەبت؟! لێ چو نەدکەڤتە دەست.. تاکۆ رۆژەکێ ژ رۆژان من د فلمەکیدا، ل سەر مسرا دێرین، پەیڤا خا، خا.. بهیستی و دبندا ب ئەرەبی وەرگێرانا وێ: النار، النار.. بو (ئاگرە، ئاگرە..). هۆسا، من ژی گۆت: من دیت، من دیت!

لەو، ئەز وەسا بۆ دچم کو خە/ خا ب مانا ئاگر دەمەکی ـ د کوردیدا ـ ب کار هات

بت، و وەكو پێشگرەك د پەیڤێن خەتیرە و خاوەردا مـابن. و ئەڤـە دێ پێشـگرەك بـاش بت ئەم ب مانا رۆژ، بەرانبەر ـ Helio - , Sol - ب كار بینین.

خەتیرە ژ خە (ئاگر) و تیر ـ ە.

خاوەر (رۆژ) ژ خا (ئاگر) و پاشگر (ـ اوەر) ب مانا ئاگردار یان ئاگرین.

**خوە ـ :**

وەكو پەیڤ، جیناڤێ خوەییە د زمانێ كوردیدا، و وەكو پێشگر، رۆلێ خوە دگەل كـارێ دەربـاز (تێپـەر) دگێرت، لێ ئەڤـە دەورێ وی وەكـو پێشـگرەك نـاڤی ژی مـــاندلا ناكەت. خوە، وەكو پێشگر بزاڤا كاری بۆ خودانی ڤەدگەرینت ئانكو وی كاری ئاڤادكەت پێ دبێژنێ: كارێ مانا بـەرەڤاژ یـان مانـا ڤـەدای Reflexive كـو بكـەر بتـنێ چەلـەنگ دمینت، بۆ نمۆنە:

خوە ـ ئێخستن: ژ بلی رۆلێ ئـەوی/ ئـەوا دكـەڤت د كریـارێدا، نەكەسـێ دی نـە چـو تشتێ دی دەورنینە.

خوە ـ دەرمان: د ڤۆلكلۆریدا هاتیە؛ خوەكری خوەدەرمانە. هەلبەت خوە ـ دەرمان كورتییا (ئەوبخوە بلا خوە دەرمان بكەت) ە، لێ ئەڤە رێ ل بەر مـە نـاگرت ئـەم خـوە ـ دەرمان وەكو دەستوورەك بێخینە كار و زمانێ خوە پێ زەنگین بكەین.

خوە ـ روو (خوری)     خوە ـ كری

خوە ـ دەرمان

خوە ـ كوشتن     خوە ـ مراندن

خوە ـ زیرەك ـ كرن

**خۆ ـ :**

بنێرە خوە ـ

**ـ خوێ:**

وەكو پاشگرەك ناڤی، د چەند پەیڤان دا ب مانا خودان، ل كارە، وەك:

مالخوێ؛ خودانێ مالێ.

کەفخویێ؛ خودانێ گوندی (نەدووره ژ کەفرا ئبری هاتبته دارشتن).

باخویێ؛ ب مانا مەزن ل کاره، د کۆکا خوه دا مانا خودانێ گوندی د دەت (ژ با -، ڤا-، ڤێه -، بێه -، ماه - .. هاتیه).

- خی:

پاشگرەك کاری بێ برامرییه، چۆیه سەر گەرم و کار ژێ پەیدا کرییه.

گەرم - گەرمخی

کار / کرن - کەرخی

**ملخص البحث**

**السوابق واللواحق في اللغة الكردية/ اللهجة الكرمانجية**

**فاضل عمر**

للباحث دراسة عن سوابق ولواحق اللغة الكردية وخاصة اللهجة الكرمانجية الشمالية، محاولاً ايجاد تعريف كردي لهذه السوابق واللواحق اللغوية والقواعدية اعتماداً على خصوصيات اللغة الكردية.. وبعدها يناقش مفهوم المورفيم المقيّد للسوابق واللواحق، مقترحاً اعتماد الموقع المورفولوجي للمورفيم لتعريف السوابق واللواحق والتي هي اكثر ملائمة للغة الكردية وللتفرقة بين سابقية أو لاحقية المورفيم عن الكلمة المفردة.

أخيراً أتبع الباحث قائمة بأكثرية السوابق واللواحق الكردية مع محاولة لتقصي هذه المورفيمات من الناحية التاريخية ومقارنتها بلغات أخرى.

## *Abstract*

## *Affixes of Kurdish Language "Kurmanjy Dialect"*

*Fadil Umer*

The study deals with affixes of kurdish language Concentrating on Kurmanjy dialect, trying to identify akurdish definition for affixes (Suffix, prefix and infix), both morphologically and grammatically, depending on Kurdish characteristics.. Then he argues about the concept of bound morpheme for affixes, suggesting that the morphological position of the morpheme is more suitable for Kurdish Language to identify the affixity of amorpheme from a free word.

Lastly the study is followed by alist of Kurdish affixes, with some etymological and comparative trials

# لەپێناوی نووسینی "مێژووی ئەدەبی کوردی"دا

## چیرۆکی شیعریی "جەنگی کوللە و ئاینەمەل"ی

## میرزا قادری پاوەیی (١٨٤٦ - ١٩٠٩)

د. مارف خەزنەدار

"چیرۆکی شیعری" وەك زاراوەیێکی ئەدەبی، ناوی زۆری هەیە، وەکوو ئێپیك[١]، ئێپۆس[٢]، پۆیێم[٣]، داستان، مەلحەمە، لە ئەدەبی میللیی نەنوسراودا "بەیت"ی پێ دەڵێن. ئەم جۆرە بەرهەمە ئەدەبییە لەگەڵ "لیریك"[٤]، پارچە شیعری کورتی ئاساییدا ـ کۆنترین بەرهەمی شیعری ئادەمزادە و لە ڕۆژگارانی ژیانی ئەشکەوتەوە تا ئێستا لە ئاودایە.

چیرۆکە شیعرییەکانی گلگامیش (کەلگامێش)[٥] و گێڕاوەکانی تۆفانی نووح و ئەدەبیاتی میسری فیرعەونی و ئیلیادە[٦] و ئۆدیسیا[٧] و ئینیادە[٨] و بەرهەمی شیعری نەتەوەکانی ئەورووپا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا نموونەی بەرزی ئەم جۆرە بەرهەمەن.

---

(١) epic

(٢) opopee

(٣) poem

(٤) Liric

(٥) گلگامیش: قارەمانێکی ئەفسانەییە، خەڵکی شاری "ئوروك"ە لە ئەراکێ (عیراق) چەندین کاری سەرسوڕهێنەری لەگەڵ ئەنکیدوی هەواڵیدا هەیە.

(٦) ئیلیاد: [ فر. Iliade، یۆ. Iliade ، لا. Ilias ] داستانی هۆنراوەی ئەدەبیی هەرە شاکاری بەناوبانگی دنیای کۆنە، کە لەمەڕ شەڕوشۆڕەکانی نێوانی خەڵکی یۆنانستان و "ترۆا"دا نووسراوە.

(٧) ئۆدیسا: [ فر. Odysse، یۆ. Odusseia ، لا. Odyssea ] بە نامیترین ئاسەواری ئەدەبیی کێتییە و هۆمەر دایناوە ٢٤ سرووده. لەباسی گەڕانەوەی ئۆلیس، قارەمانی ناوداری شەڕی "ترۆا" کە لە ڕێگای گەڕانەوەیدا تووشی گێرمەوکێشمە و ڕووداوی زۆر ناڵەبار دەبێ.

(٨) ئینیادە [eniade] داستانی بە ناميێ ڤیرجیلۆس، شاعیری ڕۆمانی کۆن، ١٢ سروودە (٢٩-١٩پ.ن) قارەمانەکەی ئینیاسی ترۆاییە، کە پاش وێران کرانی ترۆا هەڵات و چەنانێ لە کارتاژ ژیا..

لە ڕۆژھەڵاتی ناوەڕاستدا لە ئەدەبی نەتـەوە ھاوسێیەکانی وەکوو فارس و کورد و تورکدا چیرۆکی شیعریی ھونەرێکی دیارو سەرکەوتوو بووە لە مێژووی ئەدەبیاتیاندا. بەڵام لە لای عەرەب لەگەڵ دەوڵەمەندیی ئەدەبەکەشیاندا چیرۆکی شیعری، ئەو دەورەی نەبووە، ببێتە ڕەمزێك لە مێژووی ئەدەبی عەرەبیدا.

بابەتی چیرۆکی شیعری لە بەرھەمی میرزا قادری پاوەییدا (١٨٤٦–١٩٠٩) جێگەیێکی دیاری ھەیە و بە شێوەی مەسنەوی (جووت قافیە) خۆی دەنوێنێ، واتە: نیوە دێڕی یەکەم ودووەمی ھەموو دێڕە شیعرەکان لەسەر یەك قافیە دەبن (اا، ب ب، ج ج..). لە ڕووی کێشیشەوە دە بڕگەیی (کەرتی، سیلابی) و وەستان لە ناوەڕاستدا دەبێ.

بەرھەمی چیرۆکی شیعریی میرزا قادر، دوو کاری "جەنگی کوللە و ئاینەمەل" و "سەما و زەمین"مان بۆ دەور دەکاتەوە. لەم باسەدا تەنیا لە چیرۆکی شیعریی "جەنگی کولله و ئاینەمەل" دەدوێین.

جەنگی کولله و ئاینەمەل [1] چیرۆکێکی شیعریی ڕەمزییە، لە ٢٧٤ دێڕە شیعر پێك ھاتووە. شاعیر ڕووداوەکانی خستۆتە نێو ناوەرۆکی قارەمانی و سوارچاکییەوە، بە شێوەی کۆمیدیایی دەری دەبڕێ.

لێرەدا ئەو شێوە کۆمیدییە بە زۆری لە ئەدەبی ئەورووپیدا بەدی دەکرێ، واتە: بابەتی ڕووداوەکە دراماتیکییە و شاعیر شێوەی کۆمیدیایی ھەڵبژاردووە، وەك شێوازێك بۆ داھێنانی بەرھەمەکە. بێ گومان میرزا قادر، وەکو مینۆرسکی بۆی دەچێ، زۆر ڕێی تێ دەچێ ئیلھامی ئەم چیرۆکەی لە ھێرشە گەورەکەی کولله وەرگرتبێ کە لە ساڵی

---

(١) یەکەمین ھەواڵ لە بابەت ئەم بەرھەمەوە بە ناوی "جنگ ملخ با آتش ملوچ-جەنگی کولله و ئاینەمەل" لە لایەن ف.ف، مینۆرسکی یەوە لە ماوەی جەنگی دووەمی گێتیدا بڵاوکراوەتەوە، بەھۆی ئەو دەستنووسە کوردییانەی دەستی خستبوون، بەشێکی ئەم چیرۆکە شیعرییەی دۆزیەوە. بەڵام لەو سەردەمەدا نەزانرا بوو بەرھەمی میرزا قادری پاوەییە، بڕوانە:
Minorsky V., The Guran, Bulletin of The School of Oriental and African Studies, Uneversity of Londn 1943, vol.X1 - pt.1.

١٣٠٠ك/١٨٨٢ز.دا لەم ناوە ڕووی دابوو، بەڵام مەبەسی میرزا قادر داهێنانی کارێکی ئەدەبیی ڕەمزی بووە، ناوەڕۆکی زیاتر لە مانایێك هەڵبگرێ.

هەڵبژاردنـی دوو جـۆرە گیـان لەبـەر. هۆزیکوڵلـە و ئاینەمـەل بۆکـارێکی ئەنگوچەڵەمەی کۆمەڵایەتی و داهێنانی دراماتیکی تێـدا بـێ، خـۆی لـە خۆیـدا ئـەدگاری سمبۆلی دەداتە کارە ئەدەبییەکە، شاعیریش شێوازی کۆمیدی هەڵدەبژێرێ بۆ بە ئەنجام گەیاندنی بەرهەمەکەی. دیارە کوڵلە و ئاینەمەلیش هەر یەکەیان بە شێوەیێك دروشمی قاتوقڕی و نەهاتین، چونکە هەموو جۆرە ڕووەکێکی بەکەڵك لەبن دێنن، ئـەم کردەوەیـە دەبێتـە هـۆی هـەژاری و برسـیەتی لـە کۆمـەڵی کشـتوکاڵی ئـەو سـەردەمەی ناوچـەی هەوراماندا هەروەها دەبیّئەوەش بزانـین کـە کوڵلـە زیـانی گـەلیّ زیاترە بـۆ کشـتوکاڵ و ئاینەمەل ئەگەر چی زیانیشـی هەیـە، بـەڵام کـردەوەی بـە چاکـە دەگەڕێتـەوە، چونکـە کوڵلە لەناو دەبا.

ڕەنگە خەیاڵی پیاو بۆ ئەوە بڕوا مەبەس لەو دوو لەشکرەی هۆزی کوڵلە و ئاینەمەل هێزی ستەمکاری عوسمانی و عەجەم بێ، بۆ ئەمەش دیارە کورد لە مێژووی تـازەیدا بـە تایبەتی لە دوای جەنگی چاڵدیرانـەوە (١٥١٤ز.) لەبـەر ئـەوەی بـە گشـتی چارەنووسی کەوتە ژێر دەستی عوسمانی و عەجەم، باوەڕی بە سـوڵتانی عوسمـانی و شـای عەجـەم نەبوو، ئەگەر ڕۆژیّ لە ڕۆژان پەنای بردبێتە بەر یەکێکیان لە دژی ئەویتر، تـەکتیك بـووە و هیچی تر. جا ئەگەر خەیاڵمان بۆ ئەوە بچیّ کوڵلـە عوسمـانی و ئاینەمـەل عەجـەم بن وەکو لـە نـاوەڕۆکی کۆمیدیاکـە دەردەکـەویّ، مانـای ئەوەیـە شـاعیری کـورد لـە هەڵوێستێکدا پێویستی بەوە بووە لایێکیان بە دۆست و لایەکەی تریان بە دوژمن بزانیّ.

لە ڕوویێکی دیکەوە لەوانەیە میرزا قادر ویستبێتی ئاینەمەل لە ڕۆژهەڵات و کوڵلە لە ڕۆژئاوادا ببینیّ. لەشکری ڕۆژهەڵات لەشکری پرتەوی ڕۆژ و ڕووناکییە، لەشکری ڕۆژئاوا لەشکری تاریکی و شەوی ڕەشە، لەبەر ئـەوە بەڕێکـەوتیش بـێ، عەجـەم لـە ڕۆژهـەڵاتی پاوە و عوسمانی لە ڕۆژئاوایدا بووە، ویستوویەتی ئەم دیاردەیە وەربگریّ وەك بەڵگەیێك بۆ هێزی چاکە و خراپە، دیارە ئەمە هیچ پێوەندییێکـی بـە چاکـە، یـا خراپـەی هـەردوو

دەوڵەتی عەجەم و عوسمانییەوە نییە، ئەگەر بمانەوێ بە شوێن ڕاستیشدا بگەڕێین هەر دوو دەوڵەتەکە کوردیان دەچەوساندەوە.

لەگەڵ ئەم هەموو بۆچوونانەدا، ڕەنگە بابەتەکە لێکدانەوەی دیکەش هەڵبگرێ. ئەم کۆمیدیایە وەکوو بەرهەمێکی ئەدەبی ڕەمزیی بەرز خۆی لە ئەدەبی کوردیدا دەنوێنێ؛ چونکە هونەروەرانە و داهێنەرانە کۆمەڵی هۆزی کوللە وەکوو دوژمنی کۆمەڵی ئادەمزاد دەخاتە ڕوو.

میرزا قادر بۆ گێڕانەوەی ڕووداو بەشێوەیێکی هونەری داهێنراو سوپایێك لە کوللە دروست دەکا، ئەم سوپایە بێگانە و بەدفەڕە، سەربازی لەشکر هەموو بەرهەمێکی کشتوکاڵی هەڵدەلووشێ؛ زیان و خراپەی بۆ خاك و مەڵبەندی شاعیر هەیە تەنانەت بە ئاواییی پاوەشەوە.

شاعیر چیرۆکەکەی بە پاڕانەوە و موناجات دەست پێ دەکا:

یـــا کــــەریم حــــەق یـــا کەریـــم حــــەق
یـــا فــــەرد بیـــچوون یـــا کەریـــم حــــەق
یـــا بینـــای بـــێ بـــاك مــــەوجوودی موتڵـــەق
یـــا ســـازندەی چـــەرخ بـــێ ســـتوون مۆلـــەق
یـــا ئاگـــا جـــە دەنـــگ پەنجـــەی پـــای پەخشـــە
نـــەوزاد و نـــەمر جـــە کـــەس نـــە لـــەخشە
یـــا تـــای بـــێ هــــەمتا قــــەدیم و ئـــەقدەس
ســـیوای تـــۆ هیـــچ کـــەس نییـــەن بـــالاّ دەس
یـــا ڕەونـــەق نـــەمای گـــوڵان شـەوبـــۆ
یـــا زبـــان ـ زوبـــان ئـــامۆز دەیریـــان کـــۆ

ئینجا لە خوا دەپاڕێتەوە، خەڵکی لە ستەم و کردەوە ناهەموارەکانی کوللە ڕزگار بکا:

ئەوەیش باوکی چاك تەربییەی دابێ	هیچ باوەڕ مەکە سەر (دەن) هەوابێ

پ٤، ل٧٦

خۆ ئەگەر بێت و سەر (دەن) هەوابێ	تا ئەمـان نێژن ئەبێ هەر وابێ

پ، ل ١١٩

هێند (دەن) کەنارێ ئەوا لەم پەڕێ	بۆچ بە بلوێری خەلکی هەڵپەڕێ

پ٤، ل ١١٩

من ئەڵێم پەندم سەر (دەن) هەوایە	هەموو شیعرێکم بەبێ مەعنایە

پ٣، ل ٣٢

* دەزیبێ: لێرەدا واتە: دەبێ، دوگونجێ، بەجێیە، لە شوێن خۆیدایە، بەڵام وشەکە خۆی واتە: لێی دێت، جوانی لێ دێت، ئەم وشەیە سێ بەشە: دە + زیب + ێ دە: پێشگری کاری ئێستایە. زیب: ڕەگی چـاوگی (زیبیدن) ی فارسییە واتـە: شایستە و ڕازاوە بوون. ێ: جێناوی لکاوە بۆ کەسی سـێیەمی تـاك. پـیرەمێرد لێرەدا، بە هۆی ڕەگێکی فارسییەوە، لەسـەر دەسـتووری کـوردی بـەو جـۆرە، ئەو کارەی دروست کردووە.

ئەمڕۆ (دەزیبێ) بڵێین ماتەمە	قوبیەی نیلگوون پڕ تەم و خەمە

دیوان فا، ل ٢٠٦

* دەست بەرداریێ: دەست هەڵگرێ، وازبهێنێ. وشەی (دەست بەردار) ڕەگی چاوگی (دست برداشتن) ی فارسییە، (ێ) جێناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاکە، ئەگەر بە فارسی واتای (دەست بەرداریێ) بنووسین بە جۆرەیە (دەست بر دارد) بەڵام پیرەمێرد لێرەدا ڕێزمانی کوردی بەسەردا سەپاندووە.

سالێکیان لەپـــڕ ئیجارە داریێ

دەست دار، دەست بە دار تا (دەست بەرداریێ)

دیوان فا، ل٦٩

* دەست زەنی: هەرچەند (دەست زەنی) لێکدراوێکـی فارسییەو (دست زدن)

واتـــه چه‌پڵـه‌لێدان و ڕه‌گه‌كـه‌ی (دست زن) ه‌و، پـــیره‌مێرد پاشـگری (ی) ی خستۆته‌سه‌ر و لێره‌دا به‌ واتای: به‌رتیل و دزی و ده‌ست درێژی به‌كارهاتووه.

منداڵی زۆر و مه‌عاشێكی كه‌م (ده‌ست زه‌نی) نه‌كه‌م به‌ چی هه‌ڵده‌كه‌م

پ، ل ۸۸۹

* ده‌ستنده: شت پێدان كه‌م كه‌م و به‌ ئه‌ژمار (هه‌ژار).

* ده‌سنده: شت پێدان كه‌م كه‌مه (هه‌ژار). چت به‌ مه‌ردوم دانه به‌ ئه‌ندازه و كه‌موكووڕی (گیو).

* ده‌سه‌نده: شت به‌ مه‌ردووم دان و به‌ ئه‌ندازه.

كه‌ چاو ببڕیته (ده‌ستنده) ی خه‌ڵكی ئه‌كه‌ویه ژێربار دیاره بێ كه‌ڵكی

پ، ل ۱٤۱

ئه‌و بێ (ده‌ستنده) ی كه‌ماڵ نه‌به‌خشێ

كه‌ماڵی كه‌مه، زوو پێی ئه‌له‌خشێ

پ، ل ۳٥٤

وه‌ڵلاهی زه‌كیین، سه‌خیین؛ به‌ وه‌فاین بێكه‌س و سه‌برین

تاكه‌ی (ده‌سنده) خۆر و گه‌دابین و ده‌ربه‌ده‌ر

دیوان فا، ل ۲۱٥

له‌ په‌راوێزی دیوان فا، ل ۲۱٥، نووسراوه، ده‌سه‌نده: چاو له‌ ده‌ستی خه‌ڵكی ڤ یارمه‌تی دان و سك تێركردن.

تا (ده‌سنده) ت بێ قه‌درت له‌ لامه كه‌وم بۆ نه‌گری پێت ناڵێم مامه

پ، ل ٤٦

زۆر كه‌سی وه‌حشی توند بوو سه‌هه‌نده

به‌ (ده‌سه‌نده) بۆت ئه‌بن به‌ به‌نده

پ، ل ٥۲۲

* ده‌سدار: به‌ده‌سته‌لات، خاوه‌ن ده‌سه‌لات، ده‌ست ڕۆیشتوو.

وشـــەکە دوو بەشـــە: دەس + دار. دەس = دەســـت دار: ڕەگـــی چـــاوگی (داشتن) ی فارسییە، واتە هەبوون.

سالێك ئیجارەی کردبوو (دەسدار) یێ

دەسدار دەس بەدار خەڵك دەست بەرداریێ

دیوان ها، ل ٢٣٤

* **دەواناپەزیر**: هەر دەردێ کە دەرمانی نەبێ و چارەسەر نەکرێ، هەر نەخۆشییەك کە دەرمان نەتوانێ چاکی بکاتەوە. وشەکە سێ بەشە و بەشی سێیەمی کە (پەزیر) ە ڕەگی چاوگی (پدیرفتن) ە، واتە: قبـوولْ کـردن و خسـتنە ئەسـتۆی خۆ.

بتزانییایە کە جوانی گوزەرگای پیرییە

مەرگیش کوتوپڕێکە (دەواناپەزیر) یيە

دیوان ها، ل ١٧٩

بەلأم لـە (دیـوان فـا، ل ٢٩٥) لـە جیـاتی (دەوا ناپـەزیر) بەهەڵـە نووسـراوە (دواناپەدێری)، هەروەها نیوە دێڕە شیعرەکەیش بڕگەیەکی کەمە:

بتزانییایە جوانی گوزەرگاهی پیرییە

مەرگیش کوتوپڕێکە (دواناپەدێری) یيە

دیوان ها، ل٢٩٥

* **دەوڵەتیار**: بەختیار، کامەران، دەوڵەمەند.

(دەوڵەتیار) ئەیگوت کەشەڕ کەوتە ناو

پەرێزت پاك بێ لە دروێنەی پیاو

پ، ل ٦٧٤

پەزێر: شوێنی دروێنەی دەغلْ و دان (خالْ)

* دیزەڕەش: لێرەدا مەبەست ورگ و سکە.

هەموویشی دەردی (دیزەڕەش) یەتی

تا دەمرێ هەوڵی خواردن بەشیەتی

پ، ل ٨٤٦

* دین ئار: واتە دیندار و بەدین و لێرەدا وەکو پیرەمێرد بەکاری هێناوە مەبەستی موسڵمانێکی دیندارە. ئەم وشەیە دوو بەشە: دین + ئار.

دین: ئەم وشەیە هاوبەشە لە نێوان ئێرانی و سامیدا، لە زمانی ئەڤیستادا daena، لە پەهلەڤیدا din واتە: ئاین و ویژدان، لە ئەکەدیدا: denu و dinu واتە: یاسا و ماف و داوەری، لە عەرەبی دا: دین (معـین) ئار: کورتکراوەی (دار) ە و (دار) یش ڕەگی چاوگی (داشتن) ی فارسییە، واتە (هەبوون) دین دار: ئەو کەسەی کە دینی هەبێ. بۆ نموونە: شاخدار، دەسکدار، ماڵدار، پارەدار... هتد. وشەی: ( دین ئار) کورتکراوەی (دیندار) ە.

هەر مەیلی خوایەکە وا (دین ئار) ە پشت لە قیبلەیە و ڕوو لە دینارە

پ، ل ٧٣٩

لە هەموو شوێنێك ئەوەك ئەم شارە دینار بە مەعنا دنیا و (دین ئار) ە

پ، ل ٨١٠

* ڕاگوزەر: پیرەمێرد لێرەدا وشەی (ڕاگوزەر) ی بە واتای ڕێگا بەکارهێناوە، لە فارسیدا وشەی: راهگذار و راهگذر، بە واتای ڕێبوار و بە واتای ڕێگا بەکار دێت. (گذر) ڕەگی چاوگی (گذشتن)ە واتە تێپەڕین. لە پەراوێزی: پ، ل ٦٩١ دا نووسراوە: وشەی (مەعبەر) کە بە مانای قەیاغ دێ لە چاپەکەی کاکەی فەللاحدا نوختەی بۆ دانراوە.

بەڵام (مەعبەر) یان (میعبەر) واتە شوێنی تێپەڕ بوون، شوێنی تێپەڕ بوونیش واتە: ڕێگا. خۆ ئەگەر دێڕە شیعرەکەی سەرەوەی بنووسین ئەم واتایە دەسەلمێنێ، کە دەڵێ:

له دیجله‌م پرسی شه‌تی ئاخر شه‌ڕ	بۆچ له‌گه‌ڵ به‌غدا وا که‌وتوویه شه‌ڕ

پ، ل ٦٩٠

لێره‌دا واتاکه‌ی دیار و ئاشکرایه که پرسیاری له دیجله کردووه و ده‌ڵێ: ئه‌ی ئاخرشه‌ڕ بۆچی تۆ له‌گه‌ڵ به‌غدادا، شه‌ڕ ده‌که‌یت ئه‌ی ئه‌وه نییه که ناوجه‌رگ، واته ناوه‌ڕاستی خۆیان کردووه به شوێنی تێپه‌ڕ بوونت بۆ ئه‌وه‌ی بێ به ڕێگا.

*ڕام کردن: ڕاهێنان و ده‌سته‌مۆکردنه. بۆی ڕام ئه‌کردین: واته بۆی ڕاده‌هێناین،بۆی ده‌سته‌مۆ ده‌کردین، ڕام ئه‌که‌ن: لێره‌دا واته ده‌یخه‌نه ژێر خواست و ئاره‌زووی خۆیانه‌وه.

ڕه‌حمه‌ت له سۆفی باره‌ی زۆرێ پۆش

(بۆی ڕام ئه‌کردین) نێستری چه‌مۆش

پ٣، ل٤١

به سه‌نعه‌ت ئاو و هه‌وا (ڕام ئه‌که‌ن)	به وه‌حشه‌ت دنیا بێ ئارام ئه‌که‌ن

پ، ل٣٢٧

* ڕاوێشکه: هاتوچۆکردن (خاڵ). به‌ڵام لێره‌دا واته: شه‌کانه‌وه‌ی گیاو گوڵ:

که ئه‌ڕوانیته ڕه‌نگی نه‌وبه‌هار	(ڕاوێشکه) ی گیا و گوڵ به له‌نجه و لار

پ، ل ٥٨٥

* ڕژد: مه‌ردومی چرووک. (خاڵ) ئه‌گریس، ده‌ست وشک، به‌رچاوته‌نگ، پشتی، له‌چه‌ر، چرووک.. (گیو)

باره‌ی پیاوی (ڕژد) که هه‌ڵی ئه‌گرێ	خۆیشی لێی ناخوا هه‌تاکو ئه‌مرێ

پ، ل ٨٩٠

* ڕستگار، ڕسگار: ڕزگار.

مار که زۆری خوارد ده‌ئاڵێته دار	به‌وه ئه‌زمه بێ ده‌بێ (ڕستگار)

پ، ل ١٦٣

به‌ڵام هاوینمان فه‌قیر و هه‌ژار	له به‌رگ و ئاگر و زوور ئه‌بێ (ڕستگار)

پ، ل ٨٨٢

ئەم گێژە گێژی تیا (ڕسگار) نابێ          مەلەی پێ دەوێ بە هاوار نابێ

پ، ل ٧٩٧

وتم لەم دەردە (ڕسگار) ت دەبێ          ئەگەر بێ و دڵی من بێنێتە جێ

پ، ل ٨٤

لەگەڵ پەنچکێ نانیان بۆ دەچوو          نووتکی دەهاوێشت (ڕسگار) ی دەبوو

پ، ل ٨٥

بۆیە من حەز ئەکەم باران بباریّ          لەم بێ ئاوییە (ڕسگار) بێ شارێ

پ، ل٦٧

ئێمە تازە تێگەیشتووین کە داکێکی خوێندەوار

نەتەوەی وا دێنێتە کار میللەتێك ئەکا (ڕسگار)

دیوان ڤا، ٢٧٤

* ڕشت: هەوەسی ئیش وکارکردن، ئارەزووی کارکردن .          (گیو)

بۆ دەوڵەمەندی (ڕشت) ە ئەم بووکە

تا باری قورس بێ ئەو ئەڵێ سووکە

پ٤،ل٣٩

تێبینی: لە (پ ،ل٦٧٧) دا، لەجیاتی وشەی (ڕشت) وشەی (ڕەشت) ەو لە فەرهەنگی: (خاڵ، گیو، هەژار) دا نییە.

بەلام ئەگەر پیرەمێرد مەبەستی شاری (ڕەشت) بێت، کە دەکەوێتە سەرووی ئێران، لە ناوچەی دەشتایی گیلاندا و شارێکی جوان و زۆر دەوڵەمەندە و دەروازەی بازرگانییە لەسەرووی ئێراندا، ئەوا هەر دەگونجێ و مەبەستی پیرەمێرد لێرەدا ئەوەیە کە ئەو بووکە بۆ یەکێکە لە دەوڵەمەندەکانی شاری ڕەشت .

* ڕمووزن: وتەیەکە، کە گیانداری ئێسك قورسی پێ ئەشوبهێنرێ (خاڵ)

ناشیرین ، دزێو ، حەنتیکە ، ئێسك قورس. (گیو)

مێردەزمە، دێوەزمە،جنۆکەی پیاوترسێن (هەژار)

ئەودەمە بەختم لێ بوو بە دوژمن     کەکەرە دێزەم بوو بە(ڕمووزن)

پ، ل٥٩

کەری خۆمانیان کرد بە (ڕمووزن)     بوو بە قاڵەی دەم گاڵەی درۆزن

پ، ل١٣٦

خۆی شاردبووەوە لە کون و قوژبن     کەری خۆی لەلا بوو بە (ڕمووزن)

پ، ل٢٩٤

* **ڕۆژگانە:** ڕۆژانە، ئەوەی کە لە ڕۆژێکدا، دەست دەکەوێ، خۆراکی ڕۆژانە. لە فارسیدا (روزگانە) بەهەمین واتایە .

من سێ (ڕۆژگانە) ی خۆم پێ بڕاوە     نازانم چیمە لەم بەند و باوە

پ، ل٦١

* ڕەزاجۆ: ئەوەی کە ڕازی بێت و ڕازی بوونی بوێت. وشـەی (ڕەزا) لـە (رضـا) ی عەرەبییەوە هاتووە، بەڵام (جۆ= جو) ڕەگی چاوگی (جستن) ی فارسییە، واتە بە دوای شتێکدا گەڕان و لێکۆڵینەوە و هەوڵدان بۆ گەیشتنە ئەنجامێك .

پەروانەی نووری لیقای تۆ نەبێ     بە هەموو خواستت (ڕەزاجۆ) نەبێ

دیوان فا، ل٣٨٢

* ڕەفتیان: ڕۆیشتنیان، چوونیان. (ڕەفتیان) پێك هاتووە لە:

ڕەفت + یان .     ڕەفت: چاوگی کرتاوی (رفتن) ە. یان: جێناوە .

ئەم خەڵکە لەگەڵ یەك دۆست و یارە

ئامەشۆ و (ڕەفتیان) لای یەك دیارە

پ، ل١٨٣

* ڕەهەندە: ئاوارە و دەربەدەر.

ئەهلی فەن یەك یەك (ڕەهەندە) ترە

ئاخۆ كام بۆمبا كوشندەترە

پ، ل٥٢٦

* زرێ: بەرگی جەنگییە، كە قۆڵەكەی كورتە و لە هەڵقەی وردی پۆڵای چنراو دروست

كراوە، لە زەمانی كۆندا، لە كاتی جەنگدا، بە سەر جل وبەرگەوە لەبەر دەكرا،

بۆ پاراستنی لەش ·

ڕەحمەت لە سۆفییارەی (زرێ) پۆش

بۆی ڕام ئەكردین ئێستری چەمۆش

پ٤، ل٤١

(زرێ) ی زانینت كە كردە بەرت

تاجی ئەدەبیش بنێرە سەرت

پ٤، ل٤٦

* زەڕ باهوو: ئەوەی كە زێڕی كردبێتە بازووی، بۆ خۆ ڕازاندنەوە و جوان كردن·

زەڕ: زێر. باهوو: بازوو، لەشانەوە تا ئانیشك ·

ئای بۆ پەری خان نازداری جافان

ئاهووی (زەڕ باهوو) ی عەنبەر كلاًفان

دیوان ها، ل١٢٤

* زیندەخەو: خەو بینین بەدەم دالغەوە، بەشی یەكەمی وشەكە (زیندە) واتە

زیندوو. وشەی زیندە دوو بەشە: زی + ندە

زی: ڕەگی چاوگی (زیستن) ە، واتە ژیان. ندە: پاشگرە

بە (زیندە خەو) ی پڕوپیرەژن

زۆر كەس بە سەیران بۆ بەغدا ئەچن

پ، ل ١٥١

هەندێكی وا هەن كە بە (زیندەخەو)

بە خەیاڵ ئەبنە حوكمداری شەو

پ، ل ٩٤

* سان نەجمیٚ: خان نەجوولیٚ، پاشا نەچمیٚ.

لای پیرەمێرد جمان و جوولەی سان کارێکی گەورەیە و ئاسان نییە، ئەم قسەیە لە ناوچەی هەورامانا زۆر باو و بڵاوە و دەڵێن: (سان جمۆ بە غای گیرۆ) واتە: سان بجمیٚ بەغدا دەگرێت. لە بیر مەکە بۆ سەیران دەچووین بۆ سەرچاوەی زەڵم، پاشماوەی وێرانەی کۆشکێك لە نزیك سەرچاوەکەوە هەبوو، دەیان وت ئەمە کۆشکی (خان ئەحمەد خان) بووە، لە ناوچەی هەوراماندا هەر لە کۆنەوە دەماودەم باسی خان ئەحمەد خان کراوە، لەم چەند ساڵی ڕابوردووەدا گەلیٚ سەرچاوە بە زمانی فارسی لە بارەی مێژووی حکوومەتی ئەردەلانەوە چاپ کراوە، سەرچاوەی کۆنی تریش زۆرن لەم بارەیەوە و بە درێژی باسی خان ئەحمەد خانیان کردووە وەکو پاشایەکی زۆر بە دەسەڵات کە توانیویێتی سنووری حکوومەتەکەی زۆر فراوان بکات، لە بارەی پاشماوەی کۆشکی ناوبراوی زەڵم، کاك حەمەکەریم هەورامی دەڵیٚ: [ئەوە لە هەوراماندا ناسراوە بە " تاقوسانی خان ئەحمەد خان" لە شێوەی هەورامیدا (سان) و (خان) یەك واتایان هەیە ئەویش (پاشا) یە و بە هەورامی (سانی سانان) هەیە بە واتای پاشای پاشاکان].

بەڵام من وای بۆ دەچم کە ئەم (سان نەجمیٚ) یە مەبەست "خان ئەحمەد خان"ە کە لە سەردەمی دەسەڵاتی خۆیدا جماو بەغدایشی گرتوو چووە ناوییەوە و گەلیٚ سەرچاوەی کۆنی ئەو سەردەمە و دوای خۆیشی باسیان کردووە، لێرەدا بە کورتی ئەمە دەخەینە ڕوو: خان ئەحمەد خانی ئەردەلان، کە لە ساڵی (١٠٢٥ کۆچی) دا بوو بەوالیی کوردستان، سوپایەکی گەورەی بە ناوی (لەشکری ئەردەلان) ەوە دروست کرد، ڕەواندز و خۆشناوەتی و عەمادییە و کۆیە و حەریری خستە سەر حکوومەتەکەی، دوای ئەوە مووسڵی گرت لە پاش چل ڕۆژ کەرکووکی گرت دوای ئەوە بە لەشکرێکی گەورە و گرانەوە بەرەو بەغدا ڕۆیشت، کاربەدەستان و گەورە پیاوانی بەغدا پێشوازی

لێ دەکەن و بەبێ جەنگ دەچێتە ناو بەغداوە، دوای ئەوە لە ساڵی (١٠٣٥ کۆچی) دا، دەگەڕێتەوە بۆ کوردستان، ئەم گەشت و لەشکر کێشییەی خان حەوت ساڵ و سێ مانگ دەخایەنێت. خان لە ساڵی (١٠٤١ کۆچی) دا کرماشان و سونقور و هەمەدان و گەڕۆس و خووی و ئوروومییە دەخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە و لەو شوێنانەدا کاربەدەستان دادەمزرێنێت و بە ناوی خۆیەوە پارە دروست دەکات و لە مزگەوتەکاندا، وتار بە ناویەوە دەخوێنرێتەوە و بۆ ماوەی پێنج ساڵ بە ڕەسمیی حکوومەت بەڕێوە دەبات، و بۆ یەکەمین جار بە هۆی چوونە سەر ئەختییەوە "شێخ عبد الغفار مردۆخی" لە کوردستانی ئەردەڵاندا وتار دەخوێنێتەوە کە بەم جۆرە کۆتاییی پێ دێت:

(.... الوالي ابن الوالي، والي والا شأن، خان احمد خان اردلان، پادشاه بالاستقلال ممالك كردستان، صانه الله تعالى عن طوارق الحدثان.)

دوای ئەوە خان ئەحمەد خان لەگەڵ هەندێ لە میر و سەردارەکانی خۆیدا دەچێ بۆ مووسڵ و ئینجا مووسڵ و کەرکووک دەکات بە "دار الملك"ی خۆی و شارەزووریشی دەخاتە سەر. بڕوانە (جلد دوم ـ کتاب تاریخ مردۆخ ـ تألیف حضرت آیت الله مردوخ کردستاني ـ ص ١٠٣ ـ ص ١٠٧ ماوەیەکیش خان ئەحمەد خان لە "قەڵای زەڵم" ماوەتەوە. بڕوانە: تحفەء ناصری تاریخ و جغرافیای کردستان ـ تألیف: میرزا شکر الله سنندجی ـ مقابله و تصحیح دکتر حشمت الله ـ ص ٤٧٨.

هەورە تریشقە باکێو بسمێ گشتی ئاسانە هەر (سان نەجمێ)

پ، ل ١٠٢

* ستێزا: واتە، جەنگی کرد، سەرکێشیی کرد، لێرەدا مەبەست هەڵاتنی خۆرە.

بەرقی پێشخانەی سەحەر (ستێزا) سوپای ستارە، لەرزا، گورێزا

دیوان فا، ل ٣٥٥

گورێزا: هەڵات.

نیوەی یەکەمی دێڕە شیعرەکە واتە: دنیا ڕووناك بووەوە و ڕۆژهەڵات.

نیوەی دووەمی واتە: ئەستێرە لە ئاسماندا نەما و دنیا ڕۆشن بووەوە.

* سەربەدراو: ئەو کچ و ژنانەی کە سەر و کڵاوەکانیان پارەی زیو و ئاڵتوونیان پێوەبێت و بەوانەوە ڕازابنەوە.

ئاوی زیندەگیت ڕژاوەتە ناو جێی حەسانەوەی تیپی (سەربەدراو)

دیوان ها، ل ١٥٢

لە پرشەی ئاونگ بە تیشکی هەتاو

گوڵ چوو بووە شێوەی بووکی (سەربەدراو)

دیوان ها، ل ١٤٠

* سەربەرەڵلا: ئازاد، سەربەست.

باخەوان وتی: وەرە ئاشنابە لەم باخەی مندا سەر بەرەڵلا بە

دیوان فا، ل ٢٨٥

* سەردەرهەوا: مەبەست شێواو و پەریشان و بێ سەروبەر و کاری هەڕەمەکی و بەبێ بیرکردنەوەیە.

خۆ ئەگەر بێتو (سەردەهەوا) بین تا ئەمانێژن ئەشێ هەروا بین

پ، ل ٧٨٢

من ئەڵێم پەندم (سەردەهەوا) یە هەموو شیعرێکم بە بێ مەعنایە

پ، ل ٢٥٤

ئەوەیش باوکی چاك تەربییەی دابێ

هیچ باوەڕ مەکە (سەردەرهەوا) بێ

پ، ل ٧٣٤

* سەر فرق: مل کەچ، سەر شۆڕ

* سەر فرۆئەکەن: مل کەچ ئەکەن، سەر شۆڕ دەکەن، سەر دادەنەوێنن.

* سەر فرۆدێنێ: مل کەچ دەکا، سەر شۆڕ دەکا.

* سەر فرۆیی: مل کەچی، سەر شۆڕی.

ئەگەر چاوگی هەردوو کاری (سەر فرۆ ئەکەن، سەر فرۆ دێنن) بنووسین بەم جۆرەن: (سەر فرۆکردن، سەر فرۆهێنان). ئەگەر بە فارسی هەردوو کارەکە و چاوەگەکانیان بنووسین بەم جۆرەن: (سر فرو می کنند، سر فرو میاورند) و (سر فرو کردن، سرفرو آوردن). پیرەمێرد ئەو کارانەی بە پێی دەستووری زمانی کوردی نووسیوە، (فرو) ی کرووە بە (فرۆ)، دووکارە یاریدەدەرەکەیشی کردووە بە کوردی.

کاتێ کە (فرو) لە پێش کاری لێکدراوی فارسییەوە دێت، پێی دەوترێ پێشگری کار، و بە واتای: خوارەوە و ژێرەوە دێت: فرو آمدن، فرو رفتن:

زانین تا جێکە وا بە سەرەوە | بە (سەرفرۆ) یە لێی مەکەرەوە

پ٣، ل ٦٧

ئێستا کە لەگەڵ یەك درۆ ئەکەن | حەوتیان بۆ جوویێك (سەرفرۆئەکەن)

پ٤، ل ١٨٠ و پ، ل ٨٤٧

ئەبێ بەخشندە مل کەچ کا لە ڕاستی مووچە خۆری خۆی

سوراحی بۆ پیاڵە (سەرفرۆ دێنێ) کە تێکا بۆی

دیوان فا، ل ١٨٥

زانین تاجێکە وا بە سەرەوە | بە (سەرفرۆیی) لێی مەکەرەوە

پ، ل ٢٩٩

* سەرمەلا: لێرەدا واتە، گەورە و سەروەر.

لای (گیو) واتە: سەروەستای یاری، سەردەستە.

کابرای خۆمان (سەرمەلا) مانە | بەو حەل ئەکرێ ئەم ڕازی نیهانە

پ، ل ١١٠

* سەرەنگرێ: بە سەرا کەوتن (خاڵ)

سەرەنگرێ: گیاندارێکە بە سەردا کەوتبێ، تووشی کارەسات و چورتم هاتن،

سەرسم، ساتمە. (گیو)

مەلا لێی نەبیست سا ئەو بەڕێ بوو

ئەم لەگەڵ لقدا (سەرەنگرێ) بوو

پ، ل ٥٢٠

ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەو بەسەرهاتەی مەلا نەسرەدین، کە ئەو لقەدارەی لە سەری بوو لە بندا بە تەور بڕییەوە و سەرەنجام بەسەردا کەوتە خوارەوە.

* **سەمەندۆك:** پەتێکە سەرێکی ئەخرێتە ملی سەگ یا تانجی و سەرەکەی تری ئەبەسترێ بە دارێکەوە، بۆ ئەوەی ئەو کەسەی دارەکە ئەگرێ، سەگەکە نەیگەزێ، (سەمەندۆك کردن) پەتکردنی سەگە بە سەمەندۆك.

بڕوانە: (خاڵ) و (گیو)

گۆڕی ئەوانە بە (سەمەندۆك) ە　　　دەمیشیان بگری پڕ زگیان نۆکە

پ، ل ٨٢٣

دیارە کە دوایی (سەمەندۆك) ئەکرێ

ئینسانی خوێن ڕێژ مەرگی پێ ئەبڕێ

پ، ل ٤٣٣

* **سەهەندە:** سەهەندە: واتا مەردومی لاساری نەگریس. (خاڵ)

سەهندە = سەهەند = سەهنە: لاسار، نەگریس، بێ شەرم، بێ ئابڕوو، بێ گوێ. (گیو). سەهندە: ئەوەی نەیەوێت گوێ لە کەس بگرێ، منداڵێ کە گوێ لە قسەی کەس نەگرێ. (پور). لە فارسیدا: (سهندە = سەهەندە) ناوی بکەرە و لە چاوگی: (سەهیدن = سەهیدەن) یان (سهستن = سەهستەن) ەوە وەرگیراوە. واتە: دەرکەوتن، سەیرکردن، ترسان، سڵ کردن. (معین)

زۆر کەسی وەحشی توند بوو (سەهەندە)

بە دەسەندە بۆت ئەبن بە بەندە

پ، ل ٥٢٢

هەی هاوار لە پێش چاومانە ئەمرین

هێند (سەهەندە) ین گوێی لێ ناگرین

پ، ل٥٨٣

* سیچکە: لێرەدا بە واتای شتی کەم بەها هاتووە. بەلاّم لای (خال) جۆرێکە لە بەری دارمازوو بەقەد (گزگل) ئەبێ و چل چلە، بەلاّم چلەکانی کولّن.
(سیچکە سلاّو) کە زیپکەیەکی بچووکە و لەسەر پێلّووی چـاو دروسـت دەبـێ و بەشی یەکەمی هاوریشەن.

بە مازوو لە دەست چووبوو سەرمایە ئەیویست بە (سیچکە) بێتەوە کایەوە

پ، ل ٥٤٩

* شاسەیوان: چەتری پاشا، کە لە گەرمای هاویندا و بەتایبەتی لە کاتی ڕۆیشتندا لە ڕاسەری ڕادەگیرێت، بۆ ئەوەی هەتاوی لێ نەدات.

ئەسپی زل حۆرتی مل (شاسەیوان) ی کاتێکت زانی کە تێی‌نەهانی

پ، ل ٢٨٦

* شەرمەسار: شەرمەزار.

دینیشت لەگەلّ دلاّ قڕاندم لای خوایشم نەماوە (شەرمەسار)م

دیوان فا، ل ٣٦٢

* شەمالە: دانیشتنی ئافرەتە لە شەوی شەموانا لە سێ ڕێیانێك لەگەلّ گرتنی نیـازێك لە دلاّ، ئەگەر ڕێبوارێك قسەیەکی خۆشی کرد ئەوا ئەیکا بـە نوقلانـەی پێکهاتنی نیازەکەی، ئەگەر قسەی ناخۆشی کرد، ئەوا ئەیکا بە توقلانەی پێـك نەهاتنی. (خال) و (گیو).

بە شەو (شەمالە) ی کۆلاّنان ئەگرین لەبەر ئازایی جەردەکان ئەمرین

پ، ل ٢٧٤

* شەوچرای لال: گەوهەری بەنرخ و ورشە داری لەعل.

ئەم وشە لێکدراوە پێك هاتووە لە: شەو چرا + ی + لال

شەوچرا = شەوچراغ: گەوهەرێکە کە لە شەودا، لە ورشەداریدا وەکو چرا وایە و گەوهەر: هەر یەکێ لەبەردە بەنرخەکان گەوهەری پێ دەڵێن و لە عەرەبیدا بووە بە (جوهر). پیرەمێرد لێرەدا (شەوچرا) ی بەکارهێناوە، بەلام نالی (شەوچراغ) ی بەکارهێناوە، وەکو لێرەدا دەڵێ:

سم وەکو یەشم و لە یەشم و تووکی پێدا سەرنگوون

چاو وەکو بیجادە یا دوو (شەوچراغ) ی شوعلە ڕێژ

دیوانی نالی (مەلا عبد الکریمی مدرس، ل ٢٣٦)

هەروەها لە فارسیشدا (شب چراغ) بەکاردێت:

قطره ای بودی و دلها همه جویای تو بود

(شب چراغ) ی شده ای باش به گنجینه ء ما

فرهنگنامەی شعری دکتر عفیفی - بابا فغانی - دیوان ٩٣

واتە: دڵۆپێ بوویت و دڵەکان هەموو گەڕۆدەی تۆ بوون. (شەوچرایێ = گەوهەرێ) کی و لە گەنجینە و خەزنەکەی ئێمەدا بە. ی: یای خستنە سەرە.

لال: لە عەرەبیدا (لعل = لەعل) ە، کە یەکێکە لە بەردە بەنرخەکان و ڕەنگی سوورە.

دڵێ بێ غەمی خاڵت مەلال بێ ئەو دڵە دانەی (شەو چرای لال) بێ

دیوان ها، ل١٧١

* شەودێزی طالع: لێرەدا واتە خۆش بەختی و کامەرانی.

دێرە شیعری یەکەم واتای دێرە شیعری دووەم تەواو دەکات و بەستراون بە یەکەوە، هوما یان هومای: باڵندەیەکی شکاریی گەورەیە و بەهێزە و پێشینیان باوەڕیان وابووە ئەگەر (هوما) بفڕێ بە سەر کەسێکدا و سێبەرەکەی بکەوێتە سەری، ئەوە دەبێتە مایەی بەختیاری و خۆش بەختی. بەلام وشەی (شەودێز) کە لە فارسیدا (شبدیز = شەبدیز) ە ناوی ئەسپێکی ڕەنگ ڕەش بووە کە

شیرین بەخشیوێتی بە (خوسرەو پەروێز)، نەقشی شەبدیز، ئێستا لە بێستوونی کرماشانە، و هەندێ جار (شب رنگ = شەب ڕەنگ) یشی پێ دەڵێن.

ئێستا ئەمانە باویان نەماوە        هومای مەبعوثی وا بە حەواوە

بزانین سێبەر ئەخاتە سەرکێ        (شەو دێزی طالع) بۆکێ دێتە ڕێ

پ، ل ٢٣٧

* شەوق ئەنداز: ڕووناکی و تیشك بڵاو کەرەوە.

بەشی دووەمی وشەکە (ئەنداز) ە، کە ڕەگی چاوگی (انداختن = ئەنداختەن) ە واتە فڕێدان و هاوێژتن.

پەنهانە لە ژێر کراسی کەتان

لە درزی بەرۆك وەك مانگ (شەوق ئەندان)

دیوان ها، ل ١٥٧

* شەوگەرد، شەبگەرد: ئەو کەسەی کە بەشەودا بگەڕێ یان پاسەوانی شەو.

بەشی دووەمی ئەم ووشەیە کە (گەردە) ە، ڕەگی چاوگی (گشتن = گردیدن)، فارسییە، واتە گەڕان و سووڕانەوە. بەرامبەر بەوشەی (شەوگەرد) لە فارسیدا (شبگرد = شەبگەرد) ە، بە هەمان واتا کە باسمان کرد، بەڵام ئەمڕۆ لە کوردیدا (شەوگەرد) ئەو گیان لەبەرەیە کە وەکو مارمێلکە وایە بە زۆری بەشەودا دێتە دەرەوە لەبن دیوار و لە ژێر گڵۆپدا خۆی مت دەکات بۆ ئەوەی مێشوولە و جڕ و جانەوەر بگرێ و بیخوات.

بەرگی (شەوگەرد) ی نیلیم کردەبەر        پەڕە بەلۆکەم لێ بەستە کەمەر

دیوان ها، ل ١٩١

خەرقەی (شەوگەرد) یم کێشا بە سەردا        چاکی دوائێنم کرد بە کەمەردا

دیوان ها، ل ١٦٨

گورگ و کەروێشك و شەمشەمە کوێرە

(شەوگەرد) ن سیانی وایش هەیە لێرە

پ، ل ٢٨٦

لە شوێنێکی تردا پیرەمێرد لـە جیاتی (شـەوگەرد) وشـەی (شـەبگەرد) ی بەکارهێناوە.

دەست گیریم بکە ئەی یاری (شەبگەرد)

بە پەیامی یار لە دڵ دەرکە دەرد

دیوان ها، ل ٣٠٨

* شەوگیر: کەسێ کـە لە کۆتـاییی شەودا هەڵبستێ بۆ خـوا پەرستی، کـاتی مەلا بانگدان. بەشی دووەمی وشەکە (گیر) ە کە ڕەگی چاوگی (گرفتن) ە واتە گرتن. لە فارسیدا دەڵێن (شبگیر = شەبگیر). هەروەها بە واتای کاتی شەویش دێت.

قامیشەڵانی وشکە دڵی پیر زوو ئاگر ئەگرێ بەناڵەی (شەوگیر)

پ، ل ٦٧٣

* شێف: هێڵە بڕکێ، شیار، زەوییەکە بەیەك گاسن کێڵرابێ. (گیو)

گەورە بە باران ئاشی ئەگەڕێ بە وشکیش جووتیار (شێف) ی ئەبڕێ

پ، ل، ٢٧٢

* صافیلکە: ساویلکە.

هیچ ئەملاو ئەولای خۆیان ناڕوانن (صافیلکە) ن خەڵکی بە دۆست ئەزانن

پ، ل ٢١٠

*عیراق: عیراق لێرەدا واتە جێگای زۆر دوور.

مەبەست لەم دێڕە شیعرەی پیرەمێرد ئەمەیە: دەروێشی بـەنگکێش خـۆی دەزانێ بەنگ و تلیاکەکەی لە کوێدا دانـاوە، هـەرکاتێ ویسـتی بـەنگ بکێشـێ

* فریاڕەس: ئەو کەسەی بە هاواری کەسێکەوە بگات و فریای بکەوێ.

ئەو کەسەی کەسە و بە (فریاڕەس) ە    کەسیش نەزانێ زەوقێکی بەسە

پ ۱، ل ۱٦۱

* فەقیر نەواز: ئەو کەسەی بۆ فەقیر و هەژار باش بێت و دڵیان ڕا بگرێ و یارمەتییان بدات.

ئەو کەسەی کەوا (فەقیر نەواز) ە    لەگەڵ فریشتەی عەرشا هامڕازە

دیوان فا، ل ۲۵۱

* فەندەڵ فێل: فەنوفێڵ، فڕوفێڵ، تەڵەکەبازی.

ئەم (فەندەڵ فێل)ە کەڵکی ناگرێ    بەشەر بە فەنی بۆمباتان ئەمرێ

پ، ل ۵۷۳

* قرپ و چرپ: تاڵان و دزین. (خاڵ)

ئێستا کە کوشتن باوی نەماوە    تاڵان و بڕۆ و (قرپ و چرپ) باوە

پ، ل٦٧٤

* قوڵتوغ: تەخت، شوێنی ڕازاوە بۆشایی و زەماوەن و پێشوازی کردنی میوانەکان.

بڕوانە: المعجم الترکي - العربي، تالیف بندر اوغلو و الدکتور الداقوقي.

ئێستا گەورەکان (قوڵتوغ) نشینن    ئەملا و ئەولای دوای خۆیان نابینن

پ، ل٧٦

* قونار: لقی وردی مێو کەبەری نەبێ، لقە بەردارەکان بێ هێز دەکات (گیو) و (خاڵ)

بژار و (قونار) کە ساڵە ساڵە    (قونار) ی باخی میر بۆ پێنج ساڵە

پ: ل ٢٤٤

باخی میر: باخێکی خۆش و سەیرانگایەکی بە ناوبانگ بوو لە هەڵەبجە لە پێش تێکدان و کاول کردنی. (کەمالی) شاعیر لە بارەی باخی میرەوە دەڵێ:

گەر لە باخی ئەستەموول و پاریسم پەشمە لە لام

دڵ هەمیشە هەر هەوای گوڵگەشتی (باخی میر) ئەکا

بڕوانە: دیوانی کەمالی (عەلی باپیر ئاغا) ساغکردنەوە کەمال عەلی باپیر ١٩٨٦ـ ل ٢٨.

* قەڵبیر: شتێکی کون کونە، لە بێژنگ شاشترە، دانەوێڵەی پێ ئەبێژرێتەوە.

(خاڵ) و (گیو)

دەست لە هەویر و دەم لە تەدبیرا      ئاو لە (قەڵبیر) ا خۆژیلك لە شیرا

پ، ل٥٩٨

* قەڵەمچی: کەسێکە هەر خرید و فرۆختی تووتن بکا. (خاڵ)

کەسێکە هەر کڕ و فرۆشیاری تووتن بێ (گیو)

کردمان (قەڵەمچی) بە تووتن دەم تاڵ

وەی من وەی منی چیەتی بە قاڵ

پ، ل ٩٥

* قەڵەم زەن: نووسەر، نەققاش، بەشی دووەمی کە (زەن) ە، ڕەگی چاوگی (زدن) ە.

بڵێن (قەڵەم زەن) کەوتۆتە بەر زەیل

قەڵەمچی بۆ چی کەوتوونە واوەیل

پ، ل ٩٥

* کوڵك و کەمێل: لێرەدا واتە، پیس و پۆخڵ، چڵکن و پڵکن.

کوڵك: مووی کورت کە نەشێ بۆ ڕستن: (خاڵ)

لە کوردەواریدا هەرکەسێ کە لەشی زۆر تووکن و مووداوی بێت پێی دەڵێن کوڵکن.

کەمێل: تیسکە خوریە کە لە ژێر دووگی ئاژەڵەوە ڕیخی پێوە وشك بووبێتەوە. (خاڵ) و (گیو)

بۆیە سەرچاوەی تانجەرۆ لێڵە      هەرچی خۆی تیاششت (کوڵك و کەمێل) ە

پ، ل ٦٣٦

* کەرسمە: ڕەگێگی ئەستوورە لەنــاو لووتی هێندێ گوێـدرێژدا، بە ڕەنگێکی وا کە نەیەڵێ هەناسەی بە ڕەوانی دەرچێ ئینجا دێن ئەو ڕەگەی ئـەسمن و دەری ئەهێنن، و بەو جۆرە چاك ئەبێ. (خاڵ)

هەرچی بە لەقە لە خەڵکی بەربێ بۆ ئەوە دەشێ (کەرسمە) ی دەربێ

پ، ل٨٠٩

* کەسیرە: خراپکردن، سڕ، سەرمابردوو، گیاندارێکە لەسەرمان کورژووم هەڵاتبێ، کرژ هەڵاتن لەسەرمان . (گیو)، لێرەدا مەبەست سڕبوونە.

خوا چزوو نەدا بەزەردەزیرە هەتاو نەبینێ ماری (کەسیرە)

پ، ل٥٩٢

* کەلوو: بورجی فەلەك . (گیو)، هەریەك لە دوانزە بورجەکە.

خوا دوازدە (کەلوو) ی خستە ئاسمان کە ڕۆژ بەوێدا بڕوا بەئاسان

ئەم دوازدە (کەلوو) ەی حیسابی ساڵە بەو حیسابەیە وا ڕۆژ عەوداڵە

سەری ساڵ جێگەی ڕۆژ (کەلوو) ی بەرخە ئەگەر ئەتوانی ڕۆژێکی بەرخە

پ، ل٦٤٥

* کەڵەشێری عەرش: لێرەدا مەبەست خۆرە لەهەردوو دێڕە شیعرەکەدا.

تیپی زیندەوەر یەکسەر کش ومات

(کەڵەشێری عەرش) قوقوی نەدەهات

دیوان ها، ل١٩١

(کەڵەشێرەکەی عەرش) هەڵ نیشتبوو دیار بوو مانوێتی ڕۆژی چێشتبوو

دیوان ها، ل١٦٧

* کەوتمە پەرواز: فڕیم، باڵم گرتەوە.

بەباڵی شیعر و خەیاڵ کەوتمە پەلە و تەك وتاز

لە ئاسمانی سەرفرازی بە جارێك (کەوتمە پەروان)

دیوان ها، ل٨٧

تـەك و تـاز: هـێرش و پـەلامار بـە هـەموو لایـەكدا. بـەڵام لـێرەدا واتـە هەوڵ وتێكۆشان.

* كەوتۆتە پەرواز: لێرەدا واتە: هۆگر بووە، گیرۆدە و عاشق بووە. بەڵام وشەكە خۆی بە واتای: فڕیوە، باڵیگرتۆتەوە هاتووە.

لامل و گوارە هەردوو تەلای تاو هەردوو ژێر ماڵەی فەرقی زەڕكلاو

گیان و دڵ بۆیان (كەوتۆتە پەرواز)

دیوان ها، ل١٥٦

تەلای تاو: ←

* گازركەر: جل شۆر، ئەو كەسەی كە جل و بەرگ و ڕایەخ دەشوات.

ئەو كەسەی كە دارێكی ئەستووری تایبەتی كە نزیكەی مەترێ یان زیاتر درێژە و پێـی دەوتـرێ گـەلاكوتك، دەكێشـی بـەجل و بـەرگ و ڕەخـتی پیسـدا، دوای ئەوەی كە تەڕ دەكرێ و سابوونی لێ دەدرێ، بۆ ئەوەی پیسییەكەی دەربچێ و پاك ببێتەوە.

(خاڵ) دەڵێ: گازركەر = كەسێ كەشت گازر بكات.

(گیـو) دەڵـێ: گـازر: پارچـەی بـەنی و لۆكـەی بـە شوشـتن بـەو جـۆرە سـپی كردنەوەیە: جاوی خۆكردی چەند كاتژمێرێك لە نێو پەینی دەگرن، دوایە هێندەی دەشۆن و بە كوتك دەیكوتن هەتا ڕەنگی زەردی شیباكەی بـەردەدا و زۆر سپی دەبێ.

بەڵام (گازر) لە فارسیدا واتە جل شـۆر، پـیرەمێرد لەسـەر دەسـتووری كـوردی وشەی (كەر) ی خستۆتە سەر، وەكو: نان كەر، چێشت كـەر، ڕاوكـەر .. هتـد، لێرەدا بۆ وشەی (گازر) لە فارسیدا نموونەیەك دەهێنینەوە:

تو پاك باش و مدار أی برادر ازكس باك

زنند جامەء ناپاك (گازر) ان برسنگ

گلستان سعدی ـ تصحیح غلا محسین یوسفی چـاپ پنجم ـ ص ٧٠ واتـه: ئـەی برا تۆ پاك بەو لەكەس مەترسە، جل شۆرەكان جل و بەرگی پیس لەسەر بـەرد دەكوتنەوە (ناپیسیی دەربچێ).

خۆزگە وەك جاران (گازرکەر) ئەبوو

به شیاکه و به لیس پیسی دەمردەچوو

پ، ل ٦٣٦

گازرگەر = گازرکەر ←

لە كا و ئالیكی (گازرگەر) تۆراین    بە فێڵی رێوی بۆ .. ئەبراین

پ، ل ٦٨٠

گەر: بەشی دووەمی وشەكەیە و پاشگرە و مەبەستی كار و پیشە دەگەیەنێ، وەك: ئاسنگەر، مسگەر، مزگەر .. هتد.

بەلام لای کاکەی فەللاح: پ٤، ل ٤١ لە جیاتی (گازرگەر) وشەی (گازرکەر) هاتووە.

* گاڵت وەگوێزە: واتە كارێ بكە، كە لە توانایی و دەسەلاتدا نەبێ.

پەندی پیشینیان خاڵ، چاپی سێ یەم، ل ٦٣٦ لەم بارەیەوە دەڵێ:

گاڵت وەگوێزە: واتە گاڵەكەت بگوێزەرەوە، ئەمە بە یەكێك ئەوترێ بۆ لابردنـی شتێك كە لە تواناییدا نەبێت، بۆ ئەم مەبەستە دەگێرنەوە: كە جارێكیان جـاف لە كاتی چوونیـان بـۆ كوێستان ڕان ئەكەونـە نـاو پەڵـە گـاڵێك لـە شـارەزوور، خاوەن گاڵ هاوار ئەكاتـە خـاوەن ڕان كـە ئاژەڵەكـە دەركـات لـەناو گاڵەكـەدا، ئەویش ئەڵێ: من ئاژەڵی خۆم دەرناكەم تۆ ئەگەر رازی نیت پەڵە گاڵەكـەت بـە سەوزی لێرە هەڵگرە بۆ شوێنێكی تر، ئینجا ئێستا بەیەكێك ئەوترێ بۆ لابردنی شتێك كە لە كردنا نەبێ،

ئۆخەیچ كە ئێستا زۆردار بێ هێزە    لەبیرتە ئەیگوت (گاڵت وەگوێزە)

پ، ل ٧٠

* گرۆ: کۆمەڵ، دەستە.

زمانیان برن (گرۆ) ی بەدگۆیان — شوێنێکی تریان بۆ دێتە زمان

پ، ل ٤٦٦

* گزرە: گیایەکی وشکی گێرەکراوە، کۆمەڵە دار و گێشە دارە، داری براوی بەهارییە بۆ زستان وشك بێتەوە، لکــە داری چکۆلەیــە. (گیـو) گیـای درواوەی وشـك بـۆ خواردنی ئاژەڵ، داری سووتەنی وشك. (خاڵ) لەوە دەچـێ وشـەی (گـزرە) و (کزر) لەیەك بنچ بن، چونکە ئەو گیایە، یان ئەو دارە لەبەر هــەتاودا دادەنرێـت تا کزر و شك ببێتەوە.

جاران منالّمان ئەناردە حوجرە — فەلاقە ئەکرا بە داری (گزرە)

پ، ل٧٩٦

* گزیر: کەسێ کاروباری دێیەك ببینێ. (خاڵ)

شاگرد، کوێخای گچکە، پۆلیس، دارۆغە. (گیو)

لە فارسیدا (گزیر) = گەزیر، پاسەوان، پێشکار.

جاران موختاران (گزیر) یان هەبوو

بە (گزیر) ناوی چاکان دەردەچوو

یاخوا (گزیر) مان خوالێی نەستێنێ

ئەگەر ئەو نەبێ پیاو چاك نانوێنێ

چەند خۆش بوو جاران بە میرو (گزیر)

کە ئەموستیلە ئەی کردی بە میر

پ، ل ٤١٣

* گورد: بەش. وشەی (گورد) لـە ئـەدەبـی کۆنـمانـدا بـەرچـاو دەکـەوێ بـە واتـای پاڵەوان. بەلاَم (خاڵ) دەڵێ: بەش بردن لە شت بە ئازایی.

بێستان پن (گورد) ی خۆی لێ گرتووە — لە پێشدا بەشی خۆی لێ بردووە

پ، ل ٧٨٤

گوردی لێ ئەگرێ: واتە بەشی خۆی دەبات.

ئەڵێ نامێنم ئەو بێ بە ترێ    دوای من ئەوی دێت (گورد) ی لێ ئەگرێ

پ، ل ٦٤٩

* گـورز: ئـەو دەزوو، یـان داوانـەیە کـە مرواری یـان مووروو یـان ڕەنگیانـەیان تێ هەڵ دەکێشرێ و دەخرێنە سەریەك و دەبن بە باقەیەك و پێیـان دەوترێ (گورز) یان (گورزە).

لەگەڵ سەد (گورز)ی دانەی مرواری    هەر دانەیەکی بەهای خەرواری

دیوان ها، ل ٤١٦

* گۆڵە بارگیر: یابووی نارەسەن و ناقۆڵا (گۆڵە بارگین). (هەژار)

بەڵێ بۆ ولاخ ڕەسەن زۆرباشە    وا (گۆڵە بارگیر) دیارە لە پاشە

پ، ل ٦٨٤

* گۆ و گۆچان: جۆرە یارییەکە. لـــە فارسیدا پێی دەڵێن (چوگان بازی) واتە: ( یاری چەوگان)، وشەی (چەوگان) واتە (گۆچان)، (گو) یان (گوی) واتە تۆپ، پیرەمێرد لە وشەی (گو و چوگان) لـە سـەر دەستووری زمـانی کـوردی (گۆ و گۆچـان) ی دروســت کــردووە. گـۆ: واتــە تـۆپ. گۆچـان: ئـەو داردەسـتە سەرچەماوەیە کە لە کوردیدا ناسراوە. یاری گۆ و گۆچان: یەکێکـە لـەو یارییـە کۆنانەی کە بە سواری ئەسپەوە یان پیادە، بە تۆپ و گۆچان ئـەنجام دەدرێ، ئەم یارییە لە سەردەمی ساسانیەکانی پێش ئیسلامدا باو بووە، دوای ئەوەیش هەر هەبووە و لە شیعری کۆنی کوردیدا زۆر نـاوی هێنراوە، کـە لـە نێوان دوو تیپدا ئەم یارییــە دەکرێت و هـەر تیپـەی پێنك هـاتووە لـە چوار یاریکـەر، لـە مەیدانێکی بەرینی ٢٥٠ تا ٣٥٠ مەتر درێژیدا ئەنجام دەدرێت، بەڵام لە ئـەدەبی کۆنماندا (چەوگان بازی) بەکارهاتووە.

مەشهوورە کە کورد مەردی مەیدانە

ئەمجارە هونەر بە (گۆ و گۆچان) ە

پ، ل ٦٨٦

* گوێ لەبی دەریا: گوێی دەریا، قەراغی دەریا، کەناری دەریا.
وشەی (لەب) واتە لێو، لێرەدا بە واتای کەنار و لێوار بەکارهاتووە.
منیش لە خوارەوە چوو بوومە (گوێ لەبی دەریا)
بە دەردی خۆمەوە گیرۆدە، بێکەس و تەنیا
دیوان ها، ل ١٥٩
* گوێچنە: چەرمێکی خڕە، دووخی خەرەکی پیا ئەکرێ. (خاڵ)
ئینجا هێندێکیان چۆنی دەڕێسن لەگەڵ (گوێچنە) بەرزە بڵێسن
پ، ل ٦٣
* گەپڵە: گیایەکە گوڵی ئاڵ و خڕە و دەخورێت، شەقشەقۆک، گوڵۆکە.
ترشۆکە.(گیو).
گیایەکە ئەخورێ، زوو پیر ئەبێ. (خاڵ)
بێ منەت بژی بە گیا و بە (گەپڵە) نان بدە بەسەگ مەیدە بە سپڵە
پ، ل ٧٣٧
* گەل: ئامرازی کۆیە، (گەل)کە نیشانەی کۆیە ئەمڕۆ لە کوردستانی عیراقدا، بە زۆری بۆ ئاژەڵ بەکار دێت، وەکو: گاگەل، مێ گەل، کەرگەل.. هتد
کوڕ (گەل) گەورەتان ئەگەر خۆش بوێ
زۆر گەورەی ترتان تیا هەڵدەکەوێ
دیوان ها، ل ٣٠٩
یاخوا بە خێر بێن چاو (گەل) مان ڕۆشن
هەردووکیان بۆمان زۆر تێ دەکۆشن
دیوان ها، ل٣٠٥
* گەنجی باد ئاوەر: لە فارسیدا (گنج باد آورد) یان (گنج باد آورده) یە، لای پیرەمێرد (د) و (دە) ی کۆتاییەکەی نییە. کە ئەمە دووەمین (گەنج = خەزنە) یە لە خەزنەکانی خوسرە و پەروێز، بۆ ئەو مەبەستەیش بەکاردێت کە

خەزنەیەك بە خۆڕایی و بە ئاسانی دەست بكەوێ. (طالب آملی ـ کلیات، ٢٨٩) دەڵێ:

مشت خاکی کاورد گاهی صبا از کوی دوست

خسرو دل راکم از صد (گنج باد آورد) نیست

واتە: هەندێ جار کە شنەی بای شەماڵ لە گەڕەکی یارەوە مشتێ خاك بهێنێت بۆ خوسرەوی دڵ، واتە: (ئەودڵە عاشقەی کە وەکو دڵی خوسرەو وایە لە توانایی و دەسەڵاتدا) کەمتر نییە لە سەد گەنجی باد ئاوەر.

هەروەها (گەنجی بادئاوەرد) واتایەکی تری هەیە، ئەویش ناوی ئاوازێکی موسیقایە و دانەرەکەی (باربەد) بووە، ئەم (باربەد) ە لە شیعری کۆنماندا زۆر هاتووە، بەڵام مەلای جەباری (بارەبود) ی بەکارهێناوە، وەکو لێرەدا دەڵێ:

چریکەی چەکاوس چون حەنجەرەی عود

مەر نەنگ چل چەنگ پەنجەی (بارەبود)

بڕوانە مێژووی ئەدەبی کوردی علاء الدین سجادی ـ چاپی دووەم، ل٣١١ ؛ دکتر عفیفی فرهنگنامەء شعری ـ دکتر عفیفی.

(گەنجی بادئاوەر) تەلای دەستەوشار

بۆ خوسرەو بوونە تێلای گۆڕەوشار

پ، ل ٥٧١

تەلای دەستەو شار: ⟵

* لاف و گەزاف ژەنی: خۆ هەڵکێشان، فرۆفیشاڵ کردن.

ڕۆستەم پێی گوت کوا ڕوییں تەنیەکەت

ئاوازە و (لاف و گەزاف ژەنی) یەکەت

پ، ل ٢٠٠

ڕوییں تەن: ئەو کەسەی کە لەشێکی داڕێژراو و بە هێزی هەبێ، پێکهاتووە لە: ڕوی + ین + تەن     ڕوی: جۆرە فلزێکە، لەگەڵ مس تێکەڵ دەکرێ،

سامەوەر و شتی تری لێ دروست دەکرێ.

ین: پاشگرە بۆ لێکچوون . تەن: لەش.

(ڕووین تەن) ئەمڕۆ لە کوردیدا بووە بە (ڕۆبیتان) و بۆ ناوی کوڕ بەکاردێت .

ئاوازە: واتە ناوبانگ، لاف و گەزاف: زۆر جار ئەم دوو وشەیە بە یەکەوە دێن و واتایشیان وەکو یەکە.

* لچان: لکانی دوو شت بە یەکەوە، بەستنی ئاو (خاڵ)

نووسان بە یەکەوە، لکان بە یەکەوە (پور)

پاروویە بخەرە دەم کە بۆت قووت بچێ     نەك بە ژان لچت پێکا (بلچێ)

پ، ل ٦٠٥

* لووت و بزووت: وتـــەیەکە لە هێندێ شـوێنا بەکار دێنرێ لە جیاتی وتەی کوتوپڕ.(خاڵ)

پیاو کە لە جێگای نزم هەڵەنگووت     هەڵدەسێتەوە بە (لووت و بزووت)

پ، ل ٥٧٢

* لەخشین: لەخشان = لەخشین: ڕاکێشان، شتێ لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر بردن و دانانی، شتێ لە شوێنی خۆی جێگیر بوون. لەخشیان = خزان. (پور) لەخش: جووڵە. (گیو) لە خشان = لـە خشـین: تێکچوون و جووڵانـی شت لـە جێی خـۆی (خـاڵ) لـەخش = خشـکە، لەخشـان = لەخشـین: خشـکەکردن بـە زەویدا. (هەژار)

ئەگەر بێتو خوا ئەوەی پێ بەخشیت

مەترسە ئیتر بە هیچ (نالەخشیت)

پ، ل ٤٣٢

ئەوەیش کە لە ڕێی خوادا ئەیبەخشێ

بە هەموو هێزی دەوران (نالەخشێ)

پ، ل٧٢٧

ئەوەیش کە مەردە دەرم ئەبەخشێ          کەرەم کارێکە بە مەرگ (نالەخشێ)

پ، ل ٥٦٠

خوا فەرموویەتی تۆ هەر ببەخشە

سەد هێندەی ئەوت بۆ دێ (مەلەخشە)

پ، ل ٤٩٤

زۆرت چنگ کەوێ و کەمی ببەخشی          چاویان لە دوایە دوایی ( ئەلەخشی)

پ، ل ٨٤٣

لەسەر ماڵی خۆت حەزکەی ئەبەخشی

کەماڵی دیوان بەخشی (ئەلەخشی)

پ، ل ٢٥٠

بەڵێ حەققوڵڵا خوا خۆی ئەیبەخشێ

بەڵام حەققوتناس مووی لێ (نالەخشێ)

پ، ل ٢٠٨

* **لەقمە:** لێرەدا مەبەست گێچەڵ و تەنگ و چەڵەمەیە.

تیکە قووت ئەدەن ناپرسن چییە          ئەم لوقمە چەورە بێ (لەقمە) نییە

پ، ل ٢٦

* **لەنگەری ئەداشت:** ڕای دەگرت، جێگیری دەکرد، ڕای دەوەستان.

لەنگەر: ئامرازێکی لە ئاسن دروست کراوە، سەرەکەی چەند چنگێکی پێوەیە و بەستراوە بە گوریسێکەوە، بەکار دەهێنرێ بۆ بەستنەوە و ڕاگرتنی کەشتی لە کەناری ڕووبار و دەریا، وشەی (داشت) لە چاوگی (داشتن) ی فارسییەوە هاتووە، واتە هەبوون، (داشت) چاوگی گرتاوە و لێرەدا وەکو کارێکی یاریدەدەر بەکارهاتووە، وشەی داشت ئەمڕۆ لە کوردیدا بەکار دێت بۆ نموونە لە وشەی:

(یاداشت) کە لە فارسیدا (یاد داشت) ە هەروەها لە وشەی (نیوداشت) دا بەکاردێت.

پیرەمێرد لە جیاتی (لنگر می داشت) کارەکەی خستوتە قالێبکی کوردییەوە و دەڵێ: لەنگەری ئەداشت.

ڕۆژێ وەستاکەی داری دەقەڵاشت بەین بەین بە پواز (لەنگەری ئەداشت)

دیوان فا، ل ٤٠٥

* مادەی کەر و گا: ماکەر و مانگا.

وشەی (مادە) فارسییەو واتە: مێ، وشەی (ما) لە کوردیدا، واتە: مێ بەڵام لە پێشی وشەی لێکدراوەوە دێت وەکو: ماکەر، مانگا، مامر، ماکەو ... هتد

(مادەی کەر و گا) ی کفر ئەحمەد حەقە وەرە لە داخا مەمرە و مەتەقە

پ، ل ٣٣٨

کفر ئەحمەد: ئەم ناوە لە کوردەواریدا ناسراوە، بەڵام من لە بارەی ئەوەوە زانیارییەکی ئەوتۆم نییە، ماوەیەك لەمەوبەر کتێبێکم دەست کەوت لە ژێر ناونیشانی (شاعران کرد پارسی گوی) واتە ئەو شاعیرە کوردانەی کە بە فارسی شیعریان وتووە و ژمارەیان (١٢٥٠) هەزارو دووسەد و پەنجایە دانەرەکەی (سید عبد الحمید حەیرەت سجادی) یە، کە لە ساڵی ١٣٧٥ کۆچی هەتاوی لە ئێران ـ تاران چاپکراوە، لە لاپەرە ٦٦٩ دا دەڵێ: کفر ئەحمەد شاعیرێکی خەڵکی کوردستانە (مەبەست شاری سنەو دەوروبەرەریەتی)، لە سەدەی سیانزەهەمی کۆچیدا ژیاوە، بەشی زۆری تەمەنی بە هەژاری و دەست کورتی بردۆتە سەر، دوای ئەوە چوارینەیەکی کفر ئامێزی کفر ئەحمەدی بە فارسی خستۆتە ڕوو، کە باسی هەژاری و داماوی خۆی دەکات و دەڵێ: لەبەر ئەوەیە کە من نوێژ ناکەم. دیارە شیعرەکەی پیرەمێرد لە بارەی بەسەرهاتێکی کفر ئەحمەدەوەیە کە ڕوون نەکراوەتەوە.

* ملیچك = مەلیچك: چۆلەکە. لەوە دەچێ کە مەبەست ئەو کەسە بێت کە لە هەموو ئێراندا ناوبانگی دەرکرد، لە دواییدا باسی لێوە دەکەین.

لەناو سنەدا ئەم پەندە باوە بێژن (ملیچك) وا بە هەواوە

پ، ل ١٢١

واتە یەك لە ناو سنەدا باوە          وا (مەلیچك) ێك هاوە حەولوە

پ، ٥٠٠

وادەزانم ئەم پەندەی کە دەڵێ: (تیژن ملیچك وا بنە هەواوە) یان (وا مەلیچکێك هلوە حەواوە)،بە تایبەتیش کە لە ناو سنەدا باو بێت، لەوە دەچێ مەبەست ئەوکەسە ئەفسانەییە بێت کە هیچ بەهرە و سیفاتێکی ئەوتۆی تێدا نەبوو، بێجگە لەوە زۆر ناشرین و لەگەڵ سەرەوە لە ئادەمیزادی ئاسایی لە خوارتربوو، دەور و زەمانە و بەخت وای لێ کرد کە ناصرالدین شای قاجار (١٢٤٧ - ١٣١٣ کۆچی)، بە جۆرێ هۆگری بوو بوو، وبە ئەندازەیەك خۆشی دەویست، کە بەبێ ئەو نەیدەتوانی بژی و هەموو شتێکی بە گوێ دەکرد، هەر لە منداڵییەوە ناوی نا (ملیچك) بە کوردی سنە واتە چۆلەکە، وای لێهات دوای ناصرالدین شا بوو بەکەسی دووەم لە ئێراندا، وا لێرەدا بە کورتی چەند دێڕێك لە بارەیەوە دەخەمە ڕوو: ناوی ملیچك ئەمڕۆیش لە ئێراندا ناسراوە، بە تایبەتی لە سنەدا، چونکە لە بنەڕەتدا خەڵکی ئەوێ بووە، ناوی (غۆلام عەلی) بوو لە دواییدا ناسرا بە ملیچك و ناوبانگی گەیشتە ڕادەیەك وەکو کورد دەڵێ (فڕی).

ناصرالدین شای قاجار لە گەشتەکەیدا بۆ کوردستان، وا ڕێك دەکەوێ دڵی دەچێتە سەر کیژێکی جوان کە ناوی (زوبەیدە خانم) بووە، مارەی دەکات و لە پاشاندا دەناسرێت بە (ئەمینە ئەقدەس)، لەبەر زیرەکی و وریایی ڕۆژ بە ڕۆژ ناصرالدین شا زیاتر خۆشی دەوێ و سەرەنجام یەکەم کەس دەبێ کە کلیلی خەزێنەی شاهی دەداتێ و دەیکات بە یەکەمین لێپرسراوی ئەو کارە، لەبەر ئەوەی کە(ئەمینە ئەقدەس) منداڵی نابێ، کوڕی براکەی کە ناوی (غولام عەلی) دەبێ، دەهێنێتە لای خۆی، ناصرالدین شا ناوی دەنێت (ملیچك) و دوای ئەوە لەقەبی (عزیز السلطان) ی دەداتێ،کە منداڵێکی چاو کوت وکوێری سەوزە ڕەنگی زمان لاڵی زۆر کورتە باڵا بووە،جلوبەرگی بۆ دەدوورا لەسەر تەرزی

* مورغی عەرش: لێرەدا مەبەست خۆرە، لە کاتێکدا کە ئاوا بووە، بەڵام لە ئەدەبی فارسیدا (مرغ عرشی) واتە گیانی ئادەمیزاد یان فریشتە. بڕوانە: فرهنگنامەو شعری ـ دکتر عفیفی.

(مورغی عەرش) لە جێی خۆی هەڵ نیشتبوو

دیار بوو ماندوێتیی ڕۆژی چێشتبوو

دیوان فا، ل ٣٤٦

* مەڵۆ: باقە گیا و دەغڵە کە بە دەستەوە بێ بەڵاَن کە دانرا دەبێتە باقە، قولە دەخڵێکی درواوەیە کە سەپان پڕ بە قۆڵی دەیدووریتەوە، یەکە یەکە لە شوێنی خۆیان بە جێیان دێڵێ و زۆرترین ژنان هەڵیدەگرنەوە دەیکەنە گیشە (گیو)

هەندێ کە بەردیان نایە سەر (مەڵۆ) لە بێ باکەکان ئەبن بە هەڵۆ

پ، ل ٢٣٣

* مێمل: دڕ، ناحەز، نەیار، بوونەوەرێکی خەرافییە لە جنۆکە، ئەشقی ئافرەت دەبێ و خۆی دێنێتە سەر شکڵی ئاژاڵ یان چتی تر. (گیو) دوژمنی مەرگبڕی شت، پشیلە مێملی مشکە. (خاڵ)

کەس نازانێ خوا بۆچی خەڵق کردوون

بڵێین هێندێکیان (مێمل) ی مردوون

پ، ل٧٧٦

* ناسزا: نابەجێ. ناشایستە.

بەدی لەگەڵ چاک چەند (ناسزا) یە چاکەیش دەربارەی پیاو خراپ وایە

پ، ٧٣٧

ئەم دێڕە شیعرەی پیرەمێرد، وەکو ئەم دێڕە شیعرەی سەعدی شیرازییە:

نکویی با بدان کردن چنان است　　　　که بد کردن به جای نیکمردان

گلستان ـ دکتر خگیب رهبر ـ ص٦٥

واتە: چاکە کردن لەگەڵ پیاو خراپاندا، وەکـو ئـەوە وایـە کـە خراپـە بکـەی ب ەرامبەر بە پیاو چاکان.

هەروەها دەگونجێ لەگەڵ ئەم چەند وتەی سەعدیدا: [ رحم آوردن بـر بـدان ستم است برنیکان و عفو کردن از ظالمان جوراست بر درویشان. ]

گلستان ـ غلامحسین یوسفی، ص ١٧١

واتە: بەزەیی هاتنەوە بە بەدەکاندا دەست درێژی و ستەمە لە پیاو چاکان و ل ێبوردن لە جەفاکاران، زوڵمە لە هەژاران و دەروێشان.

* نالاًم: نالاًندم

بێ پەروا (نالاًم) بە لاوانەوە　　　　کەوتمە شیوەنی ناو لاوانەوە

دیوان ها،ل٣١٥

* نامەوەر: ناودار، بەناوبانگ .

ئێستاکە بۆ خەلاسی و ئازادی کوردەکان

کۆبوونەوە بەشەوقەوە مەردانی (نامەوەر)

دیوان فا، ل٣١٥

ئەم وشەیە لە بنەرەتدا (ناموەر)ە، کە دوو بەشە: نام + وەر.

نام: ناو. وەر: پاشگرە بۆ مەبەستی واتای خاوەن.

بەلاًم لای پیرەمێرد وەکو پێشان درا (نامەوەر)ە

* ناوەجاخ: هیچ و پووچ، ئەو کەسەی لە بنەماڵەیەکی پەروەردە نەکراو بێت.

بەلاًم بە پێچەوانەوە ئەگەر لـە بنەماڵەیـەکی بـەڕێزو پـەروەردە کراوبێـت پێـی دەڵێن (وەجاخ زادە). وشەی (وەجاخ) بەتەنها واتە ئاگردان.

پیاوی (ناوەجاخ) مەخەنە سەرکار　　　　هاوڕێکانیشی دەکا بە بێ عار

پ، ل ٨٠

* نوکتە بێژ: لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە کەسێ قسەکانی ورد و جوان و پڕواتاو دڵڕفێن بێت. نوکتە: مەسەلەی وردە و ناوەرۆکی جوانە. بەڵام ئەمڕۆ لە کوردیدا قسەی خۆشە بۆ مەبەستی پێکەنین.

لە ژینەوە ئەمڕۆ شاباشی ڕێی گەلاوێژە

لە پایەی ئەدەبا (نوکتە بێژ) و هەم گوڵڕێژە

دیوان ها، ل ١٦٠

* نەنگەویست: کەسێ کە کەس نەیەوێ، هەروەها (نەگەوییست و نەگەویس) یشی پێ دەڵێن. (خاڵ) یان دەتوانین بڵێین ئەو کەسەی هەر نەنگ و بەدی و خراپەی بوێت بۆ ئەم و ئەو، واتە بەدکار.

بۆ هەموو کارێك غایە پێویستە　　　پیاوی بێ مەسلەك هەر (نەنگەویست)ە

پ، ل ٨٣١

نەیسا: لەوە دەچێ ئەم وشەیە کورتکراوەی (نەیسان) بێت و نەیسانیش واتە (وەك قامیش )، مەبەست لێرەدا قامیشی وشك بێت. هەروەها وشەی (نەیسە) واتە: سا، ئیتر، هەرچۆنی بێت. (هەژار).

دووریش نییە کە بەم مەبەستە بەکارهاتبێ. بەڵام وشەی (نەیسا) م نەبینی لە فەرهەنگە کوردییەکانی بەردەستدا.

ئەمانە (نەیسا) بڵێین بێ گیانن　　　ماوەیەك ڕووی دا زۆرکەس ئەیزانن

دیوان ها، ل ٣٧١

* وانەبێ: نەکرێتەوە، بەڵام لێرەدا واتە پێ نەکەنێ.

پێکەنینی دولبەران میقداری عیسمەت کەم ئەکا

لێوی غونچە هەر ئەوەندە نازکە تا (وانەبێ)

دیوان ها، ل ٢٠١

* وەزەند: زیان. وەزەند: شین، زیان، وەزەندەگەیاندن واتە زیان گەیاندن (گیو)

هەندێ خوا بۆشەڕ هێناونیە دنیا (وەزەند) ی خەڵکیان ئەوێ بە تەنیا
مار تا لێی نەدەی (وەزەند) ی نییە شێر ئەمان ئەدا و پیشەی مەردییە
پ، ل ٥٥٩

لەم دوانە بەدتر بەنی ئادەمە (وەزەند) مان بۆیەك بە دەست و دەمە
پ، ل ٧٦٢

* وەیدۆزە: بیدۆزەوە، هەڵیبهێنە، حەلی بکە.
بە کوردی ئەولا ڕێژو و خەڵووزە موعەممایێکە ئازای (وەیدۆزە)
پ، ل ٦٣٦

* هۆرتە: فەرشی گەورە کە ژوورێکی ئاسایی پڕبکاتەوە، ئۆرتە.
بەهەموو بایەك ئەلەرێینەوە بە (هۆرتە) و بەڕە ئەگەڕێینەوە
پ، ل ٧٩٤

* هەردەگەرد: هەردەگەڕ، ئەو کەسەی بە دەشت و دەردا بگەڕێ و چۆڵەوانیی لاخۆشتر بێت لە ئاوەدانی. (گەرد) ڕەگی چاوگی (گشتن ، گریدن)ە واتە گەڕان.
تۆ وام تێ مەگە من (هەردەگەرد)م من خاوەن سوپای ئەندێشە و دەردم
دیوان ها، ل ٢٠٥

* هەرزە چەنە: چەنەباز، زۆربڵێ، ئەوەی کە قسەی بیهوودە و هیچ و پووچ دەکات.
زۆر (هەرزەچەنە) تووشی شەڕ ئەبن زۆر قین لە سکیش بە قین گەڕ ئەبن
پ، ل ٤٥٦

* هەرزە چەنەیی: چەنە بازی، زۆر بلێیی، قسەی پڕوپووچی بێ سەروبن.
(هەرزە چەنەیی) کار ناباتە سەر ئەبێ تەسلیم بین بە قەزا و قەدەر
پ، ل ٧٩٢

* هەرزەگەرد: ئەو کەسەی کە بە بیهوودە بگەڕێ و بسووڕێتەوە، بەرەڵلا و خوێڕی.
هەرزە: بێسوود، بێکەڵك.

(هەرزەگەرد) بە هیچ پێڵاو ئەدڕێ          هەندێ ڕۆژووەوان ناشتای پێ ئەبڕێ

پ، ل ٤٩٢

* هەساو: سایەقە. (خال، پور).   هەساو= ساو: عاسمانی بێ هەور. (هەژار)

کەچی لە پرێك ئەیکا بە (هەساو)          ئارام ناگری لە تینی هەتاو

پ، ل ٢٦٢

ئێستا ئەو هەورە نەما(هەساو) ە          لەعنەت لەو کەسەی لە خەڵکی داوە

پ، ل ٢٢٩

* هەلات: درۆی زل.(خال) هەلات: درۆ، درۆ لەخۆوە ڕێکخستن .     (گیو)

ئاسایش بۆ لات مەگەر لە گۆڕا          پیاوی بە (هەلات) هەروا لە گۆڕا

پ، ل ٦٧٨

* هەڵدا: هەڵڵا، هەراوهوریا، دەنگە دەنگ و قرەقڕ .

ئێستا ئەم نەسلەی کە لە ئەزەلدا          هاتوونە خوارێ بە شەڕ و(هەڵدا)

پ، ل ٨٤٣

کە وتیان بێستان وا بەرەڵدایە

خەڵك تێی ئەو رووژێ قرە و(هەڵدا) یە

پ، ل ٥٣١

بڵێم چی ئەوسا گاڵە و(هەڵدا) بوو          گاڵی کاڵ خۆر بوو گاڵ بەرەڵدا بوو

پ، ل ٦٠٣

سەعدی فەرموویە بۆ ئەم (هەڵدا) یە          بەرد بەستراوە، سەگ بەرەڵدایە

پ، ل ٤٦٩

ڕەحەیش لە دواوە تێیان هەڵ ئەدا

لەگەڵ پێش دەمیان ئەیکرد بە (هەڵدا)

پ، ل ٢٨٨

ئەم تێك هەڵچوونە و شەڕ و(هەڵدا) یە بۆ بێ عیلاقە وەك سینەمایە

پ، ل ٢٠٥

کاتێ کە وتیان بێستان بەرەڵدا کوڕوکاڵ تێکڕا ئەیکەن بە(هەڵدا)

پ، ل ٧٨٤

نوێژی لە پشتی عەلییەوە دەکرد کە بوو بە(هەڵدا) ڕای کردە سەرگرد

پ، ل ٥٧

پیرەمێرد بە دەگمەن وشەی (هەرا) ی لەجیاتی (هەڵدا) بەکارهێناوە، وەکو لێرەدا دەڵێ:

زۆرتر لە ڕۆژی موبارەکدایە ئەم پیاو کوشتنە و شەڕ و(هەرا) یە

پ، ل ٨٥٧

* **هەڵکرد:** ئەو کەسەی کەوا بەرگەی هەموو ناخۆشی و ستەختییەك بگرێ و بەژیانێکی سادە ڕازی بێت.

ئەوی (هەڵکرد) ی بە وشك و تەڕە لە ماڵی خۆیا شای بەحر و بەڕە

پ، ل ٢٠

* **هێلك:** جەرگ وناو، دڵ و جەرگ و گورچیلە. (هەژار) دڵ، هێلکت بڕن. (خاڵ)

بەم ڕەنگە ژیان تامی نەماوە ماسی ژێر دەریایش (هێلك) ی بڕاوە

پ، ل ٤٣٣

ئەو کەسەی کەوا زۆر بەرز ئەفڕێ کە کەوتە خوارێ (هێلك) ی ئەبڕێ

پ، ل ٣٣٠

* **بایەی گەورە:** وەکو پیرەمێرد خۆی دەڵێ: کە بایەی گەورە دنیایە .

بەلام (بایە) وەکو (خاڵ) دەڵێ: [ وتەیەکە بەژنی سەرە ئەوترێ بۆ گەورەیی] (گیو) دەڵێ: بایە واتە دایك، بەم جۆرە (بایەی گەورە) هەر دایە گەورە و نەنك و پیرەژن دەگرێتەوە، کە لە ئەدەبی کۆنماندا واتە جیهان.

دنیا کە ناوی (یایەی گەورە) یە سیاسەتەکەی هەموو تەفرەیە

پ، ل ٧٠٥

لە ئەدەبی فارسیشدا بەهەمان واتا و مەبەست بەکارهاتووە، بۆ نموونە:
وشەی (دایەی گوژپشت) واتە دایە گەورەی پشت کـۆم، پـیرەژنی پشـت کـۆم، کە مەبەست دنیا و زەمانە و ڕۆژگارە، و کردەوەیشی هەر بەدی و خراپەیە، بۆ نموونە:

بسی چون مرا زاد وهم زودکشت کە نفرین براین (دایەءگوژپشت)

اقبال نامە ـ حکیم نظامی گنجوی ـ باحواشی وتصحیح وحید دستگردی

چاپ دوم ١٣٦٣، ص ٢٤٧

واتە: ئەم جیهانە زۆری وەکو منی هێنایـە دنیـاوە و زوو کوشـتی، نـەفرین لـەم پیرەژنە پشتکۆمە.

* یەخەچاک: لێرەدا مەبەست گوڵی پشکوتووە، گوڵی گەش.

بـەڵام وشـەکە خـۆی بەتەنـها واتـە: یەخـەکراوە، دوگمـەی یەخـە کـراوە، یەخەترازاو.

یەکەم نەورۆزە دەرچووە لە خاك لە عەشقی یاران شێت و (یەخەچاك)

دیوان ها، ل ١٤٢

* یەکدگیر: کورت کراوەی (یەکدیگەرگیر) ە، واتە: یەکتری گر، دووشت کە بێنەوە یـەك و یـەکتری بگـرن، چـەند کەسـێ لـە شـوێنێکدا بەیـەکتری بگـەن، یـان لـە شوێنێکدا کۆببنەوە.

قڵیشی جێ پواز (یەکدگیر) بوو بوو

هێلکەی مەیموونی توند تێ چەسپی بوو

دیوان فا، ل ٤٠٦

(یەکدگیر) ئەبی لەگەڵ تانجەڕۆ بە عەشقی سیروان وێڵ و ڕەنجەڕۆ

دیوان ها، ل ١٣٤

خوا لێخۆش بوو مارف جیاوك كه ئەو سەردەمەی موتەسەریفی سلێمانی بووه له ساڵی ١٩٤٦دا له وتارەكەیدا كه پیرەمێردیش لەوێ بووه وتوویەتی: ئەم حاجی تۆفیقە كەوا بەرامبەرم وەستاوە، گوێی له دەنگمه له ساڵی ١٣١٨ی رۆمیدا له ئەستەمووڵ بە رێكەوت له ماڵی شەریف سەهل پاشادا (یەكدگیر) بووین.دیوان فا، ل ٢٠ـ ٢١

**سەرچاوەكان**


١ـ پەندەكانی پیرەمێرد ـ كۆكردنەوە و ساغكردنەوەی: فائق هوشیار، مصطفی صالح كریم، محمد نوری توفیق، محمود احمد محمد، احمد زرنگ ـ چاپی یەكەم بەغدا ١٩٩٥، بەرگی ١و٢و٣.

٢ـ پەندەكانی پیرەمێرد ـ كاكەی فەللاح. بەرگی: ١و٢و٣و٤.

٣ـ پەندی پێشینان ـ شێخ محەمەدی خاڵ، چاپی سێیەم، سلێمانی ـ ٢٠٠٠ .

٤ـ پیرەمێردی نەمر. محمد رسول (هاوار) بەغداد ـ ١٩٧٠.

٥ـ دیوانی پیرەمێرد ـ كۆكردنەوە و ساغكردنەوەی: فائق هوشیار، محمود احمد، مصطفی صالح كریم، محمد نوری توفیق، احمد زرنگ مصطفی ـ بەرگی یەكەم، بەغدا ، ١٩٩٠.

٦ـ دیوانی كەمالی (عەلی باپیر ئاغا) ئامادە كردن و ساغكردنەوەی ـ كەماڵ عەلی باپیر ١٩٨٦.

٧ـ دیوانی نالی ـ مەلا عبدالكریمی مدرس ـ بەغدا ١٩٧٦.

٨ـ دەستنووسی گەلاوێژی كوردستان ـ حاجی مەلا كریم زەنگەنە.

٩ـ فەرهەنگی خاڵ.

١٠ـ فەرهەنگی كوردستان ـ گیوی موكریانی.

١١ـ واژەنامەی كردی ـ فارسی ـ دكتر محمد تقی ابراهیم پور ـ تهران ١٣٧٣.

١٢ـ هەنبانە بۆرینە ـ هەژار.

١٣ـ مێژووی ئەدەبی كوردی ـ علاءالدین سجادی، چاپی دووەم.

١٤ـ اقبال نامه ـ حكیم نظامی گنجوی، با حواشی وتصحیح وحید دەستگردی، چاپی دوم ١٣٦٣.

١٥ـ امثال وحكم ـ علی اكبر دهخدا، چاپ سوم ١٣٥٢.

١٦ـ بوستان سعدی ـ بكوشش دكتر خلیل خطیب رهبر، چاپ چهارم ١٣٧٥.

١٧- تاريخ مردوخ - جلد دوم، تاليف آيت الله مردوخ كردستانى.

١٨- تحفهء ناصرى در تاريخ و جغرافيـاى كردسـتان - تـاليف مـيرزا شـكرالله سـنندجى (فخـر الكتـاب)، مقابله و تصحيح و حواشى: دكتر حشمت الله طبيبى - تهران ١٣٦٦.

١٩- شاعران كرد پارسى گوى - تاليف سيد عبدالحميد حيرت سجادى، تهران ، اول/٧٥.

٢٠- شاه ذو القرنين و خاطرات مليچك - بهرام افراسيابى، چاپ ششم ١٣٧٢.

٢١- فرهنگ عوام - گرد آورندهء، اميرقلى امينى.

٢٢- فرهنگ فارسى - دكتر محمد معين - چاپ نهم ١٣٧٥ تهران.

٢٣- فرهنگ فارسى عميد، دو جلدى، چاپ يازدهم ١٣٧٦.

٢٤- فرهنگنامهء شعرى - دكتر رحيم عفيفى، تهران ١٣٧٦.

٢٥- گلستان سعدى - بكوشش دكتر خليل خطيب رهبر، چاپ دهم ١٣٧٤.

٢٦- گلستان سعدى - تصحيح و توضيح دكتر غلامحسين يوسفى، چاپ پنجم ١٣٧٧.

٢٧- المعجم التركي - العربي - تاليف: بندر اوغلو و الدكتور الداقوقى.

٢٨- شێخ ڕەزای تاڵەبانی - د. مکرم تاڵەبانی، ئاراس، ٢٠٠١، ل ٢٥٣.

٢٩- نفحات الأنس - تأليف: عبد الرحمن جامى، انتشارات محمودى.

# موکریان لە خەریتەی کوردستاندا

**هێدی**

لە بەینی بستووی کێلەشین و ڕێگاکانی ئالاندا زنجیرە کێوی "زاگرۆس" هەلکەوتووە، کە کلکەیەکی ڕێکوپێکی چیای مەزن و بەرزی "ئارارات"ە و لە باکووری ڕۆژاواوە بۆ لای باشووری ڕۆژهەلات ڕادەکشێ و، لە باکوور سنووری کوردستانی سەریێ و خواریێ پێك دێنێ و، دەگاتەوە زنجیرە کێوی زەهاو و لوڕستان کە بە لای باشووردا بلاو بوونەوە.

لە ڕۆژهەلاتی ئەو زنجیرە کێوە "زاگرۆس" کوردستانی ژووروو هەلکەوتووە کە ناوچەی "موکریان" ئەو شوێنەی مەبەستی ئەوڕۆی ئێمەیە، بەشێکە لەوێ و لێرەدا چاوێکی خێرا بە لایەنەکانی جوگرافی و کۆمەلایەتی و، مێژوویی ئەو ناوچەدا دەخشێنین.

جارێ لە پێشدا سرنجێك دەدەینە چلۆنایەتیی هەلکەوتی چیاکانی ئەو ناوچە و سەرچاوەکانی ئاوی ئەو ناوچە کە لەمەڕ چیاکان لە بەینی شاری شنۆ و کێوەکانی ئالاندا دەبێ لە پێشدا ناوی چیاپەش بێنم و، دوایێ کێوەکانی تری: سپی کێو و، بەرزەن و، کانی خولای و، قەندیل و، حاجی برایم و، کەمێکی تر بە لای ڕۆژهەلاتدا شان بە شانی ئەو کێوانە باسکە کێوی بەردە سیر و موکری ڕاکشاون، کە بەستێنی چۆمی جەغەتوو لێکیان جودا دەکاتەوە.

ڕووباری تەتەهۆ لە باسکە کێوی بەردەسیر تێ دەپەڕێ و، بەشی دووهەمی ئەو ڕووبارە ناوی "کورتەك"ە، کە هەتا مەهاباد و باشووری گۆلاوی ورمێ دەچێتە پێش.

کێوی بەردەسیر لە باکووری ڕۆژئاواوە بۆ باشووری ڕۆژهەلات هاتووە و سنووری ڕۆژهەلاتی موکریان پێك دێنێ.

ئەو ڕووبارانەی کوردستان کە دەڕژێنەوە ناو گۆلاوی ورمێ هەموویان سەرچاوەیان لە کێوەکانی بەردەسیر و چل چەشمەوە دەست پێ دەکا و چونکە ئەو کێوانە سالێ

بەشی زۆرتری هەر بەفر دای پۆشیون، چۆمەکانیان ئاویان زۆرترە و، لە لایەکی تریش چونکە بەستێنەکانیان شۆرەکات نین ئاویان شیرن و بۆ خواردنەوە دەبن.

چۆمی جەغەتوو لە سەرچاوەکەی خۆیەوە، یانی لە چل چەشمەوە هەتا دەگاتە گۆلاوی ورمێ ڕێگەیەکی زۆر دوور لە باشوورەوە بۆ باکوور دەبڕێ، ئەو ڕووبارە لە لای سەرێ ئاوی خورخورەیە و، لە ناولکەکانی دەستەچەپی جەغەتوودا چۆمی سەقز لە هەموویان گرینگترە کە ئەویش سەرچاوەی هەر لە بەردەسیرەو، ناوچەیەکیش هەر بە ناوی سەقز ئاو دەدا و، دوایی بە بەریانێکی بەریندا دەڕژێتەوە ناو ڕووباری جەغەتوو. ڕووبارەکانی سەر بە ئاوی دیجلە لە بەشی کوردستانی موکریاندا یەکیان زێی گچکەیە، ئەو ڕووبارە کە سەرچاوەی لە سەری مەیدان لە پشت مەهابادە هەتا دەگاتە کێوی "لکبن" بە بەستێنێکی بەرزدا دەڕوا کە ڕووی لە لای ڕۆژئاوایە، لەو بەشەدا ڕووبارەکە ناوی کێوی لکبنی لێ دەندرێ و، دوای ئەوە کە دەورێکی کێوەکەی دا ناوی دەگۆڕێ و، دەبێتە ڕووباری "کەڵوێ" و بەرەو باشوور دەچێ هەتا دەگاتە سەردەشت و، لەوێ بە لێژییەکی لێژدا چاکتر وە خۆ دەکەوێ و، دوای ئەوە کە لە سەردەشت تێ پەڕێ دیسان ڕوو دەکاتەوە لای ڕۆژئاوا و بە ناو کێوەکانی ئالاندا دەچێتەوە خاکی عیراق و لە خوار شاری هەولێر دەگاتەوە ناو ئاوی دیجلە.

چۆمی "پەسوێ" هەردوك ڕووباری تری "لاوێن" و "مسین" لە لای دەستەڕاست و، چۆمی "بانە" ش لە لای دەستی چەپ هەرسێکیان دێنەوە ناو زێی بچووك کە ڕووباری بانە ناوچەی بانەش ئاو دەدا و لە نێزیك سەردەشت تێکەڵ یەك دەبنەوە. شەبەکە (ڕایەڵە) ی ئاوی ئەو هەرێمە لە خەریتەی کوردستاندا لەوەش بەربڵاوترە و زۆر ڕووباری گچکەی بێ ناوی تر هەن کە دەڕژێنەوە ناو ڕووبارە گەورەکان و لەگەڵ ئەوان چەند ڕووباری بێ ناو کە لە چیای زاگرۆس دێنە خوارێ.

ناوچەی "موکریان" کە لە خوار گۆلاوی ورمێوە دەست پێ دەکا و، لە لای هەرە خوارێ پاڵ وە ناوچەی "گەڕووس"، یان بە واتەیەکی تر "بیجاڕ" دەدا بە ئاووهەوای زستانێکی سارد و بەفرگر و هاوینێکی فێنك و خۆشەوە سەرەڕای شارەکانی: پیرانشار،

شنۆ، نەغەدە، مەهاباد، بۆکان، سەقز. زۆربەی عەشیرەتە گەورەکانی کوردیش وەك: زەرزا، پیران، مامەش، مەنگوڕ، گەوەرك، دێبوکری، بەگزادە و، لەگەڵ وانیش هەرسێك دەشتی بە داهات و ئاوەدانی: لاجان و، شارویران و، چۆمی مەجید خان، دەگرێتە بەرخۆ کە چ لە لانی ئاو و خاکی زۆر و، چ لە لانی داهات و بەرهەمی چاك دەتوانم بڵێم نموونەن.

شوێنی دانیشتنی زۆربەی ئەو عەشیرەتانە هێڵەکانی سەرسنوورە و بە تایبەتی عێلی مەنگوڕ کە لە هەردوك دیوی سنوورە و نیشتەجێن، ناوەندی ئەو هۆزانە بۆ هەموو ڕوسوومات و کاروباری حوکوومەتی شاری پیرۆزی مەهابادە کە گۆڕی پێشەوای نەمر قازی محەممەد و، هێمنی شاعیری گەورەی نەتەوایەتیی کورد هێندەی تریان پیرۆز کردووە و ئەو شارە دوای ئەوە کە دامەزراندنی کۆماری کوردستانی بە خۆیەوە دی، هێندەی تریش ناودار و خۆشەویست بوو، نەك هەر بۆ دانیشتووانی شارەکە بەڵکو بۆ هەموو کوردێك بوو بە جێی شانازی.

ئاگری ئەو هەستە نەتەوایەتییەی کە لە مەهاباد بوو بە هۆی دروست بوونی کۆمار بە تێ پەڕبوونی ساڵ و زەمان نەك هەر لە کزیی نەداوە، بەڵکو بە گڕ و بە تینتر بووە، ئەو هەستە بە ئاشکرا ئەوڕۆ لە دانیشتووانی سەرجەم خەڵکی ناوچەکەدا دەبیندرێ و، پێ بە پێی هەستی نەتەوایەتی باری ڕۆشنبیریشیان هەر لە ئاستێکی بەرزدا بووە و چ ئەوڕۆ و چ لە ڕابووردوودا سەرەڕای زەخت و فشاری حوکوومەت کە دەرفەت و مەجالی گەشەی فەرهەنگی لێ بڕیون و، نەیان توانیوە و نەیان وێراوە لێ هاتوویی شەخسی و، ئەرکی کۆمەڵایەتیی خۆیان بە تەواوی دەرخەن بەو حاڵەش ئەدیب و وێژەوانی گەورەیان هەر لێ هەڵکەوتووە و لەوەدا لە شوێنەکانی تری کوردستان نەماونەوە، کە لەو ئەدیب و شاعیرانە هەندێکیان لەبەر ئەوە کە شوێنەوارەکانیان چاپ نەکراون، هەرچەند کارە ئەدەبیەکانیان لە پلەی زۆر بەرزدایە، دیسان لەناو کۆمەڵ و چینی وێژەواندا وەکی پێویستە ناسراو نین، کە لەو شاعیرانە دەتوانم مامۆستا مەلا مارفی کۆکەیی و، مامۆستا خاڵەمینی بەرزنجی و، مامۆستا محەممەدی عەتری گلۆلانی لە بۆکان بە وێنە بێنم، بێجگە

لەوانە کە دوو ناوبراوی هەوەڵی - بە داخەوە ئەوڕۆ لە ناوماندا نەماون - لە مەهاباد شاعیری بەرز و بە توانای تری وەک: سەیید عەبدولقادری سیادەت و، مامۆستا قاسمی موئەییەد زادە و شەریف و شاعیر و نووسەری گەورەی تر دەژین کە بە هیچ جۆر ئیمکاناتی تەواویان بۆ بڵاوکردنەوەی شوێنەواری خۆیان نەبووە و نییە، بەڵام ئەوان بەڵێ هاتوویی خۆیان ئەرکی نەتەوەیی و، کۆمەڵایەتیی خۆیان هەربەجێ هێناوە و لێی ساردنەبوونەوە.

ئەگەر برێک بگەڕێینەوە بۆ دواتر و پێش ئەو شاعیرە بەرێزانەی باسیان کرا دیوانی شیعری تاریک و روون و چەند چاپکراوی تری شاعیری گەورەی کورد مامۆستا هێمن بە چاپ گەیشت کە بەرزیی کاکڵ و ناوەڕۆکیان بوو بە هۆی ئەوە زۆر زوو لە بازاڕدا نایاب بن و! دیوانەکەی بۆ جاری دووهەم لە چاپ درایەوە، دیوانی شیعری مامۆستا حەقیقیش ئەو دواییانە لەلایەن دەزگای کۆڤاری سەرەوە و لە ورمێ چاپکراو، کەوتە ناو گەنجینەی ئەدەبیاتی کوردەوە.

"وەفایی" شاعیری ناوداری مەهاباد و، مامۆستا "مصباح الدیوان" ئەدەب لەو شاعیرە پایە بەرزانەن کە ئەدەبیاتی کورد بەشوێنەواریان دەوڵەمەند بوو، ڕێچکەی وان لە کاری ئەدەبیدا ڕێبازی زۆر کەسەو سەری ڕێزیان بۆ دادەنوێنن.

هەست وسۆزی ئەڤیندارانە و ئەدیبانەی ئەو دوو شاعیرە گەورە جێگەیەکی تایبەتی لە هونەر و ئەدەبیات و وێژەوانیدا هەیە و، ڕەنگە ساڵ و زەمانی زۆر پێ بوێ هەتا بلیمەتێکی دڵسووتاوی تری کورد پەیدا دەبێ و پارچە هەڵبەستێکی بەرزی تری وەک "شیرین تەشی دەڕیسی" ی وەفایی دەکاتە نەخشی سەربەرد، یان شوێنەوارێکی پوختە و پاراوی وەک ئەو قەسیدەی مامۆستا ئەدەبی ئەڤیندار دەخولقێنێ کە بەو شیعرە دەست پێ دەکا:

"دوێ شەو شەوی شەممە کە لە بورج و مەه و ئەختەر

ئاراستە بوو سەتحی سەراپەردەیی ئەخزەر"

دیارە هونەر و هونەرمەندی، هەر تایبەتی شیعر و شاعیری نییە و هونەر لە زۆر

